زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی 48

# ئافرەتانێکی چاکەکار لە مێژووی ئیسلامیدا

محي الدين عبد الحميد

وەرگێڕانی
سوهام بەهادر زنجی






التفسير

# ئافرەتانێکی چاکەکار
# لە مێژووی ئیسلامیدا


ئامادەکردنی

محی الدین عبدالحمید

وەرگێڕانی

سهام بەرزنجی




ناوی کتێب بەکوردی: ئافرەتانێکی چاکەکار لە مێژووی ئیسلامیدا
ئامادەکردنی: محی الدین عبدالحمید
وەرگێرانی: سهام بەرزنجی
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
نەخشەسازی ناوەوە: جمعه صدیق کاکه
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٢ك — ٢٠١١ز
تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپیاردنی ( ٩٢٠ ) ساڵی ٢٠١٠ پێدراوە

تفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ – ٠٧٧٠١٣٨٧٢٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

بۆ...

ئـــەو خوشـــکە موســـڵمانانەم.. کـــە خـــوا و پێغەمبەر و ژیانی دوارۆژیان مەبەستە..

ئەم پەرتووکە پێشکەش بێت.

**أعوذ بالله من الشيطان الرجيم**

﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ
وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ
وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ
وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ
وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ
ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا
عَظِيمًا ﴾

**الأحزاب/٣٥**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# دەستپێک

سوپاس و ستایش بۆ خودا و، درود و سڵاو لە پێغەمبەری خودا و، خانەوادە و یار و یاوەران و، هەموو ئەوانەی کە شوێن ڕێنماییەکانی دەکەون تا ڕۆژی دوایی...

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا﴾النساء/١.

پاشان..

ئەو زوڕنای بانگەشەیەی دوژمنانی ئیسلام ڕەواجی پێدەدەن، بە شەو و ڕۆژ دەنگی دێت، هەتا وێنەیەکی ساختە دەربارەی ئافرەتانی موسڵمان و ڕاستیەکەی بخەنە ڕوو، ئەو کەلتوور و مێژووە بشێوێنن، کە ئافرەتان سەربەرزی و کەرامەتی خۆیان لێ وەردەگرن، ئەمە پاش ئەوەی بۆیان ڕوون بوەوە، ئافرەتان چ ڕۆڵێکیان هەیە لە بونیاتنانی نەوەکان و ئامادەسازی ئەو پیاوانەی مەشخەڵی ڕێنموونییان هەڵگرتوە و، دەستیان داوەتە پەخشکردنی ڕووناکی لەپاش تاریکی و، ڕێنمونی لەدوای گومڕایی.

هەر بۆیە لەسەر ئێمەی موسڵمان پێویست بووە، بە هەموو شێوەیەك بەرەنگاری ئەو جۆرە پڕوپاگەندە مەبەستدارانە ببینەوە، بە تایبەت دوای

ئەوەی کە توانی لەلای دەروون نزم و دڵە بێئاگاکان هەندێ بەرهەمی هەبێت، هەموو خراپەیەکیان بۆ رازاندنەوە و، گشت پیسیەکیان بۆ جوانکردن، بە بیانووی دەربازبوون لە کۆنەپەرستی و، هەنگاونان بەرەو کاروانی شارستانیەت و پێشکەوتن.

چاك وایە بۆ هەموو ئافرەتێکی مسوڵمان، کە بڕوای هێناوە بە پەروەردگاری، ئاشنای راستی مێژوو و کەلەپووری خۆی ببێت و، لە چاوگەکەیدا تینویەتی خۆی بشکێنێت و، لەنێو شنەکانیدا بژی و، پێشەنگ و سەرمەشقی لێ وەربگرێت و، خۆی بپارێزێت لەو داوانەی بۆی دەنرێتەوە تا لێی پارێزراوبێت، ئەمەش – سوێند بەخوا- کارێکە دوژمنانی ئیسلام بێزار دەکات و دڵیان پڕ دەکات لە ترس و تۆقین، لەبیریان چوەتەوە یان لەبیر خۆیانی دەبەنەوە، کە ئیسلامە مێژووی ئێمەی دروست کردووە و، ژیانمانی پاراستووە، هەر ئەویشە زامنی هێز و بەرگری و، دەستەبەرکاری سەرکەوتن و جێگیربوون.

ئەم پەرتووکە.. هەوڵێکی سادەیە لەم بوارەدا و، گەشتێکە بە نێو ئەو سەردەمانەی تێپەڕیون، لەمیانەیەوە نمونەی خانمانێکی چاکەکاری خواپەرستی، گوێڕایەڵی تێکۆشەر پێشکەش دەکەین، کە بە کارەکانیان مێژویان رازاندۆتەوە و، خۆری گەش بوون ئەو ساتانەی ئاسمان بە هەور تەنرابوو، یش ترۆپکی رێنمایش بوون بۆ رووناك کردنەوەی رێگای سەرلێشێواوەکان.

لە راستیدا ئافرەتی موسڵمان لە سەرەتای ئیسلام و، لە قۆناغەکانی کۆمەڵگای هۆشمەندی ئیسلامیدا، لە تەواوی توانای مرۆڤایەتیی خۆی بەهرەمەندبوو، نمونەی دیار و لوتکەی پێشەنگی بوون لە ئەمەك و دڵسۆزی و گوێڕایەڵی هاوسەرەکەی و، ئامادەکردنی پاڵەوانان لە رۆڵەکانی، لە قوربانیدان و خۆبەختکاری و هەوڵ و بەخشین و کۆشش و، لە خۆڕاگری و بەرگەگرتنی

نەهامەتی و ئەشکەنجەدان و، لە هیدایەت و تەقوا و بێگەردی و دڵفراوانی، لـە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری لە خراپە، لەپشت بەستن بەخۆی، لە فێربـوون و شـارەزایی پەیـداکردن و فێرکردنـی کەسـانی دیکـە، لـە بـوێری و ئازایـەتی و زمانپاراویی و ڕەوانبێژی و دارشتنی هۆنـراوەدا.

کاری هەمیشەیشی بریتی بوو لە پاك داوێنی و خۆگرتنەوە، دەروون بـەرزی و سـەرفرازی، ئـارامگرتن و تێکۆشـان، درێژەپێـدەری دانـەبڕاوی ئاکـاری ئاینـە ئیسلامییە مەزنەکەی بوو...

ئەمەش هەندێ نمونەی ئافرەتانە، لـە میانـەی بەشـەکانی ئـەم پەرتووکـەدا پێشکەشم کردون، بە چـاکترین ئافرەتـانی جیهانیـان دەسـتم پێکـردووە، پاشـان دایکـانی پێغەمبـەران (سـڵاوی خوایـان لێ بێـت)، دوای ئـەوەش هاوسـەرەکانی پێغەمبـەرﷺ (دایکـانی بـاوەڕداران) و کـچەکانی، ئینجـا نمونـەی هەنـدێك لـە ئافرەتـە هاوەڵـەکان و هەنـدێ لـە تابعیـەکان، دواتـر ئافرەتـانێکی نـاودار و تێکۆشەر، تا ئافرەتانێکی خواپەرسـتی دونیانەویـستمان باسـکردووە، ئـەوەشمان لەیاد نەچوە نمونەی ئافرەتانێکی زمانپاراو و قسەزان بخەینە ڕوو..

لە کۆتاییشدا ئامانجمـان ئەوەیـە، ئافرەتـانێکی پێـشەنگ و نمونـە پێـشکەش بکەین، بەڵکو بە شوێنیاندا بڕۆین و بیانکەینە سەرمەشق لە ژیانماندا..

پـەروەردگارا سـەرمان بخـە بـۆ ئـەوەی پێـت خۆشـە و مایـەی ڕەزامەندیتـە، خۆمان و برا و خوشکەکانمان لە فێڵ و تەڵەکەی تەڵەکەبازان و، داوی ناحەزان و دوژمنانی خۆت، لە دوژمنانی ئاین دوور بخـەرەوە، درود و سـڵاویش لـە سـەر دوایین پێغەمبەر و نێردراو بێت..

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين..

# بەشی یەکەم

# چاکترین ئافرەتانی جیهانیان

+ ئاسیەی خێزانی فیرعەون.
+ مەریەمی کچی عیمران.
+ خەدیجەی کچی خوەیلید.
+ فاتیمەی کچی موحەممەدﷺ.

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت:
((چاکترین ئافرەتانی جیهانیان چوارن: ئاسیەی خێزانی فیرعەون، مەریەمی کچی عیمران، خەدیجەی کچی خوەیلید، فاتیمەی کچی موحەممەد)).[١]

---

[١] رواه البخاري والترمذي في المناقب.

# ئاسیەی کچی مزاحم

## هێزانی فیرعەونی موسا

لە باشترین ئافرەتە دەگمەنەکان بووە، شووی کرد بە فیرعەونی پادشای میسر و منداڵی لێی نەبوو، فیرعەون زۆری خۆش دەویست، بەهۆی تەواومەندی سروشت و جوانی رەفتاریەوە، چەندەها نەهامەتی گێڕاوەتەوە و، نارەحەتی لابردوە و ناخۆشی گۆڕیوە بۆ خۆشی، تەنانەت بە بەزەییش بووە بۆ بەندەکان لە سەردەمی فیرعەونی فیرعەونەکان و فێلزانی فێلزانەکاندا.

لە نمونەی ئەوەش بەسەرهاتی پێغەمبەر موسا (علیە السلام)، لە سەرگوزشتەی پێغەمبەراندا هاتووە، لە کاتێکدا لە باخچە چڕوپڕ لە دار و درەخت و گوڵ و گوڵزار و مێرگە بەرین و هەمەرەنگەکەیدا بوو، رووبارەکان بەژێریدا دەڕۆیشتن، دیتیان تابوتێك بەسەر ئاوەکەدا بەرەو لایان دێت، هێمنانە رێی دەکرد، هەتا تەواو نزیك کەوتەوە، ئاسیە فەرمانی کرد بە کەنیزەکەکانی کە دەریبهێنن تا بزانن چیە و چ باسە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ : بە دایکی موسامان راگەیاند: شیری بدەیە، هەروەختێ لێی نیگەران بوی، بیهاوێژە

نـاو دەریـاوە و هـیـچ مەترسـه و خـەمیش مـەخۆ، ئێمـه بـۆتی دێنینـەوە و دەشیكەینه یەكێ لە پێغەمبەرەكان.﴾سورة القصص/٧.

كاتێـك تابووتەكـەی كـردەوە، بینـی سـاوایەكی خـوێن شـیرینی رووگەشـی تێدایە، هەست و سۆزی بزواند، سۆز و بەزەیی بـۆی بەسـەریدا زاڵ بـوو، خـوای گەورە خۆشەویستی ساواكەی خسته دڵیەوە، فەرمانی كرد بیبەن بۆ ناو كۆشك و، بایەخی تایبەتی پێبدرێت و، چاودێری بكرێت.

كاتێـك ئـەو هەواڵە گەیـشته فیرعـەون، فـەرمانی دەركـرد بیكـوژن، چـونكه خـەوێكی بینیبـوو تۆقانـدبووی، جـا فـالگر و خـەون لێكـدەرەوە گـەورەكانی وڵاتەكەی ئامادەكرد، خەونەكەی بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش ئاگاداریـان كـردەوە لـه ساوایەكی كوڕ كه له سەردەمی ئەودا له بەنی ئیسرائیل له دایك دەبێت، ئاسیه بووە رێگر له كوشتنی، لای فیرعەون تكای بۆ كرد، بەسـۆز و بەزەییـەوە بردیـه بەردەمی و وتی: ﴿قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا: بۆ مـن و تـۆ دەبێتـه مایـەی چـاوڕونی، مـەیكوژن. بەشـكو سـودی بۆمـان هـەبێ، یـان بیكەینه كوڕی خۆمان.﴾القصص/٩.

خـوای گـەورە كـوێرایی بەسـەر دڵـی فیرعەونـدا دێنێـت، تەسـلیمی بەڵگـەی بـەهێز و راسـتگۆیی قـسەكانی ئاسـیه دەبێـت، بـه ملكەچـی و ئـارەزووی خـۆی دەیداتەوە دەستی، تا ببێته دوژمن و مایەی غەم بـۆی، پێـی دەڵێـت: بـەڵام مـن هیچ پێویستیەكم پێی نیه، ئەمه ئەوپەڕی ئەوە بوو كه دەتویست.

راڤەكاران دەڵێن: ئاسیه سـەرەڕای شـۆخ و شـەنگی و كەسـێتیه بەهێزەكـەی، به ژیریی و بەڵگەی بەهێزەوە دەیتوانی كاریگەری لەسەر ئەوانەی دەوروبـەری دروسـت بكـات، بێگومـان ئـەوەش هێزێكـی راسـتییه، خـوای گـەورە ئاراسـتەی نـاڕەوای دەكـات و رایـدەماڵێت. ئـەوەبوو فیرعـەون و هامـانی وەزیـری جگـه لـه بەدەمەوە چوونی داواكەی هیچی دیكەیان به دەستەوە نەبوو، سەرەڕای ئـەوەی

کـە ئـەو مایـەی کوشـتن و خوێنرێـژی دەبێـت بـۆ فیرعـەون و هامـان و سـەربازەکانیان بـەڵام بـەخۆیان نـازانن، خـوای گـەورەش جـوانی فـەرمووی: ﴿وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَـٰكِرِينَ : ئـەوان فێڵەکـەی خۆیـان دەکـەن، خوداش فێڵی خۆی دەکات، خوداش چاکترین فێڵەزانە.﴾الأنفال/٣٠.

پاش ئـەوەی ئاسیە دڵنیـابوو لەسـەر مندالّەکە نـاوی نـا (موسـا) و لـە مـاڵی فیرعەوندا پەروەردەکرا تا پێگەیشت.

ئەوکاتـەش خـوای گـەورە فـەرمانی پێکـرد کـە پەیامەکـەی بەهۆزەکـەی رابگەیەنێت، ئاسیە لەو کەسانە بوو کە بڕوایان هێنا بە موسا، کاتێك فیرعـەون بەوەی زانـی هـەموو خۆشەویستیەکەی بـۆی گـۆڕا بـە دوژمنایـەتی، بـەڵام ئـەو گوێی پێ نەدەدا، چونکە دەیزانی کە لەسەر حەقە.

بەراسـتیش ئیمـانێکی پتـەوی بـەتین بـوو، بـەرەو رووی فیرعـەون و هـۆزە سـتەمکارەکەی وەسـتا و تـاکو تـەنهایی خـوا و بـانگی حـەقی ئاشـکراکرد و، بەندایەتی جگە لـە خـودای پـەروەردگاری جیهانیـانی رەتکـردەوە و، بەهەشـتی لای پەروەردگاری هەڵبژارد و، دڵنیابوو لە توانا و مەزنێتی خوا کە لـە دەسـت ستەم و زۆرداری و دڵڕەقـی فیرعـەون دەربـازی دەکات، ئاسـیە پێرێکـی دیکـەی مـرۆڤ بـوو، پێرێـك فیترەتەکـەی سـاغ و دروسـت بـوو، پەنهانیـشی بێگـەرد و، هەتوانی برینەکانی کـرد و، لـە حـەق جـودا نـەدەبووەوە و، سـەری بـۆ ملهوڕان کەچ نەدەکرد و، رازی نەبوو و خۆی گەورەتـر گرت لە بانگەوازەکـەی فیرعـەون کـە خـۆی خودایـە و، هـەموو ئـەو دەسـتەڵات و پلـە و پایـەی تێیـدا دەژیـا بەجێهێـشت لـە پـاش خـۆی و، سـەرەڕای هەڕەشـە و گوڕەشـە و دڵڕەقـی ئـەو تۆڵەیەی چاوەڕوانی دەکرد، بڕوای هێنا و بانگەوازەکـەی موسـا(علیـە السلام)ی بەراست زانی، شەهیدبوونی لە پێناوی بیروباوەڕەکەیدا هەڵبـژارد و بـە دڵێکی ئاوەدان بـوو بـە ئیمانـەوە و بەوپـەڕی بـەرزی دەنگی وتـی: ئیمـانم هێنـاوە بـە

پەروەردگاری موسا و هارون، فیرعەون نەیتوانی بیترسێنێ بەوجۆرەی کە گەلەکەی ترساندبوو، هەر بۆیە شایستەی ئەوەیە کە خوای گەورە بە نمونەی ئافرەتانی چاکەکاری بڕوادار بیهێنێتەوە، خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ: خودا بۆ کەسانی خاوەن باوەڕ، نمونە بە ژنەکەی فیرعەون دێنێتەوە. کە لەبەر پەروەردگاری خۆی پاڕایەوە، تۆ لەلای خۆت لە بەهەشتدا ماڵێکم بۆ دیاری بکە و رزگارم بکە لە فیرعەون و کردەوەی ئەو، لە کۆمەڵی ناهەقانیشم راهی کە.﴾التحريم/١١.

خوای گەورە پاڕەوانەکەی گیرا کرد و لەسەر زاری پێغەمبەری خوداوەﷺ هاتووە کە لە چاکترین ئافرەتانی جیهانیانە..

جا بەراستی ئاسیە بەهۆی حەقەوە بەرزبووەوە و بڕوای بە غەیب هێنا و، ئەو رووبارانەی کە بە ژێر پێیدا دەڕۆیشت لەم دونیا بڕواوەیەدا سەرنجی رانەکێشا و، بریقەی هەڵخەڵەتێنەری بەرچاوی گومڕای نەکرد، بەڵکو دامەزراوتر بوو لەسەر شایەتی دان کە جگە لە (الله) هیچ خودایەکی دیکە نیە لەو ساتەوەی بڕیاری دا و وتی لەگەڵ تێکڕای دروستکراوەکان لەبەردەستی خودای تاك و تەنهادا و ئەوان پاشتر دەبنە رۆح لە مەلەکوتی خوادا هەتا بە رازی بوونی و رازی کراوی لەگەڵ پێغەمبەران و شەهیدان و چاکەکاراندا گەیشتەوە بە پەروەردگار، بەراستیش ئەوانە چاکترین هاوەڵن.

ئەمەش لە فەرمایشتی خوای بالادەستدا جێگیرە:

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدْنَآ أَن تَقُولُواْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ : ئەوساتەش کە پەروەردگاری تۆ لە پشتی نەوەکانی ئادەم زارووێی بەرهەم هێنا، لەسەر

خۆیان شایەتی هەر بە خۆیان دا، گوتی: من پەروەردگارتان نیم؟ گوتیان: بەڵێ، ئێمە لەوە ئاگادارین. نەکا رۆژی قیامەت بڵێن: لەوە بێئاگابووین.﴾الأعراف/١٧٢.

لە فەرموودەیەکی قودسیدا لەسەر زمانی پێغەمبەری خوداوەﷺ هاتووە کە خوای گەورە بە هەموو دروستکراوەکانی فەرمووە کە جگە لە من هیچ خودایەك نیە و، هیچ پەروەردگارێکیش نیە جگە لە من، هیچ هاوبەشم بۆ دامەنێن، من پەیامبەرانی خۆمتان بۆ رەوانە دەکەم تا پەیمان و بەڵێنی منتان بهێننەوە یاد و، پەڕاوەکانم دەنێرم بۆتان، وتیان گەواهیمان دا کە تۆ خودا و پەروەردگارمانی و جگە لە تۆ پەروەردگاری دیکە نیە..[1]

وەك ئەوەی لای بم ئەو کاتەی کە هۆزەکەی بە هەڵە دەزانێت، لەکاتێکدا دەبینێت مرۆڤێکی وەك خۆیان دەپەرستن و کڕنۆشی بۆ دەبەن لەبری خوای گەورە، جا ئەویش هەمان ئەو قسانەیان پێدەڵێت کە پەپووسلێمانە وتی: ﴿أَلَّا يَسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي يُخْرِجُ الْخَبْءَ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ : ئایا سوژدە بۆ خوایەك نابەن کە شاراوەکانی ئاسمانەکان و زەوی ئاشکرا دەکا و، چی بشارنەوە و چی ئاشکرا بکەن، ئەو دەیزانێ.﴾النمل/٢٥.

یان دەڵێی لەوێدام کە لەسەر ئاینەکەی یوسف (علیه السلام) خوا دەپەرستێ: ﴿ءَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ ۚ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ : ئایا چەندین پەروەردگارتان پێباشترە یاخۆ خودای تاك و تەنهای زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا؟ ئەوانەی دەیانپەرستن، چەند شتێکی

[1] ئیمام ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

غەیرە خودان، كە خۆتان و باب و باپیرانتان ناوتان لێناون، هیچ بەڵگەیەكی پتەویان لە خواوە لە دەستیاندا نیە. فەرمانیش هەر هی خودایە و هەر ئەویش فەرمانی داوە كە غەیری ئەو نەپەرستن.﴾یوسف٣٩-٤٠

هەر دەڵێی لەوێدام گاڵتەی بە فیرعەون دێت، لەكاتێكدا كە گەلەكەی گومڕا دەكات و پێیان دەڵێت: ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ : فیرعەون گوتی: چی خۆم بە چاكی دەبینم، هەر ئەوەتان پێ دەڵێم، هەر ئەو رێگەی كە من نیشانتانی دەدەم راستەڕێیە.﴾غافر/٢٩.

شەهیدبوونی ئاسیەش، لە رۆژی سەركەوتنی موسا و هاروندا بوو بەسەر فیرعەون و دەست پێوەندەكانیدا لە رۆژی رازاندنەوەدا.

(ئیبن جەریری طەبەری) دەڵێت: ((خێزانەكەی فیرعەون پرسیاری دەكرد كێ سەركەوت، پێی وترا: موسا و هارون سەركەوتن، ئەویش دەڵێت: بڕوام هێنا بە پەروەردگاری موسا و هارون)).[1]

كاتێك گۆچانەكەی موسا هەموو هەڵبەستراوی جادوبازەكانی فیرعەونی قوتدا، بڕوادارەكان ئیمانداری خۆیان راگەیاند و، بێباوەڕانیش كوفری خۆیان ئاشكرا كرد:

﴿ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ : جادوگەران كڕنۆشیان برد، گوتیان: ئێمە بڕوامان هێنا بە پەروەردگاری جیهانیان، پەروەردگاری موسا و هارون.﴾الشعراء/٤٦-٤٨.

فیرعەونیش بەرانبەر ئەو بڕواهێنانەیان هەڕەشەی بڕینی دەست و قاچیانی لە پشتەوە و هەڵواسینی هەموویانی لێكردن.

---

[1] بڕوانە تەفسیری طەبەری.

بەلام ئاسیە، فیرعەون سەربازەکانی نارد گەورەترین بەرد بدۆزنەوە و بیدەن بە سەریدا، گەر بەردەوام بوو لەسەر قسەی خۆی و ئیمانهێنانی بە موسا و بانگەوازەکەی، تینی ترسی ئەوە ئاسیەی نەلەرزاند و گوێی نەدا بەوەی لەدەوروبەری روو دەدات، بەڵکو چاوەکانی هەڵبڕی بۆ ئاسمان، لە کاتێکدا کە سەربازەکان لەوەدا بوون بەردەکە بدەن بە سەریدا و، لەو کاتەدا وتی:

﴿قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ: پەروەردگارا! لەلای خۆت لە بەهەشتاماڵێکم بۆ دروست بکە و، لە فیرعەون و کردەوەی ئەو رزگارم بکە و، لە کۆمەڵی ناهەقانیشم راهی کە.﴾التحریم/١١.

ئەو لە جیهانێکی دیکەدا بوو هیچ کێشی بۆ ئەوە دانەدەنا کە بەرامبەری ئەنجامی دەدەن، بەڵکو بەهێزی باوەڕەکەیەوە هاتە پێشەوە و رووی کردە پەروەردگار و دروستکاری و داوای نیشتەجێکردنی لەلای خۆی لە بەهەشتدای لێدەکرد، هێندەی نەبرد ماڵەکەی خۆی لە بەهەشتدا بەدیکرد لە کاتێکدا کە هێشتا لەنێو دوژمنەکانیدا بوو پەریە چاوڕەشەکان پێشوازییان لێدەکرد. بە شادیەوە پێکەنی بەوەی کە دەیبیست و دەیبینی، پاشان گیانی پاکی بەرەو لای پەروەردگاری کەوتە گەشت بەر لەوەی فیرعەون و سەربازەکانی دەستیان پێی بگات، فیرعەون لە کاتێکدا لەسەر سەری راوەستابوو سەری سوڕما و، وتی: سەرتان سوڕنامێنێ..؟!! ئێمە ئازار و ئەشکەنجەی دەدەین و ئەو پێدەکەنێ،[1] نەیدەزانی کە ئەودونیای براوەی بەجێهێڵاوە و، لە ماڵی خۆشیی هەمیشەییدا جێگیر بووە و دڵشادە بەوەی پەروەردگاری پێی بەخشیوە شادمان دەبێت بەوانەی پێی دەگەن لە شەهیدان و چاکەمەندان، خۆشحاڵە بە کۆشکە بڵند و

---

[1] تەفسیری (ابن کثیر).

جوانەکەی لای پەروەردگاری، کۆشکێك کە وەك کۆشکەکانی دونیا نیە، کۆشکێك لەوەی کە چاو نەیبینیووە و گوێ نەیبیستووە و، بە دڵی هیچ مرۆڤێکدا نەهاتووە تێیدایە، خوای گەورەش راستی فەرمووە:

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ : ئەو کەسانەی لەرێی خوادا کوژراون، بە مردوویان حیساب مەکەن، بەڵکو زیندوون و لای پەروەردگاریان بژێویان دەدرێتێ.. دڵیان خۆشە بەو چاکەیە کە خودا دەربارەی کردوون. شادن بەوەش کە ئەوانەی وا نەگەیشتوونەتە ئەمان و بەجێماون، هیچ ترسێکیان لەسەر نابێ و هیچ خەمێکیان لەبەر نابێ.﴾آل عمران/١٦٩-١٧٠.[1]

[1] لە کتێبی (نساء فاضلات)ی عبدالبدیع صقر وەرگیراوە بە کورتکراوەی و دەستکاری و زیادکردنەوە.

# مەریەمی کچی عیمران

## دایکێکی کچ

مەریەمی کچی عیمران لە راستیدا بەڵگەیەکە لە بەڵگە و نیشانەکانی خوای گەورە لەسەر زەوی، لە دایکبوونەکەی بەڵگە و نیشانە بوو، ژیانیشی بە هەمان شێوە بەڵگەبوو، رەچەڵەکیشی هەر بەڵگە بوو..

سەبارەت بە رەچەڵەکی ئەو لە سەرووی خانەوادەی ئالی عیمرانەوە بوو کە خوای گەورە هەڵیبژاردن، خوای گەورە دەفەرمویێت:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾ ذُرِّيَّةَۢ بَعۡضُهَا مِنۢ بَعۡضٖۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ : خودا ئادەم و نوح و نەتەوەی ئیبراهیم و بەرەی عیمرانی بەسەر هەموو جیهاندا هەڵبژارد و پاکی کردنەوە، نەوەیەکن کە هەندێکیان لە هەندێکیانن، خوا بیسەر و ئاگادارە.﴾آل عمران/٣٣-٣٤.

لە دایکبوونەکەیشی، بەهەمان شێوە بەڵگە و نیشانە بوو... چونکە دایکی نەزۆك بوو و حەزی دەکرد کوڕی ببێت، هەر بۆیە لە پەروەردگاری پاڕایەوە کە کوڕێکی پێ ببەخشێت، خوای گەورەش پاڕانەوەکەی گیراکرد ئەوەبوو کاتێ

سکی پڕ بوو نەزری کرد، کە بیبەخشێت بۆ خزمەتکردنی (بیت المقدس).[1]

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ : کاتێ ژنەکەی عیمران گوتی: ئەی پەروەردگاری من! ئەو منداڵەی کەوتۆتە زگی منەوە، من بەتەواوی پێشکەشی تۆی دەکەم، بەهیوام لێم قبوڵ بکەی، هەرتۆ بیسەر و ئاگاداری.﴾آل عمران/٣٥.

خوای گەورەش لە کوڕ باشتری پێبەخشی، لە رۆژانی داهاتوودا-کە کچ بوو-، بەخششێك بوو لەلایەن خودای باڵادەستەوە و، ناوی نا مەریەم.

﴿ فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ ۖ وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ : کاتێ کە زگەکەی دانا، گوتی: ئەی پەروەردگارم! من کچم بووە، خوداش چاکتر دەزانێ چی بووە، دیارە کچیش وەکو کوڕ نیە، من ناوم لێناوە مەریەم، ئەوا ئەویش و نەوەکەشی بەتۆ پەنا دەدەم لە شەیتانی نەفرینکراو.﴾آل عمران/٣٦.

ئەوەش مەزنترین وەرگرتنی نەزرەکەی دایکی مەریەم بوو، چونکە خوای گەورە مەریەمی کردە ئامرازێکی خزمەتکردنی پەروەردگار کە لە رووی رێزەوە لە سەرووی خزمەتەکانی پیاوە رزگارکارەکانەوەیە، بۆ (بیت المقدس) بە چەند قات، تا بزانێت کە مەریەمی کچی هەر لە لەدایکبوونیەوە بە چاودێری خوای گەورە دەورەدراوە، بە شێوە و وەرگرتنێکی جوان لەدایکی وەرگرت و بەچاکی و جوانی پەروەردەی کرد تا خوای گەورە لەسەر دەستیدا موعجیزەی وای نارد هەموو جیهانیانی سەرسام کرد، ئەمەش واتای ئەو فەرمایشتەی پەروەردگاری باڵادەستە:

---

[1] البداية والنهاية/ ابن كثير

﴿ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا : پەروەردگاری ئەو، گەلێ بەباشی دیارییەکەی لێ وەرگرت و، کچەکەی بە پەروەردەیەکی چاك پێگەیاند﴾آل عمران:٣٧.

ئا ئەوە مەریەمە، پاڕانەوەکەی دایکی کە بەچاکتر گیرابوو، خوای گەورەش بۆ هەرکەس ئارەزوی لەسەر بێت چەندقاتی دەکات و، خوای گەورە خاوەنی فەزڵ و بەخششی مەزنە، بەهۆی ئەو ڕێزلێنانەوە شایستەی ئەوەیە کە لەو ئافرەتانە بێت پێغەمبەری خواﷺ لە فەرموودەکەیدا ناوی هێناون: ((چاکترین ئافرەتانی جیهانیان: ئاسیەی خێزانی فیرعەون و، مەریەمی کچی عیمران و، خەدیجەی کچی خوەیلید و، فاتیمەی کچی موحەممەد)).

مەریەم بە هەتیوی لەدایکبوو، هێشتا لە سکی دایکیدا کۆرپەلە بوو باوکی مرد،[١] کاتێك لەدایك بوو دایکی بردی بۆ (بیت المقدس) هەتا ئەمەکدار بێت بەرامبەر نەزرەکەی و، دایە دەست خواپەرستە زاهیدەکانی مزگەوت تا لە ساواییەوە کە هێشتا نینۆکەکانی نەرمە، لەسەر گوێڕایەڵی و پەرستش پەروەردە بکرێت.

خواپەرستەکان بوو بە ململانێیان، لەسەر ئەوەی کامیان مەریەم لە ئەستۆ بگرێت، (زەکەریا)ی پێغەمبەری خوا(عليه السلام) پێشەوایان بوو، لەنێو خۆیاندا پێکهاتن تیروپشك بکەن، قورئانی پیرۆزیش ڕوداوی تیروپشکی خواپەرستەکانی تۆمار کردووە و، دەفەرموێ:

﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ : تۆ لەوێ نەبوویت کە قەڵەمیان هەڵدەدا تا بزانن کێ سەرپەرشتی مەریەم بکات، لەوێ نەبوویت کاتێك کێشەیان دەکرد.﴾آل عمران/٤٤.

---

[١] تأريخ الأمم والملوك

ئەنجامی تیروپشکەکەش سێجار لەسەر یەك دوپاتی کردەوە، کە زەکەریا پەروەردەکردنی مەریەم لە ئەستۆ بگرێت، ئەوەبوو خواپەرستەکان (مەریەم)یان دایە دەست (زەکەریا)ی پێغەمبەری خوا، کە جێگایەکی بەرێزی لە مزگەوتەکەدا گرتبوو و تەرخانی کرد بۆی، تا پەرستشی پەروەردگاری تێدا ئەنجام بدات و لە سەرەی خۆیدا هەستێت بە خزمەتکردنی (بیت المقدس)، بەم شێوەیە هەموو ژیانی بە پوختی بۆ خوا بوو و، بەهۆی زۆری کاتی پەرستیشیەوە کەراماتی لێدەردەکەوت، ئەوە بوو هەر کە زەکەریا دەچووە سەردانی لە میحرابدا، لای ئەو خواردن و خواردنەوەی وای دەبینی وێنەی نەبوو، کە پرسیاریشی لێ دەکرد ئەمەت لە کوێ بوو، دەیوت: ئەوە لای خوای گەورەوەیە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَـٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَـٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ : هەرجارێکی زەکەریا سەری لە مەریەم دەدا لە میحرابەکەیدا، دەیدی بژێوی لەلایە، گوتی: مەریەم! ئەم بژێوەت لەکوێ بوو؟ گوتی: لەلایەن خوداوە بۆم هاتوە؛ خودا حەزکا بۆ هەرکەسێ رۆزی بێهەژمار دەنێرێ.﴾آل عمران/٣٧.

ئەم موعجیزەیەش کە خوای گەورە لەسەر دەستی مەریەمدا نیشانی دەدا، بە شێوەیەکی بەرجەستە چاودێری کردنی خوای گەورە بۆ ئەولیاکانی خۆی لای زەکەریا سەلماند و بیروباوەڕە پتەوەکەی زیاتر بەتین کرد کە خوای گەورە لەگەڵ ئیمانداراندایە، هەر بۆیە بە دڵسۆزیەوە رووی کردە پەروەردگاری بەو ئومێدەی، چاودێریەکی ئاوەها لای پەروەردگاری بالادەستی بە دەست بهێنێت و، لەو کەراماتانەشدا پشکی خۆی هەبێت، ئەوەبوو لە کاتێکدا کە ئەو پیرێکی ئێسك لاوازی سەرسپی بوو لە پەروەردگاری پاڕایەوە تا وەچەیەکی چاکی پێ ببەخشێ:

﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥۖ قَالَ رَبِّ هَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةٗ طَيِّبَةًۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ : هەر لەوێدا زەکەریا داوای لە پەروەردگاری کرد: ئەی پەروەردگارم! زارۆیەکی چاك و پاکم پێببەخشە، دەزانم تۆ پاڕانەوەی من دەبیسی.﴾آل عمران/٣٨.

پەروەردگاریشی نزاکەی گیرا دەکا و، مژدەی لەدایکبوونی کوڕێکی پێ دەدات کە ناوی یەحیایە، جا زەکەریا هەروەك چۆن سەراسیمە بوو کە بینی رزق و رۆزی دێت بۆ مەریەم لە میحرابەکەیدا، لەم مژدەیەش سەری سوڕما لە کاتێکدا خێزانەکەی نەزۆکە و تەمەنیشی گەورەیە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ فَنَادَتۡهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٞ يُصَلِّي فِي ٱلۡمِحۡرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحۡيَىٰ مُصَدِّقَۢا بِكَلِمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدٗا وَحَصُورٗا وَنَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَقَدۡ بَلَغَنِيَ ٱلۡكِبَرُ وَٱمۡرَأَتِي عَاقِرٞۖ قَالَ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ : لەکاتێکدا لەناو میحرابەکەدا نوێژی دەکرد، فریشتە بانگی کرد: خودا مزگێنیت پێدەدا بە کوڕێك کە ناوی یەحیایە، کە فەرموودەی خودا دەسەلمێنێ و مرۆڤێکی گەورە و خۆڕاگر و یەکێك لە پێغەمبەرە چاکەکان دەبێ﴾آل عمران/٣٩-٤٠.

ئەم مژدەیە وەك ئەوە وابوو کە هاتبێت بۆ زەکەریا تا دڵنیا بێت کە خوای گەورە بۆ کارێکی ترسناکی ئامادە دەکات و، بۆ فەرمانێکی مەزن دەیسازێنێ، ئامادەی دەکات بۆ رازی بوون بە لەدایکبوونی عیسا لە دایکی شونەکردووی کە هیچ مرۆڤێ دەستی پێی نەگەیشتبوو.

بەڵێ مژدەکەی زەکەریاش بە هەمان شێوەی مژدە بۆهاتنی مەریەم بە سکبوونی بە عیساوە هات، هەتاوەکو متمانەی بە مەریەم نەلەخشێ فریشتەکان بانگیان لێکرد و مژدەی یەحیایان پێدا، جا ئایا زەکەریا پاش ئەوەی کە بەڵگە و نیشانەی لە خۆیدا بینی دەتوانێ کە هاوشێوەی لە مەریەمدا ببینێ رەتی بکاتەوە و بڕوای پێی نەبێ؟!

خوای گەورە هەر چۆن زەکەریای ئامادەکرد بۆ رازیبوون بەو موعجیزەیە، مەریەمیشی ئامادەکرد بۆ وەرگرتنی ئەو موعجیزە دەراسایەی کە پێچەوانەی هەڵسوڕانی گەردوون و ژیان بوو، هەتاوەکو نەتۆقێت یان نائومێد نەبێت لە کاتێکدا کە بەرەورووی هۆزەکەی دەبێتەوە، بەرانبەر ئەم هەڵوێستە ناڕەحەتەی و، تا بزانێت کە لە هەر کوێ بێت خوای گەورەی لەگەڵدایە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ : لەو کاتەدا فریشتەکان گوتیان: مریەم! خودا مژدەی بەڵێنێکی خۆت پێدەدا، کوڕت دەبێ و بەناو مەسیحی کوڕی مەریەم ناو دەردەکا و لە دنیاش و لە قیامەتیش قەدری هەیە و یەکێك لە نزیکەکانی خودا. لە بێشکەدا و بە گەورەییش قسە لەگەڵ خەڵك دەکا و یەکێك لە پیاوچاکان دەبێ.﴾آل عمران/٤٥-٤٦.

کەوابوو خوای گەورە مەریەمی ئامادە دەکرد بۆ گەیاندنی پەیامەکەی و، زەکەریای سەرپەرشتیاریشی ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بەرگری لەو پەیامە بکات:

﴿ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ : خوا دەهانای ئەوانە دێ کە یاریدەی خوا دەدەن.﴾الحج/٤٠.

مەریەم سەراسیمە بوو هەر کە مژدەکەی پێگەیشت و وتی: ﴿رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ ۖ : پەروەردگارا! چۆن منداڵم دەبێ، کە من تا ئێستا هیچ مرۆیەك تخونم نەکەوتوە!﴾آل عمران/٤٧.

خوای گەورەش وەڵامی دەداتەوە: ﴿كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا

يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ : خودا هەرچی حەزکا بەدی دێنێ، هەرکە ویستی کارێك ببێ، هەرکە پێی بڵێ ببە! دەبێ.﴾آل عمران/٤٧.

خوای گەورەش پاش ئەوەی بەهۆی بانگکردنیەوە لەلایەن فریشتەکانەوە ئەو مژدەیەی بە مەریەم راگەیاند پێویست بوو کە شتێکی وا نیشانی مەریەم بدات کە دامەزراوی و ئیمانی زیاتر بچەسپێنێت، ئەوەبوو لە کاتێکدا کە مەریەم بە تەنها بوو لە ئەشکەوتێکدا کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی (بيت المقدس) تا هەندێ ئاوی پێبدرێت، جا جبریل(عليه السلام) لەسەر شێوەی مرۆڤ هاتە ئەوە ئەشکەوتە، زۆر ترسا لێی نەبادا ئەو کەسەی هاتووە خراپ سەیری ئەم بکات لە جێگایەکدا کە خۆی پەناداوە لە هەموو خەڵکی، هەر بۆیە بە دەنگی بەرز هانای بۆ پەروەردگاری برد تا لەم مرۆڤە بیپارێزێ و پاکی و پارێزگاری و تەقوای تێدا ببوژێنێتەوە تاوەکو دووری بخاتەوە لە بیرکردنەوە لە سەرپێچیکردنی خوای گەورە لەگەڵیدا، خوای گەورە لەم فەرمایشتەیدا وێنای ئەو دیمەنە سامناکەمان بۆ دەنەخشێنێ:

﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ ﴿١٧﴾ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا ﴿١٩﴾ قَالَتۡ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا ﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞۖ وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ وَرَحۡمَةٗ مِّنَّاۚ وَكَانَ أَمۡرٗا مَّقۡضِيّٗا : لەم کتێبەدا باسی مەریەمیش بکە، کاتێ دوور لە کەس وکاری، شوێنێکی خۆرهەڵاتی بۆ خۆی هەڵبژارد.. لەنێوان خۆی و ئەماندا پەردەیەکی هەڵدا، ئێمە رۆحی خۆمان بۆ نارد، وەك بنیادەمێکی تەواو هاتە بەرچاوی، وتی: من پەنا دەبەمە بەر خودا لە تۆ، ئەگەر تۆ پارێزکاریت.. گوتی: من نێردراوی پەروەردگاری تۆم، تا

منداڵێکی پاك و خاوێنت پێ ببەخشم.. گوتی: چۆن منداڵم دەبێ، کە هیچ مرۆڤێك لەپێشدا دەستی پێم نەکەوتوە و، هەرگیز داوێن پیسیش نەبووم.. گوتی: فەرمان ئەمەیە و پەروەردگاری تۆ وتویە: ئەوە لەلای من ئاسانە و، دەمانەوێ چاکەیەك بێ لە ئێمەوە و نیشانەیەك بێ بۆ خەڵك، ئەم فەرمانەش هەر دێتە جێ.﴾مریم/١٦-٢١.

جا مەریەم دڵئارام دەبێت لەوەی کە ئەو پیاوەی بەرامبەریەتی نێردراوی خوای گەورەیە، بەلاّم ئەم نێردراوە نورانیە چۆن چۆنی کورێکی پێدەبەخشێت، جا لێی دەپرسێت: ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا: چۆن منداڵم دەبێ، کە هیچ مرۆڤێك لەپێشدا دەستی پێم نەکەوتوە و، هەرگیز داوێن پیسیش نەبووم﴾مریم/٢٠.

لە کاتی بە ئاگاییدا زۆر خێرا بەشێوەیەکی رۆحانی سکبوونەکەی روودەدات، جا جبرائیل (عليه السلام) بەدەم فوو دەکات بە یاخەی کراسەکەی مریەمدا، لە داوێنی کراسەکەی دەردەچێت و سکبوونەکەی بەشێوەیەکی رۆحانی و دوور لە دوژمنکاری و دەستدرێژی لەلای خوای گەورەوە بۆ دروست دەبێت و، ئەمەش لە کاتێکدا روودەدات کە بە ئاگایە تا نەکەوێتە گێژاوی گومان بەوەی کە مرۆڤ یان جنۆکە لە کاتێکدا کە ئەم خەوتبێ و دەستی بۆ هێنابێ، بەوەش دەستەوسان بێت یان بشێوێت لە بەردەم ئەوانەدا، کە چێژ لە باسکردنی ناموسی داوێن پاکان وەردەگرن، ئەمەش رەحمەتی خوای گەورەیە و مەریەمی پێ بەرزکرایەوە، پاشتر لە کاتێکدا کە سکپڕ بوو تەواو دڵنیا بێت لەوەی کە سکپڕیەکەی دەرئەنجامی فویەك لە رۆحی خوای گەورە بووە.

دیاردەکانی سکپڕی لە مەریەم دەستی بە دەرکەوتن کرد و، یەکەمین کەسیش کە بینی (یوسف نەجار)ی ئامۆزای بوو، بەرێز و ئەدەبەوە پرسیاری لێکرد، چونکە ئەو ئاشنای تەقوا و داوێن پاکی مەریەم بوو، گفتوگۆیەکی

ژیرانە لە نێوانیاندا روویدا، هەروەك پێشتر بۆ زەكەریای گێڕایەوە و بڕوای پێكرد و باوەڕی پێهێنا، خوای گەورە ئامادەی كردبوو بۆ ئەو كارە و، بە چاوی خۆی نزیكایەتی مەریەمی لە پەروەردگاری دەبینی كە لە میحرابەكەیدا خواردنی بۆ دەهات بەبێ كۆشش و ماندووبوون، بەڵام ماوەتەوە بەرەو روو بوونەوەی ئەو و هۆزەكەی، ئەو بەرەوڕووبوونەوە ناڕەحەتەی كە هەموو حسابێكی بۆ دەكرد.

كات و ساتی منداڵبوونی نزیك بووەوە، بە تەنها و، دوور لە چاوی خەڵكی پاڵی دابوو بە قەدی دارخورمایەكەوە، جۆرەها ئەندێشە خەیاڵیان تەنی بوو و خوازیار بوو كە پەروەردگار بەر لەم ئەزموونكردنە سەختە بیمراندایە:

﴿فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا (٢٢) فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا : زگی پڕ بوو و بەو زگەوە خۆی گەیاندە شوێنێكی دوور.. ژانی منداڵ بوون بردی بۆ لای قەدی دارخورمایەك، گوتی: خۆزیا هەر بەر لە ئێستا دەمردم و یەكجێ لەبیر دەچومەوە.﴾مریم/٢٢-٢٣.

لەتەك ئازاری دەروونیدا، ئێش و ئازاری جەستەیشی لەسەر كۆ دەبێتەوە كە لە كاتێكدا كە بەرەو رووی ژانی منداڵبوون دەبێتەوە، بە تاك و تەنها، بێ ئەنیس و هاودەم، لە گەرمەی ئەم ئازار و ژانەدا، لە قوڵایی ئەم ناخۆشیەدا، كارە لەناكاوە مەزنەكە روودەدات، تا دڵئارام و رازی بێت و، منداڵەكە لەدایك دەبێت و، لە خوارەوە بانگی دەكات كە خەم نەخوات و هێور و دڵئارام بێت، چونكە خوای گەورە وادە و بەڵێنی خۆی بردە سەر و پێی دەڵێ:

﴿وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا : قەدی دارخورماكە بهەژێنە، خورمای تازەپێگەیشتووت بەسەردا دادەوەرێنێ.﴾مریم/٢٥.

تا لەو بیرکردنەوە ناخۆشانەیەوە بیگەڕێنێتەوە بۆ نێو خۆشی کارکردن و ئەو بەختەوەریەی کە لە پەیداکردنی ڕۆزیدایە و، هۆکار بەکار بهێنێت و قەدی دارخورماکە ڕابوەشێنێت و، پاشان هەواڵی ئەوەی پێدەدات کە خوای گەورە لە خواریەوە جۆگەیەکی وا لێ کردووە ئاوی لێ هەڵبقوڵێت تا پاش خواردنی خورما تەڕەکە کە سوودمەندترین خواردنە بۆ زەیستان تینویەتی خۆی پێ بشکێنێت.

قورئانی پیرۆز وێنەی ئەو موعجیزە گەورەیەش لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەخاتە ڕوو:

﴿فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ أَلَّا تَحۡزَنِي قَدۡ جَعَلَ رَبُّكِ تَحۡتَكِ سَرِيّٗا ﴿٢٤﴾ وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ﴿٢٥﴾ فَكُلِي وَٱشۡرَبِي وَقَرِّي عَيۡنٗاۖ : لەلای ژێرەوەی بانگی کرد: خەمت نەبێ، پەروەردگارت لەژێر تۆدا جۆگە ئاوێکی پێك هێنا.. قەدی دارخورماکە بهەژێنە، خورمای تازەپێگەیشتووت بەسەردا دادەوەرێنێ.. بەچاوی ڕوون بخۆ و بخۆوە.﴾مریم/٢٤-٢٦.

منداڵەکە هەست بە باری شێواوی دایکی دەکات، کە بیر لەوە دەکاتەوە کە بیڵێ بە خەڵکی کاتێ کە ئەم هەڵدەگرێ و دەیباتەوە بۆ لایان، لەو کات و ساتەدا دەرووی نیشان دەدات و دەربازی دەکات لەو ناڕەحەتیە و پێی دەڵێت کە هەر مرۆڤێکی بینی بڵێ من نەزرم کردووە لەسەر خۆم بۆ پەروەردگار بەڕۆژووم و قسە لەگەڵ هیچ مرۆڤێکدا ناکەم هەر کەس بێت، لەو ساتەشدا ساواکە لە بری ئەم ئەرکی وەڵامدانەوە دەگرێتە ئەستۆ و دەمی هەموویان بە موعجیزە گەورەکەی دادەخات و، ڕێز و پلە و پایە و ڕێزی مەریەمی پاکیزەی کچی عیمران و دایکی عیسا(عليه السلام)یان نیشان دەدات.

مەریەمیش هێور دەبێتەوە و مێشکی ئاسوودە دەبێت کاتێك کە چارەسەرێکی جوان بەدی دەکات بۆ ڕوبەڕووبوونەوەی گرفت و کێشەی لەگەڵ

خەڵکدا، قورئانی پیرۆز لە چەند ئایەتێکی پیرۆزدا وێنەی ئەو رووداوە مەزنانەمان بۆ دەنەخشێنێ:

﴿فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥ ۖ قَالُوا۟ يَـٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا فَرِيًّا ﴿٢٧﴾ يَـٰٓأُخْتَ هَـٰرُونَ مَا
كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ ۖ قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِى
ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّى عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِىَ ٱلْكِتَـٰبَ وَجَعَلَنِى نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِى مُبَارَكًا أَيْنَ مَا
كُنتُ وَأَوْصَـٰنِى بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِى وَلَمْ يَجْعَلْنِى جَبَّارًا
شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَـٰمُ عَلَىَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا: هاتەوە ناو هۆزەکەی و منداڵێك بە باوەشیەوە بوو، گوتیان: مریەم! وامان لەتۆ رانەدەدیت خراپەیەکت لێ رووبدا.. ئەی خوشکی هارون! تۆ نە باوکت پیاوخراپ بوو، نە دایکیشت داوێن پیس بوو.. ئاماژەی بۆ منداڵەکە کرد. وتیان: جا چۆن لەگەڵ ساوای سەر بێشکەدا بدوێین.. منداڵەکە وتی: من بەندەیەکی خودام، کتێبی بە خەڵات دامێ و کردمی بە پێغەمبەر.. لە هەرکوێش بم، پیرۆزم دەکات و رایسپاردووم هەتا زیندووم نوێژ بکەم و زەکات بدەم.. هەروا گوێڕایەڵی دایکیشم بم، نەشی کردووم بە ملهوڕێکی سەربزێو.. سڵاوم لێبێ رۆژێ کە لەدایك بووم و ئەو رۆژەی کە دەمرم و ئەو رۆژەش کە زیندوو دەکرێمەوە.﴾مریم/٢٧-٣٣.

مەریەم تەواو دڵنیابوو کە پلە و رێزی لای خوای گەورە زۆر مەزنە، پاش ئەوەی کە خوای گەورە چارەسەری سەرکەوتووی بە موعجیزەیەکی دەگمەن بۆ رەخساند، بەوەش لە تێکڕای ئێش و ژانە دەروونیی و جەستەییەکانی حەوایەوە دوای ئەوەی کە بە خورماکە هێزی هاتەوە بەر هەتا توانای بەرەورووبوونەوەی خەڵکی هەبێت و، نارەحەتی لەسەر هەڵبگرێت فەرمانی پێدەکات کە قسە نەکات و، ئاماژە بکات بۆ ساواکەی کە خوای گەورە هێنابوویە

قسەکردن تا زمانەکان لاڵ بکات و بە خەڵکی نیشان بدات کە خوای گەورە بالادەستە بەسەر هەموو شتێکدا.

جا عیسى (عليه السلام) پاش ئەوەی لەگەڵ خەڵکیدا قسەی کرد تا دایکی لە قسە بۆ هەڵبەستن و بوختان بپارێزێت لە قسەکردن وەستایەوە.. پاشان مەریەم بە ساواکەیەوە بەرەو میسر کۆچی کرد و لەوێ لە پەروەردەکردن و پێگەیاندن و فێرکردنیدا ناڕەحەتی چەشت، هەر کە گەیشتە سیازدە ساڵی خوای گەورە فەرمانی پێکرد کە بگەڕێتەوە بۆ (بيت إليا)، جا عیسى لەوێ مایەوە تا خوای گەورە پەیامی خۆی بۆ نارد و ئینجیلی بۆ ناردە خوارەوەو ئاشنای تەوراتی کرد و، چەند موعجیزەیەکی ریزپەڕی وای پێدا کە هەرکەس بیبینیایە شاهێدی دەدا کە جگە لە الله خوایەکی دیکە نیە و عیساش(عليه السلام) پێغەمبەری خوایە.

بە گەیشتنی عیسا بەو ئاستەی رێز و پایەداری لە کاتێکدا کە بووبووە پێغەمبەرێکی نێردراو، بەوە پەیامی مەریەمی کچی عیمران کۆتایی دێت و ئەو مژدەیەی فریشتەکان پێیان دابوو هاتە دی و بەراستیش نمونەیەکی زیندووی بڕوادارانی کڕنۆش بەر و، بۆ خوا راوەستاو و ئارامگر بوو، کە تێکڕای ژیانیان بۆ خوای گەورە بووە و، پەروەردگاریش باشەی هێناونەتە ڕێ و، بە تەواوەتی پەیامەکەی بۆ جێگیرکردووە.

دواتریش پەیامی ئیسلام لە سەردەستی پێغەمبەری خوا عیسا(عليه السلام) دەرکەوت وەك تەواوکاری ئەوەی کە موسا پێشتر هێنابووی، هەتا خوای گەورە (محمد)یشی(ﷺ) نارد وەك دوایەمین پێغەمبەر و تا ئەوەی عیسا هێنابووی تەواوی بکات و ئاین هەمووی بۆ خوا بێت.[1]

---

[1] البداية والنهاية لأبن كثير، تفسير ابن كثير، تأريخ الأمم والملوك للطبري، تأريخ الطبري.

# خەدیجەی کچی خوەیلید

## دایکی بڕواداران

لە خانەوادەیەکی سەربەرز و پایەدار هاتۆتە دونیاوە و، لەسەر ئاکاری جوان و پەسەند پەروەردە بووە و، بە خۆڕاگری و ژیریی و پاکی ناسرابوو بە رادەیەك هۆزەکەی بە بێگەرد بانگیان دەکرد، خەدیجە بازرگانێکی خاوەن سامان بوو، پیاوانی بەکرێ دەگرت تا بازرگانی بە سامانەکەیەوە بکەن پارەی پێدەدان بەوەش کاروانەکانی لە ریزی کاروانی قورەیشیەکاندا بوو، لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بە رادەیەکی زۆر راستگۆیی و سپاردەپارێزی و ئاکارپەسەندیی پێگەیشتبوو.

ئەبوتالیب بە موحەممەدی برازای وت: من پیاوێکی بێسامانم و زەمانەش زۆری بۆ هێناوم و ساڵانێکی نەهاتی زۆری بەسەردا هێناوین کە هیچ پارە و بازرگانیم نەبێ، ئەوەتا خەدیجە لەنێو پیاوانی هۆزەکەدا بەدوای پیاوێکدا دەنێرێت تا بە پارەکەیەوە بازرگانی بکەن و، سوود و قازانجیان دەست بکەوێت، خۆ گەر بچیتە لای ئەوا فەزڵی تۆ دەدا بەسەر ئەواندا چونکە دەزانێ چەندە پاك و بێخەوشی.

خەدیجـــە نـــاردی بەشـــوێن موحەممـــەد داﷺ و، داوای لێکـــرد کـــە بـــە سامانەکەیەوە بۆ بازرگانی کردن بچێت بۆ شام و لەنێو ئەوانەدا بازرگانی بۆ دەکەن باشترین پشکی بداتێ لەگەڵ خزمەتکارێکیدا کە ناوی (مەیسەرە) بوو، پێغەمبەری خوداشﷺ رازی بوو، بە سامانەکەیەوە و لەگەڵ مەیسەرەدا کەوتە رێ هەتا گەیشتە شام و ئەو شمەکانەی پێی بوو فرۆشتی و ئەوەی دەیویست کڕی، پاشان لە تەك مەیسەرەدا کاروانەکەی رێگای گەڕانەوەی بەرەو مەککە گرتە بەر، لەمەشدا بازرگانیەکەی چەندقاتی جاران قازانجی کرد، ئەویشی ئەو بڕە قازانجەی بۆ پێغەمبەری خودایﷺ دیاری کردبوو چەند قات زیاد کرد.

کاتێ مەیسەرەی خزمەتکاری ئەوەی دیبووی لە ئاکاری جوانی پێغەمبەرﷺ گێڕایەوە بۆی، ناردی بە شوێنیا و پێی وت: ئامۆزا، من لەبەر خزمایەتی و سپاردەپارێزی و ئاکار پەسەندی و راستبێژی تۆم هەڵبژارد، پاشان داخوازی خۆی پێ راگەیاند، پێغەمبەری خوداشﷺ ئەوەی بۆ مامەی گێڕایەوە و، ئەمجا حەمزەی کوڕی عبدالمطلب لەگەڵیدا بەرەو لای خوەیلیدی کوڕی ئەسەد چوو خوازبێنی کرد بۆی و، وتی: ئەو (واتە پێغەمبەر) کەڵێکە کە لوتی ناشکێنرێت.[١] پێغەمبەری خواﷺ خەدیجەی لە تەمەنی چلساڵیدا خواست و، ئەوەش یەکەمین هاوسەری پێغەمبەری خواﷺ بوو و، قاسم و عبدالله و زەینەب و روقیە و ئوم کەلسوم و فاتیمەی لێ بوو.

پازدە ساڵ بەسەر ئەم هاوسەرگیریە ئاسودەیەیدا تێپەڕی و موحەممەدﷺ تەمەنی گەیشتە چل ساڵ و، پێگەیشت و، بێزاریەکەی لە کۆمەڵگەی نەفامی و تاریکی زیاتر بوو، زیاتر ئارەزووی گۆشەگیری و تەنهایی و بیرکردنەوە لە مەلەکوتەکانی ئاسمانەکان و زەوی دەکرد و، بۆ ئەمەش لە ئەشکەوتی حەڕادا جێگا و شوێنی حەوانەوەی دەروونی دەستکەوت و لە خەدیجەی هاودەم و

---

[١] ئەو دەستەواژەیە لەنێو عەرەبدا بۆ زۆر بەڕێزی بەکاردەهێنرێت.

هاوژینیشیدا ئەوەی بینی کە هاوکاریەتی لە خەڵوەتگیری و چوونە نێو ئەشکەوت بۆ بیرکردنەوە و پەرستش و، بەدەستهێنانی رێنمایی و رۆشنایی لە پەروەردگاری..

ئەمجا ئەو نیگایەی کە بۆ موسا و عیسا دابەزیبوو بۆ ئەمیش هات و دەستپێکی نیگای خودای بۆ هێنا:

﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ﴾سورة/العلق.

یەکەمین راستیەکانی خودا دەستیکرد بە دەرکەوتن بۆ پێغەمبەری هەڵبژێردراو تا رێنوێنی مرۆڤایەتی بکات و لەسەر لێشێواوی و گومڕایی دەربازیان بکات.. بەڵام موحەممەد، لەبەر نارەحەتی هەڵوێستەکە و بەرزی ساتەکە و، جوانی وانەی یەکەم کە جوبریل پاش سێجار راوەشاندن پێی دا، بە لەرزین و موچڕکەوە گەڕایەوە ماڵەوە و، چوویەوە لای خەدیجەی خێزانی و بە شڵەژاویەوە پێی فەرموو: دامپۆشن.. دامپۆشن.

خەدیجەی هاوسەری بەسۆزی بەدڵنەرمیی وچاکەی گەرمی داپۆشی، هەستی بە فێنکی و حەوانەوە کرد و، سەرسامیەکەی هێور بوویەوە، ئەمجا لێی پرسی چی بەسەر هاتووە؟ بە خەدیجەی فەرموو و هەواڵی بەسەرهاتەکەی پێدا: زۆر لە خۆم دەترسام، ئەویش دڵخۆشی دایەوە و دڵنیایی کرد: ئەی ئامۆزا.. سوێند بەخوا، خوای گەورە هەرگیز سەرشۆڕت ناکات چونکە تۆ پەیوەندی خزمایەتی بەجێ دێنێت و، راستبێژێت و، هەژار بەخێودەکەیت و، رێز لە میوان دەگریت و، هاوکار و سەرخەری کاروباری حەق و راستیت..

پاشان بردی بۆ لای (وەرەقەی کوڕی نەوفلی کوڕی ئەسەد)ی ئامۆزای خەدیجە، کە پیاوێك بوو لە سەردەمی نەفامیدا بووبوە مەسیحی و، شارەزای زانیاری کتێبەکانی مەسیحی بوو لە بارەی هەواڵ و پێشبینیەکان، جا چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە و( وەرەقە) گوێی لێ راگرت، گوێشی بۆ

موحەممەدیش راگرت تا خۆی چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە، وەرەقە پێی وت: ئەو نیگایەیە کە بۆ موسا و عیسا پێشتر دابەزیوە، خۆزیا زیندوو بوومایە کاتێك کە هۆزەکەت دەرت دەکەن، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: ئایا ئەوان دەرم دەکەن؟ وتی: بەڵێ، خۆ گەر تا ئە رۆژە بمێنم بە شێوەیەکی بێ پایان پشتیوانیت دەکەم..

نیگای مەزن جارێکی دیکە هاتەوە بۆ لای مەحەممەدﷺ تاوەکو ئەرکی راپەڕاندنی پەیامی خودای بۆ خەڵکی بخاتە ئەستۆ، پەیامی بڕواهێنان بەخودای بێهاوەڵ و، پەرستشی تەنها ئەو و، وازهێنان لەو شتە پڕوپوچ و درۆ بت و دەستکردانە بهێنن.

مەحەممەد گوێ رادەگرێت و، دڵی دەهەژێت و، عارەق بە جەستەیدا دێتە خوارێ لە کاتێکدا کە جوبریل قسەکانی پەروەردگاری پێ دەگەیەنێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ﴿٥﴾ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ: ئەی ئەوەی خۆی داپۆشیوە، راپەڕە و خەڵك ئاگادار بکەوە، گەورەیی پەروەردگارت رابگەیەنە، بەرگیشت خاوێن بکەرەوە، لە خراپە بەدوور بە، منەت مەکە و بەخشین بەزۆر مەزانە، بۆ پەروەردگارت ئارام بگرە.﴾المدثر/١-٧.

خەدیجەش بەردەوام هاوسەرێکی نمونەیی و چاودێری موحەممەدی دەکرد لە هەموو ئەو رووداوانەی بەرەو رووی دەبوویەوە و، ئەو ئەرکانەی پێی دەسپێردرێ، نەرم و نیان و سەبوری بەخش و هاوکاری بوو بەر لەوەی کە ببێتە پێغەمبەر، دواتریش کە بوویە پێغەمبەر بڕوای پێ هێنا و بەراستی زانی و پشتیوانی کرد هەتا رۆژێکیان لە وەڵامی عائیشەدا کە وەك خویەکی ئافرەتانە لە کاتێکدا کە پێغەمبەر باسی خەدیجەی وەك هاوسەرێکی ئەمەکدار دەکرد و رێزی لە هاوڕێکانی دەنا غیرە گرتی، عائیشە وتی بە پێغەمبەرﷺ:

((هەر باسی پیرەژنێ لە پیرێژنەکانی قورەیش دەکەیت، لە سەردەمێکدا رۆشت خوای گەورە گۆڕی بە چاکتر بۆت)).. پێغەمبەری خواﷺ تورە بوو، هەتا پەرچەمی پێشەوەی سەری لە تورەییاندا لەرییەوە و بە عائیشەی فەرموو: ((سوێند بەخوا هەرگیز خوا لەو چاکتری پێنەداوم، ئەو لە کاتێکدا بڕوای پێهێنام کە خەڵکی بێباوەڕ بوون و، بە راستی زانیم لە کاتێکدا کە خەڵکی بە درۆیان دەخستمەوە و، سامانی خۆی پێ دەبەخشیم لە کاتێکدا کە خەڵکی بێبەشیان دەکردم لێی و، خوای گەورە لەنێو ئافرەتەکاندا تەنها لەو کوڕی پێ بەخشیم)).

بەمجۆرە خەدیجە ئەو هاوسەرە ئەمەکدارەی پێغەمبەر بوو کە جوبریل عليه السلام سلاوی پەروەردگاری پێگەیاند و، مژدەی خانوویەکی لە دوڕی نێو بەهەشتی پێدا کەدەنگەدەنگ و ناخۆشی تێدا نیە.

خەدیجە.. کە مێردە راستگۆ و دەستپاکەکەی باشترین دروستکراوی خوا و رێزدارترین نێردراوی لەبارەیەوە فەرمویەتی: ((ئەو لە تەك فاتیمەی کچی موحەممەد و، مەریەمی کچی عیمران و، ئاسیای خێزانی فیرعەوندا لە چاکترین و پایەدارترین ئافرەتانی بەهەشتن)).

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا چاکترین و رێزدارترین ئافرەتانی جیهانیان چوارن:... لەگەڵ خەدیجەی کچی خوەیلید)).

لە تەمەنی شەست و پێنجساڵیدا و، سێساڵ بەر لەوەی پێغەمبەر کۆچ بکات لە مەککە دەستەراستی پێغەمبەرﷺ لە بانگەواز و بلاوکردنەوەی ئیسلامدا کۆچی دوایی کرد، کاتێ لە سەرەمەرگدا بوو پێغەمبەرﷺ چویە لای و فەرمووی: ((پێت ناخۆشە ئاوەها دەتبینم لە کاتێکدا کە خودا خێری زۆری خستۆتە ئێش و ئازارەوە))..

لەکاتی بەخاك سپاردنیشیدا پێغەمبەری خواﷺ دابەزیە نێو گۆڕەکەی و بەدەستی خۆی خستیە نێو گۆڕەکەی، بەراستی کۆچکردنی کارەساتێکی مەزن

بوو کە کارەسات و روداوی ناخۆشی دیکەی بەدوادا هات و پێغەمبەرﷺ بە باسکێکی پۆلایین و ئارامگری لەسەر نارەحەتی و رازی بوون بەوەی لای پەروەردگارە بەرگەی دەگرت.

پێغەمبەرﷺ لە رۆژی وەفاتکردنیدا، هاوسەری ئازیز و خۆشەویستی و، خێزانی نمونەیی و، هاودەمی پشتیوانکار و، هاورێی دڵنەوایکاری بە دەروون و سامانی لەدەستدا.. کە سەراپای ژیاننامەی و تا ئێستاش بۆ هەمو ئافرەتێك؛ قوتابخانە و، پێشەنگ و، نمونەیە..[1]

---

[1] لە کتێبی (نساء فاضلات) عبدالبدیع الصقر، (أکرم النساء) احمد محمد مجال.

# فاتیمەی کچی محمدی کوڕی عبدالله

سەرداری ئافرەتانی جیهانیان و، بەشێك لە باوکی و، کچی سەروەری دروستکراوان، پێغەمبەری خوا ﷺ و، دایکیشی خەدیجەی کچی خوەیلیدی خاوەن بنەچەیەکی دێرین و ئایینێکی فراوانە..

فاتیمە لەسەر توند پەیوەست بوون بە باوکیەوە و، ئیرادە بەهێز لەوەدا کە دەیوست و، لەوەی کە نەیدەویست پێگەیشت، هەر بە فیترەت لەسەر ئاینپەروەری راهاتبوو، هێندەی بەسبوو کە لە باوکی پێغەمبەریەوە بۆی مابویەوە، باوکی لە بارەیەوە دەفەرموێت: ((رەزامەندی فاتیمە لە رەزامەندی منە و توڕەبوونی فاتیمە توڕەبوونی منە، جا ئەوەی فاتیمەی کچمی خۆش ویست ئەوا منی خۆش ویستووە و، ئەو کەسەی فاتیمەی رازی کرد ئەوا منی رازی کردووە و، ئەو کەسەیش فاتیمە توڕە بکات ئەوا منی توڕە کردووە.))[1]

شوکردنیشی بە (عەلی کوڕی ئەبوطالب)ﷺ بە فەرمانی خوای گەورە بوو، هەروەك لە وتاری پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە، پاش ئەوەی سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد فەرمووی: ((خوای گەورە فەرمانی پێکردووم کە فاتیمە بکەم بە هاوسەری عەلی و، منیش ئێوە دەکەم بە شاهید کە ئەوە من فاتیمەم دایە عەلی، لەسەر چوارسەد مسقاڵ زیو، ئەوا بەپێی سوننەتی پەیڕەوکراو و

---

[1] لە صەحیحی موسلیمیشدا بە لێکدانەوەی نەوەوی: فاتیمە بەشێکە لە من و هەر کەس ئازاری بدات ئازاری منی داوە. ج١٦ ل٣.

فەرزی واجب گەر رازی بێت بەمە))، عەلی فەرمووی: رازیم ئەی پیغەمبەری خوا، ئەمەی وت و کڕنووشی سوپاسگوزاری بۆ خوا برد، کاتێ سەری بەرز کردەوە، پێغەمبەری خواﷺ فەرموو: ((بارك الله لكما وعليكما، وأسعد جدكما، وأخرج منكما الكثير الطيب: خوا پیرۆزی بکات لێتان و لەسەرتان و، هەوڵ و کۆششتان ئاسودە بکات و، چاکەی زۆرتان لێ بێنێتە بەرهەم)).[1]

فاتیمە گوێزرایەوە بۆ عەلی... بەراستی گوێزانەوەیەکی پیرۆزی بوو، خوای گەورە هەردووکیانی پێکەوە کۆکردەوە و، پیرۆزی کرد بۆیان و، وەچەکانی چاك کردن و نەوەکانی کردنە کلیلی رەحمەت و بناغەی دانایی و هێمنایەتی ئوممەت..

هەردوو هاوسەر چوونە سایەی ماڵی نوێ بە هەمان شێوازی ژیانی ماڵی باوکی.. ژیانێکی هەژارانە و، خزمەتکردنێك کە هەردوو لاـژن و مێردی هەژار-هاوکاری یەکدی بوون تێیدا و، عەلی هێندە دەستی نەدەڕۆیشت کە بتوانێ کرێی خزمەتکارەکەی بدات، جارێکیان فاتیمە هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ داوای خزمەتکارێکی لێکرد لە دەستکەوتەکانی موسڵمانان لە غەنیمە، پێغەمبەرﷺ گەڕاندیەوە و فێری چەند پاڕانەوەیەکی کرد کە پێی بپاڕێتەوە و پشت بەخوا ببەستێت لە خزمەتکردنی ماڵ و پەروەردەکردنی منداڵ و چاودێری کردنی مێرد، بە شێوازی ئامۆژگاری و رێنوێنی کردنیشەوە پێی فەرموو: ئەی فاتیمە ئارام بگرە.. ((چاکترین ئافرەت ئەوانەن کە سوود بە خاووخێزانیان بگەیەنن)).

... راستت فەرموو ئەی پێغەمبەری خوا...

---

[1] طبقات ابن سعد ج٣، ل١٦

خوای گەورە کچ و کوڕی بەخشیە دایك و باوکە هەژارەکە و... باشترین لاوی بەهەشتیان پێشکەش مرۆڤایەتی کرد کە حەسەن و حوسێن بوو-رەزای خوایان لێ بێ-، هەروەك موحسین و زەینەب و ئوم کەلسومیشیان پێ بەخشرا.

رۆژێکیان پێغەمبەری خواﷺ سەردانی فاتیمەی کرد بینی دەستهاڕ دەکات و کراسێکی لەبەردایە بە مووی حوشتر چنراوە، پێغەمبەر گریا و فەرمووی: ((بنۆشە فاتیمە تاڵی دونیا، تا بەخشش و نیعمەتی دواڕۆژ بەدەست بهێنیت)).

رۆژێکی دیکە هاتە سەردانی لە کاتێکدا نەخۆش بوو، پێی فەرموو: کچم ئێستا چۆنیت؟ وتی: ئازارم زۆرە و، نەبوونی خواردنێکیش تا بیخۆم ئازارەکەی زیاتر کردووم.. جا پێغەمبەری ئازیزﷺ بۆ دیمەنی نەخۆشی و برسیەکەی دەگری و پێی دەفەرموێ: ئایا رازی نابیت کە ببیتە سەرداری ئافرەتانی جیهانیان؟!!

فاتیمە قورئانی پیرۆزی لە دەمی باوکی و ئیمامی عەلی مێردیەوە گوێلێبوو، خۆی پێ پڕ چەك کردبوو، شارەزای حوکمەکانی فەرزەکانی بوو، تێی گەیشتبوو، لە پەروەردەکردنیدا ئەوەی کچێکی رەسەن و خاوەن نەسەب تێی بگات لە سەرووی ئەمەشەوە چاودێری خوایی بۆی زیادی کرد بەوەی کە لەنێو کۆشی پێغەمبەرێکی رێنیشاندەر و باوکێکی بێگوناهدا پەروەردە بوو.

عائیشە-رەزای خوای لێ بێ- راستی فەرمووە لەبارەیەوە کە دەڵێت: ((جگە لە باوکی، کەسی لە فاتیمە چاکترم بەدی نەکردووە)).

لە راستیشدا فاتیمە-رەزای خوای لێ بێت- لە هەموو کەس زیاتر لە باوکی دەچوو، لە رۆیشتن و قسەکردن و وتەکانیدا.. عائشە فەرمویەتی: ((هیچ دروستکراوێکی خوام نەبینیوە لە قسەکردن و دواندا لە پێغەمبەری خوا بچێت وەك فاتیمە)).

فاتیمە ئارامگر و ئاینپەروەر بوو، چاکەمەندێکی بە قەناعەتی سوپاسگوزار بوو، پێغەمبەرﷺ کاتێ بیستی کە باوکی حەسەن بیری لە خواستنی کچی (ئەبو جەهل) کردوەتەوە، تورە بوو، فەرمووی: ((سوێند بەخوا کچی پێغەمبەری خوا و کچی دوژمنی خوا پێکەوە کۆناکرێنەوە، فاتیمە بەشێکی لە من، دڵتەنگ دەبم بەوەی کە ئەو دڵتەنگ بێ پێی و، ئازارم دەدات ئەوەی ئازاری بدات)).[١]

ئەوەبوو ئیمامی عەلی وازی لە خوازبێنیەکەی هێنا لەبەر خاتری فاتیمە و، ژنی بەسەردا نەهێنا تا وەفاتی کرد.

پێغەمبەری خواﷺ هەموو رۆژێك لەکاتی نوێژی بەیانیدا دەهاتە بەر دەرگای عەلی و فاتیمە و دەیفەرموو: ((السلام علیکم أهل البیت)) پاشان بانگی دەکرد: کاتی نوێژە.. نوێژ.. نوێژ... ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا : ئێوە کە خەڵکی ئەمماڵەن، خوا دەیەوێت چەپەڵێتان لەسەر لابا و پاك و خاوێنتان راگرێ.﴾الأحزاب/٣٣.

هەروەها پێغەمبەری خواﷺ کە لە سەفەر بگەڕایەتەوە، یەکەم جار دەچووە مزگەوت و دوو رکات نوێژی دەکرد و دەسوڕایەوە بۆ لای فاتیمە و، پاش ئەوە دەچووەوە بۆ ماڵی خێزانەکانی-دایکانی بڕواداران-.

هەتا رۆژێکیان فاتیمە لەمەڵەکەی خۆیدا و، لەنێو منداڵەکانی خۆیدا بوو، نێردراوێك لای باوکیەوە هات و دەیوت: پێغەمبەری خواﷺ فاتیمەی دەوێت، ئەویش بە پەلە بەرەو لای ماڵی باوکی رۆشت و.. دەبا لێگەڕێین عائیشە-رەزای خوای لێ بێت- بەسەرهاتەکەمان بۆ بگێڕێتەوە.

---

[١] رواه الجماعة وأحمد في مسنده.

عائیشە دەفەرموێت: ((هەموو خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ لەلای بووین و کەسمان بەجێمان نەهێشت، فاتیمە دەرکەوت و هات، هەنگاونانی هیچ جیاوازی نەبوو لە رۆیشتنی پێغەمبەری خواﷺ، کاتێ چاوی پێی کەوت بەخێرهاتنی کرد و پێی فەرموو: بەخێر بێیت کچم، پاشان لەلای راستیەوە یان لە سەرووییەوە دایناا.. ئینجا چپەیەکی بۆ کرد،[1] فاتیمە زۆر گریا، کاتێ پێغەمبەرﷺ دڵتەنگی و پەرۆشیەکەی بینی دووبارە چپەیەکی تری بۆ کرد، ئەمجارەیان پێکەنی..

عائیشە دەفەرموێت: پێم وت: پێغەمبەری خواﷺ لەنێو خێزانەکانیدا تۆی تایبەت کرد بەو چپانە، تۆش دەگریت، کاتێ پێغەمبەری خواﷺ هەستایەوە لێم پرسی: پێغەمبەری خواﷺ چی پێ وتی؟ وتی: من هەرگیز ئەوە نەبووم نهێنی پێغەمبەری خوا بڵاو بکەمەوە.[2]

عائیشە دەڵێت: کاتێ پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی کرد، وتم: بەو حەقەی هەمە بەسەرتەوە هەر دەبێت قسەم بۆ بکەیت کە پێغەمبەرﷺ چی پێ فەرموویت؟

وتی: ئێستا.. باشە.. کە جاری یەکەم چپەی بۆ کردم، هەواڵی دامێ کە جوبریل هەموو ساڵێك یەکجار یان دوو جار دەوری قورئانی پێ دەکردەوە، بەڵام ئەمساڵ دوو جار دەوری پێ کردوەتەوە، من وا دەبینم کە مەرگم نزیك بووبێتەوە، جا تەقوای خوات هەبێت و ئارام بگرە، چونکە باشترین پێشین بۆ تۆ منە.. وتی: جا منیش بەو جۆرە گریام کە بینیت، کاتێ دڵتەنگیەکەمی بینی دووبارە چپەی بۆ کردمەوە و فەرمووی: ئەی فاتیمە، ئایا رازی نابیت کە

---

[1] چپەی بۆ کرد: واتە تایبەتی کرد بە قسەیەك کە بۆ کەسی دیکەی نەگێڕابووەوە.
[2] ئیمام موسلیم گێڕاویەتەوە.

ببیتە سەرداری ئافرەتانی باوەڕداران یان سەرداری ئافرەتانی ئەم ئومەتە؟ وتی: منیش پێکەنیم بەو جۆرەی کە بینیت..[1]

پاشان فاتیمە گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی و، دڵی بەرایی نەدەدا کە باوکی جێی بهێڵێت.. جا ڕۆژان بەسستی گوزەشت و، فاتیمە چووە سەردانی باوکی، بینی کە دان بەخۆدا دەگرێت و ئارام دەگرێت و، وەك کردبویە پیشە بەسەر خێزانەکانیدا دەگەڕا و، مۆڵەتی لە خێزانەکانی خواست کە با لە ماڵی عائیشە لە نەخۆشیەکەیدا بمێنێتەوە.

فاتیمە دڵی نەهات باوکی لەم بارودۆخەدا بەجێ بهێڵێت و لەلای مایەوە، خزمەتی دەکرد و، گرنگی پێدەدا و، دانی بەخۆدا دەگرت و بە دڵسۆزییەکی بڕوادارانەوە لەخوا دەپاڕایەوە کە ئەو حاڵە لەسەر باوکی ئاسان بکات.

باوکی چاوی پێی کەوت و سۆزی جوڵا بۆی و پێی فەرموو: لەم نەخۆشیەمدا گیانم دەکێشرێت، فاتیمە گریا، پاشان هەواڵی پێدا: کە ئەو (واتە فاتیمە) یەکەمین کەسە لە خاو و خێزانی کە پێی دەگاتەوە.

خەریك بوو ئارامی لێ ببڕێت کە ئازار زۆری بۆ پێغەمبەری خواﷺ هێنابوو، بینی پێغەمبەر بەدەستی ئاو هەڵدەگرێت و دەیدات لەسەری خۆی و دەفەرموێت: (وا کرباه: ئای لەم ناخۆشیە)، فاتیمە بە دەنگێکی غەمگینی جەرگبڕی دڵتەزێنەوە وتی: وای لە ناڕەحەتی من بۆ ناڕەحەتیەکەی تۆ باوکە.

پێغەمبەری خوا تەماشای کرد و بە سۆز و بەزەییەوە وەڵامی دایەوە و فەرمووی: لەمڕۆ بەدوا باوکت ناڕەحەتی لەسەر نامێنێت.

کات و ساتی ئەجەلی گەیشتە وادەی خۆی و، موحەممەدﷺ گەیشتەوە بە پەروەردگاری باڵادەستی، لە شوێن و جێگایەکی چاك لای خودای گەورە و بەتوانا.

---

[1] بەشی دووەمی گێڕانەوەکە لە گێڕانەوەی (بخاری و مسلم)ە.

فاتیمە لەناخەوە هەژا و گریا و وتی: بابەگیان بۆ لای جوبریل دەتلاوێنینەوە.. (ئەی بابەگیان.. وەڵامی پەروەردگارت دایەوە کە بانگی کردیت، ئەی بابەگیان بەهەشتی فیردەوس ئارامگاتە).

لەپاش بەخاك سپاردنیشی وتی: ئەی ئەنەس، چۆن دڵتان هات کە خۆڵ بکەن بەسەر پێغەمبەری خوادا..

ئەوەیە (فاتیمەی زەهرا).. پەروەردەکراوی نێو ماڵی پێغەمبەرایەتی، ئەو دایکێکی چاکەکار بوو بە چاکترین پەروەردە پەروەردەی کرد و هاوسەرێکی گوێڕایەڵ و ئارامگریشی بوو.

(ابن عبد الرب) دەڵێت: (لە باوکیەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، حوسێنی کوڕی و عائیشە و ئوم سەلەمە و ئەنەسی کوڕی مالك فەرموودەیان لێوەی گێڕاوەتەوە، جگە لەوانەش ریوایەتەکانی لە شەش کتێبەکەی فەرموودەکاندا هەیە).

نەخۆشیەکەی خاتوو فاتیمە-رەزای خوای لێ بێ- زۆر سەخت بوو، سکاڵای بردە لای (ئەسمای کچی عمیس) لەبارەی نەخۆشی جەستەیەوە و، وتی: دەتوانی بە شتێك بمشاریتەوە، وتی: من لە حەبەشیەکانم بینیوە جێگایەکیان بۆ ئافرەت دەکرد و بە پایەکانی جێگایەکیەوە دەیانبەستەوە، فەرمانی پێکردن وای بۆ بکەن، بەر لە مردنی تابوتێکی بۆ دروست کرا، سەیرێکی کرد، وتی: داتانپۆشیم، خودا داتانپۆشێ.

کەمێك بەر لە وەفاتیشی وتی: ئەی کەنیزەك، ئاوم بۆ خۆشتن بۆ ئامادە بکە.. ئەویش بۆی ئامادەکرد و خۆی شت بە چاکترین شێوە، پاشان وتی: (جلە تازەکانم بۆ بهێنە)، ئەویش بۆی هێنا و لەبەری کرد، پاشان وتی: ئەی

کەنیزەك، من ئێستا گیانم دەکێشرێت و، ئەوا خۆم شت، بۆیە کەس هەڵم نەداتەوە و دەرم نەخات.[١]

فاتیمە رەزای خوای لێ بێ، لە تەمەنی بیست و نۆ ساڵی یان زیاتر، پێنج مانگ یان زیاتر لەدوای پێغەمبەرﷺ کۆچی دوایی کرد.[٢]

بەرەو بەهەشتی جاویدانی ئەی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا و، کیژی رێزدارترین دروستکراوی خوا..[٣]

---

[١] طبقات ابن سعد، ج١ ص٢٧. (کنفأ: واتە داپۆشەر و حیجاب)

[٢] الاستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤ ل١٨٩٩.

[٣] بە پوختەکراوی لەمە پەرتووکانەوە گیراوە: (نساء فاضلات) عبدالبديع صقر، (کرائم النساء) أحمد محمد مجال، (نساء أنزل فيهن قرآنا) د.عبدالرحمن عميرة.

# بەشی دووەم

# دایکانی پێغەمبەران

## سەلامی خوایان لێ بێ

+ ئامینە کچی وەهەب (سەرداری دایکان، دایکی موحەممەدﷺ).
+ هاجەر (دایکی ئیسماعیل).
+ دایکی موسی (هەروەك قورئان ناوی بردووە).
+ مەریەم (دایکی عیسا)—کە پێشتر باسمان کرد-.

# ئامینەی کچی وەهب

## سەرداری دایکان

## دایکی محمد

((من کوڕی ژنێکی قوڕەیشیم کە گۆشتی وشککراوی دەخوارد))[١]

ژیانی منداڵی لە ژینگەیەکی پاک و، شوێنێکی چاک و بەخشندەی نێو خانەوادەیەکی خاوەن بنەچە و، بەرز و پایەداردا دەست پێدەکات کە بەخشندەیی بنەچە و بەرزی ڕەچەڵەکیان مایەی شانازی کۆمەڵگەی مەککە بوو.

لە پێنجەمین باپیری باوکیەوە ڕەچەڵەکی دەگاتەوە بە پێغەمبەری خواﷺ لە باپیری دایکیشیەوە بە شەشەمین پێی دەگاتەوە.

لەم بارەیەوە پێغەمبەری خواﷺ دفەرموێت: ((خوای گەورە دەیگوێزامەوە لە ڕەچەڵەکە چاکەکانەوە بۆ منداڵدانە پاکەکان، بە بێگەردی و پاکخویی، دوو لق لێك نابوونەوە ئیلا من لە باشترەکەیان بووم)).[١]

---

[١] فەرموودەیەکی پیرۆزە (ئیبن ماجە) گێڕایەتیەوە.

کەوابوو ئامینەی کچی وەهەب لە چاکترین ئافرەتانی قورەیش بوو کاتێ کە خوا ویستی بیکات بە هاوسەری عبداللە ی کوڕی عبدالمطلب، تا لە رەچەڵەکە چاکەکەیەوە رووناکی پێغەمبەرایەتی بگوێزرێتەوە بۆ منداڵدانی بێگەردی و، هەموو جیهان رۆشن بکاتەوە.

ئامینە لە منداڵی و کاتی گەورەبوونیشیدا (عبداللە ی کوڕی عبدالمطلب)ی ئامۆزای دەناسی، بەر لەوەی کە سەردەمی منداڵێتی بەسەر بچێت و گەورەبوون جیایان بکاتەوە، چونکە ماڵی (هاشم) نزیکترین خانەوادە بوون لە خانەوادەی (ال زهرە)وە.

کاتێ نیشانەکانی گەورەبوونیشی لێ دەرکەوت (باشترین کچی قورەیش بوو لە رووی پایە و جێگەی کۆمەڵایەتیەوە) لە کاتێکدا کە عبداللە ی کوڕی عبدالمطلب بەرەو لاوێتی و پێگەیشتن دەچوو.

ئەو رۆژەشی عبداللە فیدیەی بۆ دراو لەسەربڕین رزگار کرا-بۆ حیکمەتێك کە پەروەردگاری جیهانیان ئاشنایەتی- گەورەترین فیدیە بوو کە عەرەب بە خۆیەوە بینیبێت کە ئەویش سەد وشتر بوو، (عبدالمطلب)ی باپیری دەستی عبداللە ی کوڕی گرتبوو، بەخێرایی دەیبرد هەتا گەیاندیە ماڵی وەهەبی کوڕی عبدالمناف کوڕی زوهرە، کە لەو ساتەدا لە رووی رەچەڵەك و رێزەوە سەرگەورەی (بەنی زوهرە) بوو، ئەویش ئامینەی کچی لێ مارە کرد.

لەنێو خۆشی و شادی خزم و خوێشدا ئامینە گوێزرایەوە بۆ عبداللە، پاشان میوانەکان بەرەو ماڵەکانی خۆیان بوونەوە و، گەردوون ئارام بووەوە و دونیا هێمن بووەوەو، لە پشتی عبداللە ئەو رۆشناییەی کە پێی بوو هاتە دەر..

---

[1] فەرموودەیەکی پیرۆزە کە (ئیبن عباس)-رەزای خوای لێ بێ- ریوایەتی کردووە. (بڕوانە تراجم سیدات بیت النبوة: د. بن الشاطئ. لا٨٥، ٨٦.

هەتا کە سبەینێ هات، ئامینە لە خەو هەستاو رووی کردە هاوسەرەکەی و لەبارەی خەوبینینەکەیەوە بۆی دوا: لە خەویدا وای بینی بوو کە رووناکیەك لە جەستە جوانەکەیەوە دەردەچوو دونیای لە دەوروبەری رووناك دەکردەوە، هەتا وەك ئەوە وابوو کە لە خاکی شامەوە تەلارەکانی بەسرەی پێ بەدی بکرێت، گوێبیستی دەنگێکیش بوو هاواری لێدەکرد: (تۆ سکت پڕ بووە بە سەرداری ئەم ئوممەتە).[١]

ئامینە ماوەیەکی کەمی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بردە سەر کە نەگەیشتە دوو مانگ، هەتا وادەی گەشتی عبداللە بەرەو شام هات، ئامینە خواحافیزی لێ کرد، ئەو نەیدەزانی کە ئەوە دواماڵئاواییە و چی دی بە دیداری ناگاتەوە، عبداللە ئەو پەیامەی گەیاند کە خوای گەورە لە پێناویدا دروستی کردبوو، لە پێناویشیدا فیدیەی بۆ درابوو، کە ئەویش بریتی بوو لە دانانی ئەو روناکیە لە منداڵدانێکی بێگەرددا، ئەوە بوو لە رێی گەڕانەوەیدا لە شام تووشی نەخۆشیەك بوو، بەهۆیەوە لە کاروانی قورەیشیەکان بەجێما و لای ماڵە خاڵۆانی لە (یەسریب) لایدا، زۆری پێنەچوو بەرەو لای پەروەردگاری گەڕایەوە و، هەر لەوێش لە خاکی (یەسریب) بە خاك سپێردرا.

ئامینەی شاگوڵی قورەیش لە کاتێکدا بێوەژن کەوت کە هێشتا دەست و پێی خەنەی گواستنەوەی بوکێنی پێوە مابوو.

ئامینە زۆر غەمگین بوو، لە کاتێکدا کە ئەو لەو رەوشە ناهەموار و غەمناکەدا بوو، هەستی ژیانێکی نوێ لە قوڵایی ناخیدا چرۆی دەکرد و، روخساری بە رۆشنایی ئیلهامەکەی گەشایەوە، وەك ئەوەی نهێنی ئەو فیدیەدانەی عبداللە، هۆی ئەو مردنە نزیکەی زانیبێت، خوای گەورەش سوکنایی دابەزاندە سەری و، ناخۆشی و نەهامەتیەکانی پێچایەوە، چونکە

---

[١] هەمان سەرچاوەی پێشو ١٦٦:١

یەکەم کەس بوو کە مژدەی رووناکی (محمد المصطفیﷺ) پێدرا کە لەنێو جەستەیدا بوو، لە کاتێکدا کە لە تێکڕای دوورگەی عەرەبدا مژدەی قەشە و پاپاکان شەپۆلی دەدا و، پاکانی قورەیشیش لەبارەی نزیکی وادەی دەرکەوتنی پێغەمبەری ئەم ئوممەتەوە جەختیان دەکرد کە مەککە شوێنی لەدایکبونیەتی و، بانگەشەی خەڵکی دەکات بۆ پەرستنی خوای تاك و تەنیا لەسەر رێبازی ئیبراهیم‌عليه السلامی باوکی.

ئامینە تاك بووەوە لە بارەی ئەو دڵنیاییەی کە هەموو لایەکی تەنی بوو، بە درێژایی ماوەی سکپڕی بەوەی کە کۆرپەکەی پایەیەکی مەزنی دەبێت، ئەوەش دڵخۆشکاریێ بوو پەژارە و خەمەکانی دەڕەواندەوە و، ناخۆشیەکانی یەکەمین سکپڕییان بۆ سانا دەکرد.

هەر کە ئامینە خەریك بوو کاتی سکەکەی تەواو بکات، ئەبرەهەی ستەمکار بە سوپایەکی بەهێزەوە کە عەرەبەکان توانای بەرەنگاربوونەوەیان نەبوو هێرشی هێنایە سەر مەککە، بە مەبەستی روخاندنی کەعبەی پیرۆز، عبدالمطلب وای بە چاکتر زانی کە خەڵکی مەککە بچنە بناری چیا و دۆڵەکان و قسە بەناوبانگەکەی کرد: ((کەعبە پەروەردگارێکی هەیە بیپارێزێ)).

بەڵام ئامینە بەهۆی ئەو نیگایەی لە پەروەردگاریەوە بۆی هاتبوو دڵئارام بوو، دەیزانی کە خوای گەورە ماڵەکەی خۆی دەپارێزێت و دوژمنەکانی لەناو دەبات، وەك رێزێك لە نزیکی کاتی لەدایکبوونی پێغەمبەرەکەی، هەر بۆیە سور بوو لەسەر مانەوە لە پەنای ماڵی خوادا هەتا خوای گەورە ئەو کارەی دایناوە روودەدات، هێشتا لەسەر ئەو بارە بوو قورەیشیەکان مژدەی ئەوەیان بۆ هێنا کە خوای گەورە بەڵای خۆی ناردوە بۆ سەر سوپای خاوەن فیلەکان:

﴿ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ : دەستەدەستە باڵداری نارده سەریان، گزمۆڵەقوڕی وەك بەردیان تێدەگرتن، تا بە دەردی کایەکی خوراوی بردن.﴾الفیل/٣-٥.

پەنجا رۆژ دوای رۆژی فیل، لەکاتی دەمەوبەیانی شەوی دوشەممەی دوازدەی مانگی (ربیع الاول)، ژانی منداڵبوون گرتی، لە کاتێکدا کە لەنێو ماڵەکەی خۆیدا بوو تەنها کەنیزەکەکەی لابوو.. لە ریوایەتێکی دیکەدا.. دایکی عوسمانی کوڕی ئەبو عاصمی سەقەفی لەگەڵدا بووە،[1] هەستی بە شتێ دەکرد کە لە ترس دەچوو، بەڵام هێندەی نەبرد هەستی بە روناکیەك کرد دنیای تەنی، ئەویش خۆی بۆ چرکەساتی یەکلاکردنەوە ئامادەکرد.. هێشتا سپێدەی نەدابوو، ئەو منداڵەکەی بوو بوو وەك هەر مێیینەیەکی دیکە کە منداڵی دەبێت.

دایکی عوسمانی کوڕی ئەبی عاص دەڵێت: ((سەرنجی هەر شتێکی نێو ماڵەکەم دەدا دەدرەوشایەوە، کاتێ سەیری ئەستێرەکانیشم دەکرد لێم نزیك دەبوونەوە، هەتا وام لێهاتبوو بڵێم:[2] دەکەون بە سەرمدا.))

هەر کە مژدەیان دا بە (عبدالمطلب) دەست بەجێ هات و چاوەکانی تێ بڕیبوو و خۆی شۆڕکردەوە بە سەریدا و، کوڕەزاکەی بە نەرم و نیانیەوەخستەسەر باسکەکانی و، چووە نێو کەعبەی پیرۆزە و، سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد و ناوی نا موحەممەد.

لە شەوی لەدایکبوونی پێغەمبەرداﷺ روونـاکی زۆر مەزن دەرکەوتن و، ئاسمانەکانی روونـاك کردەوە و، ئاسمانەکان و زەوی بەهۆی لەدایکبوونیەوە جوڵانەوەی زۆریان بەخۆوە دی و، ئاوی دەریاچەی (سادی) کەم بووەوە و

---

[1] ئافرەتێکی صەحابیەیە: فاتیمە کچی عبداللە-رەزای خوای لێ بێ- (الاستیعاب)ی (ابن عبدالبر) ژمارە ٤٠٥٩.

[2] ابن عبدالبر في ترجمتها (بالاستيعاب في معرفة الأصحاب)

کەنارەکانی وشك بووەوە، لە هەمان کاتدا ئاوی دیجلە بەرز بووەوە، تەختی کیسراش هەژا و زۆر لە تاوەرەکانی کەوتن و ئاگری پیرۆزی (زەردەشت) کوژایەوە کە هەزارەها ساڵ بوو بەبێ وەستان دەگڕا و تێکڕای بتەکانی جیهان لەو شەوەدا لەبەر ڕێز و شکۆمەندی سەرداری دروستکراوان موحەممەدﷺ وازیان هێنا.

سەرداری دایکان و، دایکی کۆرپە بێباوکەکە، بە خۆشەویستی و سۆزی زۆریەوە لەخۆی گرتبوو شیری دەدایە هەتا ئەو کاتەی شیردەرانی بیابان دێن و، (ئوم ئەیمەن)ی یەکەمین پەروەردەکاری لە ئامێزی دەگرێت، پاشان باپیرەی ژنێکی لە هۆزی (بن بەکر) بۆ گرت کە ناوی (حەلیمەی کچی ئەبو ذؤیب) بوو، بە (حەلیمە سەعدیە) ناسرابوو، بەم جۆرە لەنێو جەرگەی بیاباندا مناڵە شیرەخۆرەکە گەشەی کرد و پێ گەیشت..

کاتێ ساتی لەشیر بڕینەوەیشی هات، دایکی بە پەرۆشە لە ئامێزی گرت و، بەخۆیەوە گرت و، لە کاتێکدا کە حەلیمە داوای لێ دەکرد کە دووبارە کوڕەکەی پێ بداتەوە تا بیباتەوە بۆ نێو کەشی بێگەردی پڕ لە تەندروستی بیابان.

بۆ جاری دوەم ئامینە خواحافیزی لە کوڕەکەی کرد و، حەلیمە بە شادی و خۆشیەوە بردیەوە بۆ کیلگەکانی (بەنی سەعد)، چونکە خۆی و هۆزەکەیشی (زۆر سوور بوون لەسەر ئەوەی لە نێویاندا بمێنێتەوە، بەهۆی ئەو فەڕ و ڕێژەنەی بینیبویان لێی).[١]

چەند مانگێکی پێنەچوو حەلیمە هەر لە خۆیەوە هێنایەوە، ئەم خێرا گەڕاندنەوەیەش نهێنیەکی گەورەی لە پشتەوەیە، دەبا لێگەڕێین حەلیمە خۆی

---

[١] سیرة ابن هشام ١٧٣/١.

هۆی گەڕانەوەمیان بۆ بگێڕێتەوە-لەوەی کە لە عبداللە ی کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبوطالب گێڕاویانەتەوە-:

((سوێند بە خوا دوای هاتنەوەمان بە چەند مانگێك لەگەڵ برا شیریەکەیدا لەلای هەندێ بەرخ[1] بوون لە پشت ماڵەکانمانەوە، براکەی بەڕاکردن هاتەوە و بە من و باوکی وت:

ئەوە برا قوڕەیشیەکەمە دوو پیاوی جل سپی گرتیان، رایانکێشا و سکیان شەق کرد، ئەوا ئێستا دەیشڵەقێنن،[2] جا من و باوکی بەرەو لای چووین بینیمان هەستاوەتەوە و رەنگی دەم و چاوی گۆڕاوە، باوەشم پێداکرد و باوکیشی باوەشی پێداکرد و پێمان وت: کوڕم، ئەوە چیتە؟ فەرمووی: دوو پیاو هاتن بۆ لام جلی سپیان لەبەردا بوو، رایانکشاندم و سنگیان لەت کردم و شتێکیان لێ دەرهێنا کە نازانم چی بوو..

ترساین کوڕەکە تووشی شتێ بووبێت، هەر بۆیە هێنامانەوە بۆت، سوێند بەخوا زۆر بە نابەدڵی و ناخۆشبوونەوە هێناومانەتەوە.[3]

هیچ نیشانەیەکی ترس و دڵەڕاوکێ لەسەر ئامینە دەرنەکەوت لە کاتێکدا کە گوێبیستی حەلیمە بوو، پاشان لە حەلیمەی پرسی: ئایا مەترسی شەیتانت هەبوو لەسەری؟ حەلیمە لە وەڵامیدا وتی: بەڵێ، ئامینە وتی: سوێند بەخوا، شەیتان هیچ رێگایەکی نیە بۆی بچێت و کوڕەکەم خاوەن پایەیە، سوێند بەخوا هیچ سکێکم نەبینبوە هێندەی ئەم سکە سوك و سانا بووبێت، کاتێك لە

---

[1] البهم: بەرخ بەبێ دایکەکەی، تاکەکەیشی (البهیمة)

[2] سیره ابن هشام: ١/١٧٤، لەگەڵ (عیون الأثر في فنون المغازي والسیر)١/٣٤.
وسطن اللبن او الدم: واتە ئەگەر هەندێکی بکەیت بە هەندێکی تریدا.

[3] هەردوو سەرچاوەی پێشوو.. (لا علی جدع انفنا: واتە لەسەر ویستی خۆمان نا).

دایکبوو هاتە سەر زەوی دەستەکانی لەسەر زەوی بوون و سەری بۆ ئاسمان بەرز کردبووەوە.

ئامینەی دایك تا ئەوپەڕی چاودێریکردن و بایەخ پێدان گرنگی دەدا بە کوڕەکەی و، چاودێری خوایش بۆی بەرهەمی خۆی دا و، موحەممەد زۆر بە خێرایی نیشانەکانی پێگەیشتنی لێ دەرکەوت، لەکاتێکدا کە تەمەنی شەش ساڵی بوو، ئامینە وای بەباش زانی کە کاتی ئەوە هاتووە خۆی و کوڕەکەی سەردانی (یەسریب) بکەن و سەرێ لە گڵکۆی ئازیزی کۆچکردووی لەوێ بدەن و خاڵوانی باوکی کە نیشتەجێی (یەسریب)ن پێی بناسێنێت.

چەند ڕۆژێك سەرقاڵی ئامادەکردنی وڵاخ و پێداویستی سەفەر بوو و لەگەڵ کوڕەکەی و (بەرەکەی دایکی ئەیمەن)[1]ی کەنیزەکی ئەمەکداریان بۆ یەکەم کاروان بەڕێکەوتن کە لە مەککەوە بەرەو باکوور دەردەچوون و... سەرنجێکی ماڵئاوایی ماڵی بوکێنیەکەی دا، پاشان لای دایەوە بۆ لای کەعبە بە پاڕانەوەوە بە دەوری کەعبەدا سوڕایەوەو، کاروانەکە کەوتە ڕێ، بە هێمنی، لە باوەشی گرتبوو.. هەر کە کاروانەکە گەیشتە (یەسریب)، یەکسەر ئامینە و کوڕەکەی بەرەو ماڵی بەنی عەدی بەنی نەجاڕ خاڵوانی باوکی ڕۆیشتن، پاشان رووی کردە کوڕەکەی و باسی باوکی بۆ دەکرد و ئەو ماڵەی کە تێیدا نەخۆش بووە، ئنجا بردی بۆ سەردانی ئەو گڵکۆیەی کە جەستەی باوکی لەخۆگرتووە.

پاش ئەوەی مانگێکی تەواو لە (یەسریب) مایەوە و مافی تەواوی هاوسەری کۆچکردووی بەجێهێنا، لە سەردانی گۆڕەکەی و ئاشناکردنی مێژووی ژیانی باوکی بە کوڕەکەی.. ئیدی بڕیاری دا کە بگەڕێتەوە بۆ مەککە..

لە کاتێکدا کە لەسەر ڕێی گەڕانەوە بوون ئامینە هەستی بە بێهێزییەکی کتوپڕ کرد، کە سەراپای جەستەی گرتەوە، وەك ئەوەی هەستی بە ئاکامی

---

[1] بڕوانە (طبقات)ی ابن سعد.

هاتووی کردبێت، ئەشکی گەرمی داباریـن و، دەستی کردە ملی کوڕە تاقانەکەی، ئەویش دەستە بەسۆزەکانی درێژکرد هەتا ئەو ئەسرینە پڕ بەهایانەی کە پڕ بوو لە هەستی ئەوین و سۆز بسڕێتەوە، لەناکاو باسکەکانی پێی شل بوونەوە، کە سەرنجیدا بینی تروسکەی چاوەکانی خەریکە بکوژێتەوە، دەنگیشی هێدی هێدی لەوەدایە ببێتە دەنگێکی کزی هێواش کە وشەکانی ماڵئاوایی دەدرکاند، هەتا وای لێهات دەنگەکە بە تەواوی نەما، دوایـن هەناسەیان هەڵمـژی و، کوڕەکەیشی لێی دەپاڕایەوە کە سەیرێکی بکات و قسەیەکی لەگەڵدا بکات، بەڵام ئەو پاش ئەوەی پەیامی خۆی لە دانانی کۆرپە پیرۆزەکەی و پەروەردە کردنی تا تەمەنی شەش ساڵی بەجێ گەیاند، بەرەو لای پەروەردگاری گەڕایەوە.

ئەو تەنها بۆ جێبەجێکردنی ئەم پەیامە دروستکرابوو..

ئای چ پەیامێکە.. سەرداری دروستکراوان و، دوایەمین پێغەمبەری ڕەحمەت و ڕێنیشاندەر و، بەفەڕ و ڕێژنەی بەخشیە جیهانیانﷺ.[1]

---

[1] تراجم سيدات النبوة: د.عائشة عبدالرحمن (بنت الشاطئ) بە پوختەکراوی و کورتکراوەیی.

# هاجەر

## دایکی ئیسماعیل

### سەلامی خوای لێ بێ

هاجەر.. کەنیزەیەکی بێدەستەڵاتی بێتوانا بوو، سارا خاتوونی خێزانی ئیبراهیم‌ﷺ لە میسرەوە هێنای بۆ خاکی کەنعان.

دایکی ئیسماعیل و، داپیرەی موحەممەدﷺ و لەدوای حەوا دایکی موسڵمانانە.

هەڵبژاردنی هاجەر لەلایەن خوای گەورەوە تا ببێتە هاوسەری ئیبراهیم سەرگوزشتەیەکی نەمری هەیە دەمێنێ تا ئاسمانەکان و زەوی هەبن، سەرگوزشتەیەك باس لە خۆشەویستی پاك و بێگەرد و بەدەر لە هەموو خەڵتە و پۆخڵەکانی سەر زەوی دەکات بۆمان.

جبریل‌ﷺ لەلایەن خوای باڵادەستەوە، بانگی ئیبراهیم دەکات تا لەبارەی (هاجەر)ی گەنم ڕەنگی، کڕنووش بەری، خواپەرستی، خۆپارێزی، خۆشەویستی تەقوادارەوە گوێ لە سارا خاتوون بگرێت.

شەیتان ئاوا بوو، دەستی کرد بە رنینەوەی دەم و چاوی و دڵی لەت لەت بوو، چونکە ئاسمان مارەبڕینی هاجەرەی دیاری سارا خاتونی لە ئیبراهیم بڕیار دا.

هاجەرە لەنێو ماڵی پێغەمبەرایەتیدا وەك هاوسەرێکی دڵئارا و خۆشەویست و، خوشکێکی هاودەم و بەسۆز ژیا..

ئیسماعیل لە دایك بوو، ویست و ئیرادەی خودای دانا و زانا وابوو کە کۆرپە شیرەخۆرەکەی ببات بۆ لای ماڵی خوا، تاوەکو خوای گەورە بە هەنگاوە یەکەمینەکانی لەلای یەکەم ماڵ لە مەککەی پیرۆز کە بۆ خەڵکی دانرابێت نەمری بکات.

ئەمجا ئیبراهیم (هاجەر)ە و کوڕەکەی بەجێهێشت، لەو کاتەدا مەککە بیابانێکی چۆڵ بوو، تەنها خورما و ئاوی بۆ جێهێشتن، بیری کردەوە کە کاتی ئەوە هاتووە بگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتبوو، هاجەرە زۆری لێ پاڕایەوە بەڵام بێسود بوو، ئیبراهیم گەڕایەوە و گوێی بۆ هیچ نەگرت و، هەواڵی ئەوەی پێدان کە ئەو فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ دەکات، هاجەرەش بە ملکەچی و رازیبوونەوە وتی: (کەواتە خوای گەورە نامان فەوتێنێ).[1]

لەو ساتەشدا سەری بۆ ئاسمان بەرزکردەوە و لەخوا پاڕایەوە و، وتی:

﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ٣٧ رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُۗ وَمَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ : پەروەردگارا! من لەناو شیوێکی وشك، لە پەنای ماڵی پیرۆزت، یەکێ لە زارۆڵەکانم جێکردەوە. پەروەردگارا! بۆ ئەوە کە نوێژ بکەن، دەسا تۆش کارێ وا بکە خەڵك بە دڵ خۆشی بوێن و لە بژێویش بەشیان بدە، بەڵکو

[1] الروض الأنف لأبي القاسم السهيلي: ١/١٣٥.

شوکری تۆ بکەن.. پەروەردگارا! هەرچی نهێنی و ئاشکرای ئێمە هەبێ، تۆ دەیزانی، هەرچیەك هەیە لە زەوی و لە ئاسمان هیچی لە خودا گوم نابێ..﴾ابراهیم/٣٧-٣٨

پاش ئەوە بەرەو لای سارا خاتوونی خێزانی کە لە خاکی کەنعان بوو گەڕایەوە.

تێشووەکەی هاجەرە کۆتایی هات و، لەسەری پێویست بوو کە بەدوای ئاودا بگەڕێت لەو بیابانە وشکەدا، روانیە (سەفا) کە نزمترین چیایە لەسەر زەوی و چووە سەر، بەو ئومێدەی لە دۆڵەکەدا کەسێ بدۆزێتەوە هاوکاری بکات لە بەدەستهێنانی ئاودا، تا تینوویەتی منداڵە ساواکەی پێ بشکێنێت، بەڵام جگە لە تەنهایی و بێدەنگیەکی ترسناك هیچی دیکەی بەدی نەکرد...

بۆیە بە خێرایی هەنگاوی هەلگرت بەرەو کێوی (مەروە) و چووە سەری تا شوێنەوارێکی ژیان ببینێت و، خەمی دەستکەوتنی ئاوی زۆر زیادی کرد تا تینویەتی کوڕە بچکۆلەکەی پێ بشکێنێ.. کە وەختە دڵی لەت لەت و جەرگی خوێناوی بکات..

راکردنی لەنێوان صەفا و مەروەدا جار لەدوای جار بەردەوام بوو بەدوای ئاودا زۆر ماندووی کرد، هەتا بە تەواوی شەکەت بوو توانای نەما و، کەوتە سەر زەوی و خۆی دایە دەست ویستی خودا سەبارەت بەخۆی و کوڕەکەی..

گەردوون هەناسەکانی خۆی راگرت و، جگە لە هەناسەبڕکێی کۆرپەکە و ناڵەناڵی دایکی کە لەو وشکەلانەدا دەنگی دەدایەوە و لەو چرکەساتەدا هیچ دەنگێکی دیکە نەدەهات، ئەمجا کۆمەڵێك لە (جورهوم) لە رێگای وشکاییەوە بەرەو شام دەچوون، لە خوارووی مەککەوە لایان دا، باڵندەیان بەدی کرد، وتیان: ئەم باڵندانە لە دەوری ئاو دەفڕن، چاوساغەکەیان نارد، گەڕایەوە و بردنی بۆ ئەو شوێنەی کە هاجەرە و کۆرەکەی لێ بوو، لەلای کانیاوە پیرۆزەکە،

پێیان وت: ئەگەر ویستت لەسەر بێ لێرە دەمێنینەوەو هاودەماڵت دەبین و ئاویش موڵکی خۆتە، ئەویش مۆڵەتی پێدان و، لەوێ نیشتەجێ بوون..

ئاوی زەمزەمیش پەروەردگاری جیهانیان و بە بەزەیی بۆ نەمری هاجەر و ئاسودەبوونی خەیاڵی هەڵیقوڵاند و، ئەو دۆڵە وشك و ناخۆشە گۆڕا بۆ دۆڵێکی خۆش و پڕ لە فەڕ و ڕێژەن.

خوای گەورە ڕۆشتنی هاجەریشی لەنێوان صەفا و مەروەدا پیرۆز کرد و، بووە دروشمێك لە دروشمەکانی موسڵمانان، کە لە نێوانیاندا دێن و دەچن، هەر کاتێ بچنە سەر یەکێك لەو کێوانە ڕوو دەکەنە خوای گەورە و دەپاڕێنەوە لە خوا کە خێر و بەزەیی و بەرەکەتی خۆی هەرچۆن ڕژاندی بەسەر هاجەرا بڕژێنێت بەسەریاندا، لە پاش مردن ژیاندیەوە و لەدوای هەژاری دەوڵەمەندی کرد و لە نەوەکانیشی (موحەممەد)ﷺی کردە سەرداری نێردراوان و، خوای گەورە بەرەکەتی بەسەر خۆی و ئیسماعیلی کوڕیشیدا باراند و، کردی بە پێغەمبەر و چاکەکار و بەوەش ڕێزی لێنا کە هاوبەشی باوکی بکات لە بەرزکردنەوەی دیوارەکانی کەعبەدا.

لە پەنای ماڵی خوادا (بیت العتیق) ئیسماعیل گەورە بوو، کاتێ گەیشتە تەمەنی کۆشش و هەوڵدان، باوکی گەڕایەوە بۆ لای و چیرۆکی خەونەکەی بۆ گێڕایەوە، ئیسماعیلیش بە دەم فەرمانی پەروەردگاریەوە ڕۆشت و گوێڕایەڵی بوو، بە باوکی وت: ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێکردوە بەجێی بهێنێت..

ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی ڕوون و ئاشکرایە، لە کاتێکدا کە ئیبراهیم بیری لە سەربڕینی کوڕەکەی دەکردەوە، سەرنجیدا بەرانێکی گەورەی بۆ هات تا لەبری کوڕە ئارامگرەکەی سەری ببڕێت.

قورئانی پیرۆز بە جوانترین شێوە وێنەی ئەو بەسەرهاتەمان بۆ دەکێشێ و دەفەرموێت:

﴿ فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ (١٠١) فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَىٰ فِي الْمَنَامِ أَنِّي
أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ (١٠٢)
فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ (١٠٣) وَنَادَيْنَاهُ أَن يَا إِبْرَاهِيمُ (١٠٤) قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي
الْمُحْسِنِينَ (١٠٥) إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ (١٠٦) وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ (١٠٧) وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي
الْآخِرِينَ (١٠٨) سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ (١٠٩) كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ: ئەوسا ئێمە بە لاوێکی لەسەر خۆ مژدەمان پێدا.. کاتێ گەیشتە تەمەنێك کە لەگەڵ ئەو کۆشش بکا، گوتی: ئەی کوڕی خۆم! من لە خەونمدا وام دیوە تۆ سەردەبڕم، خۆت چۆنی لێك دەدەیەوە؟ گوتی: بابە! هەر شتێ پێت سپێراوە بەجێی بێنە، خوا حەز بکا، دەمبینی لە ئارام گران دەبم.. وەختێ هەردوو بڕیاری خوایان سەلماند و ناوچەوانی خستە سەر زەوی.. بانگمان کرد: ئەی ئیبراهیم! ئەوا خەونەکەت بەدیهێنا، ئێمە ئاوا پاداشتی کارچاکان دەدەین.. دیارە ئەمە ئەزموونێکی ئاشکرا بوو.. ئێمە ئەومان بە قوربانیەکی هەرەگەورە کڕیەوە.. لەناو گەلان و نەوەکانی دیکەشدا ناویمان هێشتەوە، سڵاو لەسەر ئیبراهیم بێ.. ئێمە ئاوا پاداشتی کارچاکان دەدەین.﴾الصافات/١٠١-١١٠.

خوای گەورە فەرمان بە ئیبراهیم دەکات کە داوای حەجکردن لەخەڵك بکات و، خوای گەورەیش پاڕانەوەکەی گیرا کرد و لە نەوەکانی وەچەیەکی وای خستەوە کە ئایەتەکانی خوای گەورەیان بەسەردا بخوێنێتەوە و فێری کتاب و دانایی و پاککردنەوەی دەروونیان بکات، لەنێو نەوەکانیاندا پێغەمبەرە هەڵبژاردەکەیﷺ نارد، کە پشت بە پشت بە تەواوەتی لە نەوەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم بوو لە خاتوو هاجەرەی دایکی عەرەبی عەدنانی، کە بەهۆی هەوڵ و پەرۆشی دایکێتیەوە چووە نێو مێژووی ئاینی.

ئەوە سوێند بەخوا تۆوی نێو گوڵەگەنمی خێرە بۆ هەموو مرۆڤایەتی و، خوای گەورە دایناوە بۆ ئیبراهیم و هاجەرە و ئیسماعیلی کوڕیان و، ویستی خوا وابوو کە هاجەرە ئەم تۆوی گوڵەگەنمەی هەبێت و، کارە گرنگەکەیشی بەرزترین چالاکی بوو، چونکە بە تەنها روبەڕووی مانەوە بوو لە دۆڵێکی بێ سەوزایی و وشکدا لە تەك ئیسماعیلی کوڕیدا و بەسەر هەموو هەستێکی هەڵچووی دایکایەتیدا سەرکەوت و، بە چاکترین شێوە پشتی بە پەروەردگاری بەست و، بڕواداڕێکی خاوەن قوڵترین ئیمان بوو کە خوای بەخشندە و میهرەبان دەست بەرداری نابێت، هەر بۆیە رووی تێکرد و پاڕایەوە، خوای گەورەش پاڕانەوەکەی گیراکرد و خەڵکی لە دەوری خۆی و کوڕەکەی کۆکردەوە، تا دۆڵەکە ئاوەدان بکاتەوە و ماڵی خوا دروست بکەن و هەستی موسڵمانان لە هەموو سەر زەویدا لە دەوری ئەو ماڵە یەکبخرێت.[١]

---

[١] تراجم سیدات بیت النبوة، د. عائشة عبدالرحمن (بنت الشاطئ) بە پوختەیی و کورتکراوەیی.

# دایکی موسا

فیرعەونی (موسا) گەلەکەی کردبووە کۆیلە و، ترساندبوونی و، بە خراپترین شێوە ئەشکەنجەی دەدان، جارێکیان بە ترسەوە لە خەو راپەڕی و، کاهین و جادوگەر و ئەستێرەناسەکانی بانگ کرد و، لەبارەی لێکدانەوەی ئەو خەونەی بینیبووی پرسیاری لێکردن.. پاش ئەوەی بەسەرهاتی خەونەکەی بۆ گێڕانەوە پێیان راگەیاند: لە نێو بەنی ئیسرائیلدا کوڕێك لەدایك دەبێت پادشایەتیت لەدەست دەستێنێت و زاڵ دەبێت بەسەر دەستەڵاتدا و خۆت و گەلەکەت لە خاکەکەت دەردەکات و، ئاینەکەت دەگۆڕێت و کاتی لەدایکبوونی واهاتووە.[1]

ترسەکەی زیادی کرد و زۆرتر توڕە بوو و، فەرمانی دا بە کوشتنی هەموو منداڵێکی بەنی ئیسرائیلی کە تازە لەدایك دەبێت و ... سەربازەکانیشی بۆ ئەم کارە ئامادە کرد.

لەو کاتەدا (موسا) بە پەنهانی لەدایکبوو، دایکی لە ترساندا دەلەرزی و مامانەکەیشی سکی پێی سوتا و بەڵێنی ئەوەی پێدا کە کارەکەی ئاشکرا نەکات، سەربازەکانی فیرعەون لە کاتێکدا بینیان مامانەکە لە ماڵی موسا هاتە دەرەوە، چوونە نێو ماڵەکەیانەوە، ئەگەر ویستی خوا وا نەبوایە کە ئەو بیرۆکەیە بخاتە دڵی دایکی موساوە کە ساواکەی لە پاڵتۆیەکدا بپێچێتەوە و بیخاتە ناو تەنوورەوە، ئەوا کارەکە لەوەدابوو کە ئاشکرا ببێت، بەڵام خوای گەورە

---

[1] (قصص النبيين)ی (ثعلبي) لا ١٧٣-١٧٤.

سەلامەتی کرد...

دواتر دەرکەوت کە شاردنەوەی ساواکە لە تواناادا نیە و تا ماوەیەك سەر دەگرێت، لەم کاتەدا کە دایکەکە نەیدەزانی چی لەو پارچە جەرگەی بکات، خوا نیگای بۆ کرد:

﴿ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ: کە بیخەرە داربەستەوە و بیهاوێژەرە ناو زێوە؛ با زێش بیخاتە کەنارێ و دژێکی من و دژێکی ئەو بیگرێتەوە.﴾طه/٣٩.

چۆن دایك کۆرپەکەی دەخاتە روبارەوە و شەپۆلەکانی بەرەو شوێنێکی نادیاری ببەن!! بەڵام ئەوە نیگای ئاسمانە.. دایکە خەمبار و شێواوەکەی بەدەم داواکەیەوە رۆیشت و تابوتێکی هێنا و لۆکەی کردە ناویەوە و، پاشان شیری دا بە ساواکەی و لەنێو تابوتەکەدا پاڵی خست و، بە چاکی پێچایەوە و توند سەرەکەی داپۆشی و خستیە نیلەوە..

ئەمجا دایکەکە راوەستا و توانای هیچ شتێکی نەبوو، دڵی هەر لە دوای ئەوە بوو کە رۆیشت، هەتا لێی دیار نەما و کچەکەی هات بە شوێنیدا تا لەوێ بە نەرم و نیانیەوە بەرەو ماڵەوەی بباتەوە.

خوای گەورە سوکنایی بۆ نارد:

﴿ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا إِن كَادَتْ لَتُبْدِى بِهِۦ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ : ئەوسا دایکی موسا هیچ هۆشی لە دڵدا نەما و لەوانە بوو کە ئەو رازە بدرکێنێ، بەڵام ئێمە دڵی ئەومان پتەو کرد تا لە خاوەن باوەڕان بێ.﴾القصص/١٠.

تابوتەکە رۆشت تا گەیشتە کۆشکی فیرعەون، کەس و کاری فیرعەون هەڵیان گرتەوە و ساواکەیان بردە لای (ئاسیە)ی خێزانی فیرعەون و، خوای گەورە دڵی پڕ کرد لە خۆشەویستیەکی زۆر بەرانبەر ئەو منداڵە، ئەویش

داوای لە فیرعەون کرد کە نەیکوژێت، بەڵکو سودی لێ وەربگرن یان بیکەنە کوڕی خۆیان.

وەڵامی فیرعەونیش بۆ هاوسەرەکەی ئەوەبوو: دڵئارامیە بۆ تۆ، بەڵام من هیچ پێویستم پێی نیە.

دایکی موساش بە خوشکەکەی موسای وت: راکە و شوێنی بکەوە، ئەمجا مەریەمی خوشکی کەوتە دوای شوێنەواری براکەی، بە کەناری روبارەکەدا رۆیشت هەتا لە کۆشکی فیرعەون نزیک بووەوە و بینی کەنیزەکەکان بەدوای ئافرەتێکی شیردەردا دەگەڕێن تا منداڵەکەی ناو کۆشك شیر پێ بدات، ئا لەوێدا مەریەم چووە نێو کۆشکەکەوە و پێی وتن:

﴿هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ : ئایا دەتانەوێ ماڵێکتان بۆ بدۆزمەوە کە بۆتانی بەخێو بکا و ئامۆژگاریشی بن.﴾القصص/١٢.

لە کاتێکدا کە دایکی موسا بە تەنها لە نێو خەمەکانیدا دەتلایەوە و، مێشکی بەتاڵ بوو لە خۆشترین هەواڵی لەناکاو کە بێت بەدڵی هەر دایکێکدا..

خوای گەورە (موسا) دەگێڕێتەوە بۆ لای دایکی پاش ئەوەی کە مەمکی هیچ شیردەرێکی نەگرت و، خوای گەورە راستی فەرموو:

﴿فَرَجَعْنَاكَ إِلَىٰ أُمِّكَ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ : بەم جۆرە تۆمان هێنایەوە لای دایکت، تا چاوی پێت روون بێتەوە و خەم نەخوا.﴾طه/٤٠.

ئەویش شیری بە کوڕەکەی دا تا تێری خوارد و، دایکیشی لە نووساندنی بە سنگیەوە بەوپەڕی سۆز و خۆشەویستیەوە تێر بوو، سۆزی تینوو و شادی دایکایەتی شاردەوە تا هۆزەکەی لێی نەکەونە گومانەوە..

(ثعلبي) دەڵێت: دایکی موسا ئەو پەیمانەی خوای هاتەوە یاد و، خۆی لەسەر خێزانەکەی فیرعەون گران کرد، کاتێ داوای لێکرد کە لە کۆشکدا بمێنێتەوە بۆ دایەنی منداڵەکە، خێزانی فیرعەونیش هیچ چارەیەکی تری نەبوو بەرانبەر

وەڵامدانەوەی داوای دایەنەکە بەهۆی سووربوونی لەسەر ژیانی منداڵەکە، هەر بۆیە مۆڵەتی پێدا کە بیباتەوە بۆماڵەوە.

خوای باڵادەست لەو بارەیەوە دەفەرموێت:

﴿فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ : گەڕاندمانەوە لای دایکی، تا چاوی پێ ڕوون بێتەوە و خەمی نەخوا، تا بشزانێ کە بەڵێنی خودا ڕاستە، بەڵام زۆربەیان نازانن. وەختێ گەیشتە تافی جوانی و پیاوێ تەواوی لێ دەرچوو، زانست و کارزانیمان پێدا، ئێمە ئاوا پاداشتی کارچاکان دەدەین﴾القصص/١٣.

بەم شێوەیە نیگا بۆ دایکی موسا دابەزی و، ئاسمان کارێکی پایەداری پێ سپارد، کاری دەربازکردنی ئەو ساوایەی کە پەیمانی پێدراوە یەکێك لە پەیامە گەورەکان بگەیەنێت، دەربازی بکات لەو سەربڕینەی کە هیچ کوڕێکی (بەنی ئیسرائیل)ی لەو سەردەمە کۆنەدا لێ دەرنەچوو.[1]

---

[1] (تراجم سيدات بيت النبوة) د.عائشه عبدالرحمن (بە پوختەیی و دەستکاریەوە).

## بەشی سێیەم

# هاوسەرانی پێغەمبەر
# دایکانی بڕواداران

رەزای خوایان لێ بێت

+ خەدیجەی کچی خوەیلید.
+ سەودەی کچی زەمعە.
+ عائیشەی کچی ئەبوبەکری صدیق.
+ حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەتاب.
+ زەینەبی کچی خوزەیمە.
+ ئوم سەلەمە (کچی زاد الرکب)
+ زەینەبی کچی جەحش.
+ جوەیرەی کچی حارس.
+ صەفیەی کچی حویەی.
+ رەملەی کچی ئەبو سوفیان (ئوم حەبیبە).
+ ماریەی قیبتی.
+ مەیمونەی کچی حارس.

# خەدیجەی کچی خوەیلید [١]

## دایکی بڕواداران

---

# سەودەی کچی زەمعە

## کۆمکردوی بێوەژنی کۆمکردو

(سەودەی کچی زەمعەی کوڕی قەیسی کوڕی عبدالشمسی قوڕەیشی) یەکەمین ئافرەتە کە پێغەمبەری خواﷺ لەپاش وەفاتی خاتوو خەدیجە خواستی، مێردی پێشتری کە ئامۆزای بوو لەپاش گەڕانەوەی لە کۆچکردنی دووەمی حەبەشە مردبوو، بەم شێوەیە سەودە سەرپەرشتی ماڵی پێغەمبەرﷺی دەکرد هەتا عائیشە هات، (سەودە) بواری بۆ ڕەخساند و جێگەی یەکەمی لە ماڵەکەدا پێدا و زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی جێگای ڕەزامەندی ئەو بێت و شەونخونی بکێشێ لە پێناوی حەوانەوەیدا.

---

[١] پێشتر لە بەشی چاکترین ئافرەتانی جیهانیاندا باسکرا.

کاتێ چووە ساڵەوە و ئاشنای پایەی (عائیشە) بوو لای پێغەمبەری خوا، لە کۆتاییدا پێغەمبەرﷺ وای بەباش زانی کە وازی لێ بهێنێت بە رێکوپێکی هەتا لەو رەوشە دەربازی بکات کە هەستی دەکرد نارەحەتی دەکات، پێغەمبەر بە نەرم و نیانیەوە پێی راگەیاند کە دەیەوێت تەلاقی بدات، سەودە بە پێغەمبەری خواﷺی وت: رامگرە.. سوێند بەخوا هیچ لەسەر مێرد و هاوسەری سوور نیم، بەلام پێم خۆشە کە خوای گەورە وەك خێزانی تۆ زیندووم بکاتەوە.. بمهێڵەرەوە ئەی پێغەمبەری خوا و شەوەکەی خۆم دەدەم بە عائیشە و ئەوەی ژنان دەیانەوێت من نامەوێت.

پێغەمبەری خواﷺ ئەم هەڵوێستە پڕ لێبوردەییە بەڕێزە کاری تێکرد و، سەودە دێت تا وشەی تەلاقدانی-کە لەو وشەیە بێزراوتر نیە- گوێ لێبێ لە بەرانبەردا ئەو لەخۆبردنە جوان و بێگەردە وەڵامی بوو، رەزامەندی مێردە پاکەکەی دەویست، پێغەمبەری خواشﷺ هێشتیەوە هەتا مردنی.

لەسەر (سەودە) ئایەتی حیجاب دابەزی، چونکە خێزانەکانی پێغەمبەر بە شەودا بۆ چوونە سەر ئاو رۆشتنە دەرەوە، عومەری کوڕی خەتاب بە پێغەمبەری دەوت کە خێزانەکانت داپۆشە، بەلام پێغەمبەری خوا وای نەکرد، شەوێکیان سەودە کە ئافرەتێکی بالابەرز بوو چووە دەرەوە، عومەر لەوکاتەدا بانگی لێکرد دەتناسین ئەی سەودە، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە ئایەتی حیجاب دابەزێنێت، خوای گەورەش ئایەتی بالاپۆشی (حیجاب)ی دابەزاند.

سەودە لە ئافرەتە هەرە چاکەکانی سەردەمی خۆی بوو، خاوەن ئاکارێکی پەسەند و جوان بوو، عائیشەی دایکی بڕواداران لە بارەیەوە فەرموویەتی: لەنێو خەڵکیدا هیچ کەس نیە وەك سەودەی کچی زەمعە کە حەز بکەم لەسەر رێچکە و ئاکاری بم.

سەودە پێنج فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوەﷺ گێڕاوەتەوە و ئیبن عەباس و یەحیای کوڕی عبدالله کوڕی عبدالرحمن کوڕی سەعد کوڕی زرارەی ئەنصاری لێیانەوە ریوایەت کردووە و هەروەها (ابو داود و نسائی)یش ریوایەتیان لێوە کردووە.

لەساڵی ٥٤ی کۆچیدا سەودە-رەزای خوای لێ بێ- وەفاتی کرد.. کاتێ وەفاتی کرد، (ئیبن عەباس) کڕنووشی برد، لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵ کرا، وتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: کاتێ ئایەتێکی خوای گەورەتان بینی کڕنووش ببەن.. جا چ ئایەتێك گەورەترە لە کۆچکردنی هاوسەرانی پێغەمبەرﷺ.[1]

---

[1] لە کتێبی (نساء فاضلات)ی عبدالبدیع صقر.
و(تراجم سیدات بیت النبوة)ی (بنت الشاطئ) بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە وەرگیراوە.

# عائیشەی کچی ئەبوبەکر

## مامۆستای یەکەم

عائیشە لەنێو رووداوەکانی سەرەتای بانگەوازدا لەگەڵ ئەبوبەکری صدیقی باوکیدا ژیا و پێگەیشت، هەر بۆیە سەرەڕای کەمی تەمەنی لە هەڵس و کەوت و دڵرەشی و تاریکبینی ئەوانە تێگەیشت کە باوەڕ بە خودای تاك و بێهاوەڵ ناهێنن..

ئەو ئاڵا هەڵگری زانست و زانیاری بوو، ئاشنای رووداوەکانی سەردەمەکەی بوو کە تێیدا گوزەرا و، پسپۆڕ بوو لە کاروباری ماڵەکەی و بەجێهێنانی ئەو ئەرکەی کە پێویستە پێی هەستێت، لەماڵی باوکیدا گەورە بوو کە زاناترین کەس بوو لە بارەی رەچەڵەکی عەرەبەوە و لە قوتابخانەی پێغەمبەردا کاروبارەکانی ئاینەکەی و بنەماکانی ئیسلام فێر بوو، بنەمای ئەدەب و خووڕەوشتیشی لەو زاتەوە ئاشنا بوو کە پەروەردگاری بە جوانترین شێوە پەروەردەی کردبوو، ژیانیشی لە ماڵی پێغەمبەرایەتیدا بوو کە نیگای تێدا دادەبەزی و قورئانی بە شەو و رۆژ تێدا دەخوێندرا، لەبەر ئەمە عائیشە-رەزای خوای لێبێ- شارەزاییەکی باشی هەبوو لە بارەی فیقهی ئیسلام و بنەماکانیەوە و، رۆچوو بوو لە هەموو جۆر و بەشەکانی زانیندا..

(زوهـری) دەڵێـت: (گـەر زانینـی عائیـشە بێـنین و هـی هـەموو دایکـانی بـاوەڕداران و زانینـی تێکـڕای ئافرەتـانیش کۆبکەینـەوە، ئـەوا زانینـی عائیـشە چاکترە).

(أبـو الـضحی)ش لـە (مـسروق)ەوە گێڕاویەتیـەوە: هاوەڵـە بـە تەمەنـەکانی پێغەمبەری خواﷺم بینی، لەبارەی فەرزەکانەوە پرسیاریان لە عائیشە دەکرد.

(عطاء کوڕی رباح)یش دەڵێت؟ عائیـشە شـارەزاترین و زانـاترین و چاکترین کەس بوو لە راوبۆچوندا بە گشتی..

(هشامی کوڕی عروە)ش لە باوکیەوە گێڕاویەتیـەوە: لـە فیقـھ و پزیـشکی و شیعردا کەسم نەدیوە لە عائیشە شارەزاتر بێ..

(ابو بردەی کوڕی ابی موسا)ش لە باوکیـەوە بـاس دەکـات: هـەر شـتێکمان لێ ئـالۆز ببوایـە پرسـیارمان لـە عائیـشە دەکـرد دەمـانبینی شـارەزایی هەیـە لەبارەیەوە.

لە (صحیح)یشدا هیچ پیاوێك هێندەی ئەو فەرموودەی ریوایـەت نـەکردووە جگە لە (ئـەبوهورەیرە) و (ئـیبن عومـەر)ﷺ، لەبـەر ئـەوە زانایـانی فـەرموودە دەڵێن: عائیشە-رەزای خوای لێبێ- لـەو کەسـانە دەژمێردرێـت کـە فـەرمودەیان زۆر ریوایەت کردووە.

(عائیشە)-رەزای خوای لێبێ- زمان پاراو و، قسەزان بـوو، کـە قـسەی دەکـرد سـەرنجی گـوێگرانی بـەلای خۆیـدا رادەکێـشا و، کاتـێ قـسەی دەکـرد بینـەرانی کەمەندکێش دەکرد.

موسای کوڕی تەڵحەش لە بارەیەوە دەڵێت: هـیچ کەسـم نـەدیوە لـە عائیـشە زمانپاراوتر بێت.

معاویـەش دەڵێـت: سـوێند بـەخوا هـیچ وتاربێـژێکم نـەبینبوە هـەرگیز قسەرەوانتر و زمانپاراوتر بێت لە عائیشە.

ئەو دانا بوو.. داناییەکەی لە قورئانی پیرۆزەوە وەرگرتبوو، قسەزان بوو، قسەزانیەکەی لە ئەدەبی پێغەمبەرەوەﷺ بەدەستهێنابوو، زمانپاراو بوو چونکە لەنێو دەشتاییەکانی مەککەدا گەورە بووبوو، کە بە کانیاوی ئیسلام ئاودرابوو، زۆریش لە ئادابەکانی پەروەردگار فێر بووبوو..

هێندەی بەسە لە سەروەری کە قورئانی پیرۆز بۆ نیشاندانی بێتاوانی ئەو هاتە خوارەوە لە بارەی روداوی (إفك: بوختان)ی هەڵبەستراو دابەزی کە دووڕووە داخ لە دڵەکان هەستان بە هەڵبەستن و گەورەکردنی، کە موسڵمانان ئەو ئایەتە دەخوێننەوە پەرستشە بۆیان هەتا ئیسلام مابێت:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ۚ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾: ئەوانەی ئەو بوختانەیان هەڵبەستوە، دەستەیەك هەریەك هەر لە خۆتان بون، پێتان وانەبێ بۆ ئێوە خراپ دەبێ، بەڵکو قازانجە بۆ ئێوە و هەرکێش لەوان چەند لەم تاوانە بەشدارە، تاوانی نووسراوە، ئەو کەسەش کە بەشی زۆری ئەو گوناهەی وە ئەستۆگرت، جەزرەبەی دژواری هەیە.﴾النور/١١.

ئەوەندەش بەختەوەری بەسە بۆی کە پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا: خۆشەویسترین کەس کێیە لات؟ لە وەڵامدا فەرمووی: عائیشە.. پرسیارکار هەمان پرسیاری لێ دووبارە کردەوە: مەبەستم ئەوەیە لە پیاواندا کێیە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: باوکیەتی-واتە ابو بکر-..

پێغەمبەری خواﷺ کاتێ زانی خێزانەکانی غیرە لە عائیشە دەکەن، پێی فەرموون: ((لەبارەی عائیشەوە ئازارم مەدەن، چونکە، سوێند بەخوا، جگە لەو لەنێو جێگای هیچ کامتاندا نیگام بۆ نەهاتۆتە خوار)).[1]

---

[1] بڕوانە (بخاری) ١٥١/٥ و ١٥٢ و ٨٤/٧.

عائیشە لەبارەی خۆیەوە دەڵێت: من بە چوار شت شانازی دەکەم بەسەر خێزانەکانی دیکەی پێغەمبەرداﷺ؛ منی بە کچێنی هێنا و کەسیانی بە کچێنی نەهێنابوو، لەوەتی منی خواستبوو تەنها لەماڵی مندا نیگای بۆ هاتبووە خوارێ، دەربارەی عوزر و بەهانەکەی من قورئان هاتە خوارەوە و دەخوێنرێتەوە، جبریل شێوەی منی بۆ هێنا بەر لەوەی مارەم بکات.

بەهۆی زۆر خۆشویستنی عائیشە لای پێغەمبەری خواﷺ ئەوەبوو کە بۆی پاڕایەوە و فەرمووی: خودایا بە لێخۆشبونێکی دەرەکی و ناوەکی لە عائیشەی کچی ئەبوبەکر خۆشی ببە، کە هیچ گوناهێك نەمێنێت و پاش ئەوەش هیچ هەڵەیەك نەکات.

عائیشە دڵخۆش بوو بەو پاڕانەوە گیرابوە و، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: ئەرێ پاڕانەوەکەم شادمانی کردیت؟ وتی: ئەی چۆن پاڕانەوەی تۆ دڵخۆشم ناکات، پێغەمبەر فەرمووی: ئەوە پاڕانەوەی منە بۆ ئوممەتەکەم لە هەموو نوێژێکمدا..

عائیشە-رەزای خوای لێبێ- بێئەندازە پێغەمبەری خوای خۆش دەویست، رۆژێکیان پێغەمبەری خواﷺ هاتە لای و پێی فەرموو: کارێکت دەخەمە بەردەست هیچ پەلەی تێدا مەکە تا راوێژ بە باوکت و دایکت دەکەیت، عائیشە وتی: ئەو کارە چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەری خواﷺ ئەم ئایەتی بۆ خوێندەوە:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجۡرًا عَظِيمٗا : ئەی پێغەمبەر! بە ژنەکانی خۆت بڵێ: ئەگەر ژین و رازانەوەی دنیاتان دەوێ، دەسا وەرن تا هەقی خۆتان بدەمێ و

بەبێ گلەیی و بەخۆشی راهیتان دەکەم.. ئەگەریش خوا و پێغەمبەر و ماڵی دوارۆژتان گەرەکە، خودا بۆ کارچاکەکانتان پاداشتی گەورەی داناوە.﴾الاحزاب/٢٨-٢٩.

عائیشە وتی: لەچی ئەوەدا فەرمانم پێدەکەیت کە راوێژ بە باوك و دایکم بکەم، لەکاتێکدا سوێند بەخوا چاك دەزانم کە باوك و دایکم فەرمانم پێناکەن کە لە تۆ جیاببمەوە، بەڵکو من خودا و پێغەمبەرەکەی و دوارۆژم دەوێت.

پێغەمبەر دڵخۆش بوو بەمە و بەدڵی بوو فەرمووی: ئەوەی خستمە بەردەستی تۆ دەیخەمە بەردەستی هاوژینەکانت (هاوسەرەکانی تری پێغەمبەر)، ئەوە بوو پێغەمبەرﷺ ئەوەی بە عائیشەی فەرموو خستیە روو بۆ ئەوانیش پاشان دەیفەرموو: عائیشە خودا و پێغەمبەرەکەی و رۆژی دوایی هەڵبژارد.

پێغەمبەری خوا وەفاتی کرد، پاش ئەوەی لەگەڵیدا ژیا و سەروەری و چاکەمەندیەکانی بینی و زانست و دانایی و رێنوێنی لێوەرگرت.

عائیشە پاش ئەوە ژیا، تا ببێتە سەرچاوەیەکی بەتین لەبارەی فەرموودە و سوننەتەکانی پێغەمبەر و ژیانیەوە، راویەکان لێوەی ریوایەت دەکەن و، فەرموودەناسانیش لەوەوە دەیگوێزنەوە و وەریدەگرن، بە تایبەت ئەوەی پەیوەندار بێت بە کاروباری ئافرەتانەوە.

عائیشە-رەزای خوای لێ بێ- لە تەمەنی شەست و شەشساڵیدا وەفاتی کرد، بەڵام عائیشە وەك ناوەکەی لە مێژووی شکۆمەندی ئیسلامیدا بە نەمری مایەوە وەك سیاسەت و یاسادانان و ئەدەب.[1]

---

[1] لە (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر، (کرائم النساء) أحمد محمد جمال، (نساء أنزل الله فیهن قرآناً) د.عبدالرحمن عمیرة، (حقوق النساء في الإسلام) محمد رشید رضا.. بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە وەرگیراوە.

# حەفسەی کچی عومەر

## پاسەوانی قورئان

دایکی ئیمانداران و خواپەرستی سەر ڕاست و، هاوسەری پێغەمبەرﷺ لە بەهەشتدا هەروەك جبریل‌عليه السلام هەواڵی پێدابوو.

کچی عومەری کوڕی خەتابە، کە کاتێ خەلیفایەتی موسڵمانانی گرتبووە دەست دەگریا هەتا ریشی تەڕ دەبوو، دەیوت بەوانەی کە دەیانویست واز لە گریان بێنێت: دەترسم هێسترێك لە ڕێی عێراقدا پێی هەڵبکەوێت، خوای گەورە لەبارەیەوە لە عومەر بپرسێتەوە چونکە ڕێگەکەی بۆ تەخت نەکردووە.

دایکی حەفصەش (زەینەبی کچی مظعون)ە، خوشکی هاوەڵی پایەبەرز (عوسمانی کوڕی مظعون) کە لە سەردەمی نەفامیشدا خواردنەوەی ئارەقی لەسەر خۆی حەرام کردبوو..

حەفسە لەم خێزانە خواپەرست و ملکەچە(قانتە)دا لەدایك بوو و پێگەیشت و لە کاتێکدا قورەیشیەکان پێنج ساڵ بەر لەوەی موحەممەد ببێ بە پێغەمبەر خەریکی دروستکردنەوەی کەعبە بوون، ئەو بێوەژن کەوت عومەری باوکی ڕۆیشتە خزمەت ئەبوبەکرؓ و داوای لێکرد بیخوازێت، ئەبوبەکر بێدەنگ بوو، هیچ وەڵامێکی نەبوو، پاشان ڕۆیشت بۆ لای عوسمان دوای ئەوەی

کە (روقیە)ی هاوسەری وەفاتی کردبوو لەبارەی حەفصەوە قسەی لەگەڵ کرد، عوسمان لەوەڵامدا پێی وت: ئێستا هیچ پێویستم بە ئافرەت نیە، ئەمجا چووە خزمەت پێغەمبەری رەحمەت و ئەوەی بەسەری هاتبوو لەگەڵ هاوەڵاندا گێڕایەوە بۆی، پێغەمبەری ئازیز فەرمووی: حەفصە لە کەسێك مارە دەکرێت کە لە عوسمان چاکترە و، ئافرەتێکیش دەدرێتە عوسمان لە حەفصە باشترە... عومەر دڵخۆش بووم بەم مژدەیە، چووەوە بۆ لای کچەکەی تا مژدەی بداتێ کە پێغەمبەر دەیخوازێ و ئەوەش رێزێکی مەزنە لە دونیا و قیامەتدا.

دەڵێن پێغەمبەرﷺ حەفصەی تەڵاق داوە -یەك تەڵاق- پاشان هێناویەتیەوە، لە چیرۆکی تەڵاقدان و گەڕانەوەیدا هاتووە کە جبریل هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و فەرمووی پێی: حەفصە بگێڕەوە چونکە زۆر بەرۆژووە و شەونوێژکارە و، هاوسەرتە لە بەهەشتدا..

کاتێك پێغەمبەریش وەفاتی کرد و بەرەو لای پەروەردگاری باڵادەست گەڕایەوە و، ئەبوبەکری لە شوێنی خۆی دانا کاروباری موسڵمانان بەڕێوە ببات لەنێو دایکانی باوەڕداراندا کە عائیشەی زرنگیشیان تێدابوو حەفصە دیاری کرا تا یەکەم دەستنووسی قورئانی پیرۆز بپارێزێت لە کاتێکدا ئەبوبەکر فەرمانی کرد بە کۆکردنەوەی قورئان لەیەك (مصحف)دا و لای حەفصەی دایکی باوەڕداران داینا.

حەفصە دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ خواپەرست و خۆڕاگر و رۆژووگر و شەونوێژکارانە ژیا و، بە تەنها رێزی پاراستنی یەکەم (مصحف)ی قورئانی پێ بەخشرا، کە پەڕاوی یەکەمی ئیسلام و موعجیزە نەمرەکەی و، یاسا راست و دروست و بیروباوەڕە تاکەکەیەتی.

ئەمیری باوەڕداران (عومەری کوڕی خەتاب)ی باوکی پاش ئەوەی لەلایەن (ئەبو لۆلۆەی مەجوسی)یەوە بریندار کرا، کاتێ هەستی بە نزیکبوونەوەی

ئەجەلی کرد حەفصەی کچی کردە سەرپەرشتی ئەوەی لەدوای بەجێمابوو، حەفصەش دواتر ئەوەی باوکی پێی وتبوو بە عبداللە ی برای راگەیاند و، هەروەها رایسپارد کە خێرێکی پێ وتوە بیکات و سامانێکی هەیە وەقفی کردووە.

حەفصە نووسەرێکی زمانپاراو و قسەزان بوو..

شەست فەرموودەی لە پێغەمبەری خواﷺ و عومەری کوڕی خەتاب ریوایەت کردووە و، دەستەیەك لە هاوەڵان و شوێنکەوتوان فەرموودەیان لە ئەوەوە ریوایەت کردووە.

حەفصە -رەزای خوای لێ بێ- لەسەرەتاکانی جێنشینایەتی معاویەی کوڕی ئەبوسوفیاندا وەفاتی کرد.[1]

---

[1] (کرائم النساء) أحمد محمد جمال، (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر (بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە) وەرگیراوە.

# زەینەبی کچی خەزیمە

## دایکی نەداران

زەینەب کچی خەزیمەی کوڕی حارسی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عەبدولەنافی کوڕی هیلالی کوڕی عامر کوڕی صەعصەعەی هیلالیەو خوشکی مەیمونەی کچی حاریسەی (دایکی باوەڕداران)ە لە دایکیەوە.. پێغەمبەری خوا ﷺ لەپاش خواستنی حەفصەی کچی عومەر هێنای، دەڵێن دوو مانگ یان سێ مانگ یا هەشت مانگ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ژیاوە، پاشان لە تەمەنی سی ساڵیدا وەفاتی کردوە، هەر بۆیە زۆر لەگەڵ پێغەمبەردا نەماوەتەوە.. بە (دایکی نەداران) ناودەبرا، بەهۆی بەسۆزی و دڵنەرمیەوە بەرانبەریان.. خواردنی دەدانێ و خێری پێ دەکردن..

زەینەب –رەزای خوای لێ بێ- وازی هێنابوو لە قاڵبوون بە کاروباری ناوماڵەوە، بەهۆی سەرقاڵبوونیەوە بە کاروباری هەژارانەوەو رازی بوونی بەو رێزەی پێغەمبەرﷺ و بڕواداران هەیانبوو بۆی، خۆی بە تەماع و غیرەکردنەوە ماندوو نەدەکرد.

بە ئاشتی سەری نایەوە، هەروەك چۆن بە ئاشتی ژیا و، پێغەمبەرﷺ نوێژی لەسەر کرد و لە (بەقیع) بەخاکی سپارد، یەکەمین دایکی باوەڕداران بوو لەوێ بەخاك بسپێردرێت.

پێغەمبەرﷺ هیچ یەك لەخێزانەکانی لەکاتی ژیانیدا نەمردوون، تەنها خاتوو خەدیجە و زەینەبی کچی خوزەیمەی هیلالی، دایکی باوەڕداران و دایکی نەداران نەبێت.

# هیندی کچی ئەبو ئومەییە
# ئوم سەلەمە
## کچی ناندەری رێبواران

باوکی لە بەخشندە هەرەناودارەکانی عەرەب بوو، بە (نانـدەری رێبـواران) ناسرابوو، چونکە لە تێشووەکەی خۆی بەشی هاوەڵانی لە سەفەردا دەدا .

شووی بە عبدالله ی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزومی ئامۆزای کرد، کە لەو کەسانەیە لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا موسڵمان بوون و، کوڕی پووری پێغەمبەری خواﷺ و برای شیری بووە و.. یەکەمین کەس بوو لەگەڵ (هیند)ی هاوسەریدا کۆچی کرد بۆ حەبەشە و لەوێ (سەلەمە) لەدایك بوو، پاشان گەڕایەوە بۆ مەککە، کاتێك ویستی (ئوم سەلەمە) لەگەڵ خۆیدا ببات و کۆچ بکات بۆ مەدینە، هۆزەکەی بەرهەڵستیان کرد و ئوم سەلەمە و کوڕەکەیان لێ سەند، پاشان (بەنی عبدالاسد)ی کەس و کاری مێردەکەی کوڕەکەیان بەزۆر لێ وەرگرتنەوە هەتا دەستەوسانی بکەن، ئەویش هەموو رۆژێ دەچووە دەرەوە بۆ دەشتاییەکانی مەککەی پیرۆز و دادەنیشت دەگریا هەتا ئێوارە، تاوەکو دڵی یەکێك لە پیاوەکانی هۆزەکەی نەرم بوو و لەلای کەس و کارەکەی تکای بۆ کرد

و کوڕەکەیان پێدایەوە و، مۆڵەتیان دا تا بەرەو شاری مەدینە کۆچ بکات و بچێت بۆ لای مێردەکەی، بەمەش یەکەمین ئافرەت بوو کۆچ بکات بۆ حەبەشە و، یەکەمین ژنیش بوو بەسواری حوشتر کۆچی کرد بۆ مەدینە.

ئەو زۆر رێزی مێردەکەی دەگرت و خۆشی دەویست، تەنانەت ئەبوبەکر و عومەر لەپاش مردنیشی بەهۆی برینداربونیەوە لە غەزای ئوحود هاتنە داخوازی، بەڵام رازی نەبوو.. پاشان پێغەمبەری خواﷺ ناردیە خوازبێنی بۆ خۆی، وەڵامی بۆ ناردەوە و داوای لێبوردنی کرد بەوەی کە ئەم ئافرەتێکی زۆر بەغیرەیە و مەترسی ئەوەی هەیە کە بێتە هۆی توڕەبوونی پێغەمبەر، هەروەها ئەم منداڵی زۆرە و لە تەمەنیشدا گەورەیە.. پێغەمبەریش وەڵامی دایەوە و لەبارەی گەورەیی تەمەنیەوە فەرمووی: من لەتۆ بەتەمەنترم، سەبارەت بە غیرەش لەخوای گەورە دەپاڕێمەوە کە لە دڵتی دەربکات و، منداڵەکانیش بدە دەست خودا و پێغەمبەرەکەی.

مارەبڕا بۆ پێغەمبەرﷺ، بەم شێوەیە (ئوم سەلەمە)ی یەکەم کۆچکار چووە نێو ریزی دایکانی باوەڕداران و سوننەتی پێغەمبەری دەپاراست و، فەرموودەکانی دەگێڕایەوە و باسی رێڕوونیەکانی دەکرد، بەم جۆرە چاکەمەندی رەچەڵەکی بەڕێز و ماڵی پیرۆز و زوو هاتن بەدەم ئیسلامەوە و، رەوشت بەرزی بە تایبەت ئەمەکداری تێدا کۆبوونەوە، لەسەرووی هەموو ئەمانەوە چاکەمەندییەکی دیکەی هەبوو کە بریتی بوو لە بیرڕوونی و راستێتی بیروبۆچوون، بەڵگەی ئەمەش راوێژ پێکردنیەتی لەلایەن پێغەمبەرەوەﷺ لە گرنگترین شت کە لای کۆبوبێتەوە و بایەخدار بووبێت لای لە کاروباری موسڵمانان، ئەمەش کاتێ کە پێغەمبەرﷺ لەگەڵ خەڵکی مەککەدا پێکهات و رێکەوتننامەی حودەیبیەی لەگەڵدا مۆرکردن، کە لە کاروباری

نووسراوەکە بووەوە، بە هاوەڵەکانی فەرمووو هەستن و قوربانیەکانتان سـەربڕن و پاشان سەر بتاشن، هیچ کامیان هەڵنەستان..

پێغەمبـەرﷺ تـوڕە بـوو و غەمباریەکـەی زیـادی کـرد، جـا چـووە لای ئـوم سەلەمە و سکاڵای ئەوەی لەلایەن هاوەڵانەوە بەرانبـەری ئـەنجام درابوو لاکـرد، ئەویش پێی وت: ئەی پێغەمبـەری خـوا، ئایـا ئـەوەت پێخۆشـە؟ بـڕۆ دەرەوە و قسە لەگەڵ کەسدا مەکە هەتا قوربانیەکەت سەردەبڕیت و سەرتاشەکەت بـانگ دەکەیت تا سەرت بتاشێت..

پێغەمبەریشﷺ لە خێوەتەکەی (ئوم سـەلەمە) چووە دەرەوە و راوێژەکـەی بەجێهێنا و قوربانیەکەی سەربڕی و سەری تاشی، کاتێ خەڵکی ئـەوەیان بینـی، ئـەوانیش هەسـتان قوربانیـەکانیان سـەربڕی و سـەریان تاشـی، وای لێهـاتبوو لەنێو یەکدا کێبڕکێیان بوو لەسەر قوربانی و سەرتاشین، بەجۆرێ وەخت بـوو یەکدیان دەکوشت لە خەمی ئەو زیادەڕەوییەی کردبوویان..

بەم جۆرە موسڵمانان هاتنەوە سەر هۆشی خۆیان پاش ئـەوەی کـە هەسـت و سـۆزیان بەسـەریاندا زاڵ بووبـوو، تێگەیـشتن کـە پێغەمبـەرﷺ چ رێکـەوتنێکی بەسـتووە و بـەر لەمـە ئیـسلام هـیچ رزگـاربوونێکی وەهـا مـەزنی بـەخۆوە نەبینیوە، ئەوە بوو لەپاش رێکەوتنی حودەیبیە هێندەی یاخود زیاد لەوەی کە پێشتر موسڵمان بووبوون خەڵکی هاتنە نێو ئیسلامەوە.

هـیچ گومانکارێـك وا گومـان نابـات، کـە هـاوەڵانڕضي الله عنهم سەرپێـچی فـەرمانی پێغەمبەریان کردبێت یان لێـی یـاخی بـووبن-پـەنا بـەخوا-، بـەڵکو زۆر لەسـەر دڵیان گران بوو کـە بـەر لـەوەی بـچنە شـاری مەککە بگەڕێنـەوە بـۆ مەدینـە و وایـان بیردەکـردەوە کـە ئـەوان کارەکـەیان بەسـەردا سـەپاندوون، بـەڵام خـوای باڵادەست دەزانێ چ خۆشەویستی و باوەڕێـك لـە دڵیاندایـە و، چـەندە راسـتگۆن لـە هاوەڵدارێتی پێغەمبـەرداﷺ و خۆیـان و مـاڵ و سـامانیان کردۆتـە قوربـانی

سەرخستنی ئەم ئاینە، لەبەر ئەوەش بوو کێبڕکێیان کرد لە سەربڕین و سەرتاشیندا پاش ئەوەی بینیان پێغەمبەری خواﷺ پرس و راوێژەکەی ئوم سەلەمەی بەجێ هێنا.

پاش دوو ساڵ لە رێکەوتنی حودەیبیە، (ئوم سەلەمە) لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ و هاوەڵانیدا بەشداری ئەو رزگارکردنە-رزگارکردنی مەککە- بوو، هەروەها پێغەمبەر لە گەمارۆدانی (تائیف) و غەزای هەوازن و (سەقیف)یشدا لەگەڵ خۆیدا بردی.

بە هەمان شێوە لە رزگارکردنی خەیبەریشدا، لەتەك چەند ئافرەتێکدا وتویەتی: خۆزگە خوا جیهادی لەسەر ئێمەش وەك پیاوان فەرز دەکرد، هەتا وەك ئەوان پاداشتمان هەبوایە.. جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:

﴿وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ : ئاوات بەو شتانە مەخوازن لە خودا بەوانە هەندێکی لە ئێوە بەرانبەر هێندێکی تر سەرخستوه.﴾النساء/٣٢.

لە ئاشووبە گەورەکەشدا، عومەری کوڕی برد بۆ لای عەلیؓ داوای لێبوردنی کرد لەوەی کە لەگەڵیدا ناچێتە دەرەوە، پاشان چوو بۆ لای عائیشە و سەرزەنشتی کرد لەسەر چوونەدەرەوەی بەرانبەر پێشەوا و پێی وت: ئەمە چ چوونە دەرەوەیەکە تۆ دەڕۆیت؟ خوای گەورە لەپشتی ئەم ئوممەتەیە، گەر بەم رێگایەتدا بڕۆیت، پاشان پێم بوترێت: بچۆرە فیردەوس، شەرم دەکەم بگەمەوە بە موحەممەد دوای ئەوەی حیجابێکی داوە بەسەرمدا و ئەتکی حیجابەکەیم کردووە.

لە پێغەمبەر و (ئەبوسەلەمە) و (فاتیمەی زەهرا)ەوە (٣٨٧) فەرمودەی گێڕاوەتەوە و، لە هەردوو صەحیحەکەدا ٢٩ فەرموودەی هاتووە، (١٣)یان (متفق علیە) و (بخاری) سێ فەرمودە و (مسلم سیازدە فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە و

هەموویان (الجماعە) فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە.. هەروەها منداڵەكانی عومەر و زەینەب كە لە ئەبوسەلەمە بوو، لەگەڵ عامری كوڕی ئەبوئومەیەی برای موصعەبی كوڕی عبداللە ی برازای و زۆركەسی دیكەش فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە.

لەشاری مەدینە كۆچی دوایی كرد و ئەبوهورەیرە نوێژی لەسەر كرد و لە بەقیع بەخاك سپێردرا.

خوای گەورە لە ئوم سەلەمە و خێزانە پاكەكانی پێغەمبەر و دایكانی چاكەكاری ئیمانداران رازی بێت...[1]

---

[1] لە كتێبی (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر و (كرائم النساء)ی احمد محمد جمال و (حقوق النساء في الإسلام)ی رشید رضا كة طارق السعود پێداچوونەوەی بۆ كردووە، بە پوختكردن و دەستكاریەوە وەرگیراوە.

# زەینەبی کچی جەحشی ئەسەدی

## ڕێزدارترینیان لە ڕوەی خوازبێنیداو
## لە هەمویان دەستکراوەتر

زەینەب کی جەحشی کوڕی رئابی کوڕی یعمری ئەسەدیە.. لە بنەماڵەی بەنی ئەسەدی کوڕی خەزیمەی مەضری و کچەزای (عبدالمطلب کوڕی هاشم)ە.. دایکی ناوی (أمیە کچی عبدالمطلب)ەو پوری پێغەمبەری خوایە.

بە فەرمانی خوای باڵادەست پێغەمبەر خواستی بۆ خزمەتکارەکەی (ئازادکراوەکەی)، ئەو خزمەتکارەی کە کردبوویە کوڕی خۆی کە ئەویش زەیدی کوڕی حاریسە بوو، دوای ئەوەی زەید تەڵاقی دا، خوای گەورە لە پێغەمبەری مارەکرد، بۆ ژیریی و داناییەك کە حیکمەت و دانایی هیچ کام لە هاوسەرەکانی لەوە بەرزتر نیە، ئەویش بریتیە لە پوچەڵکردنەوەی داهێنراوی (تبنی) بە کوڕی خۆکردن کە لە سەردەمی نەفامیدا پەیڕەو دەکرا..

لە زووەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ موسڵمان بوو بوو، کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە و پێغەمبەریش مارەی کرد بۆ زەید، زەینەب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێی رازی نابم بۆ خۆم چونکە من لە بنەماڵەی (بێوەژنی) قوڕەیشم... پێغەمبەر فەرمووی: من رازی بووم پێی بۆ تۆ.. ئەوەبوو زەیدی کوڕی حاریسە خواستی..

لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا زەیدی نەبینی بۆی گەڕا و نەیدۆزیەوە، چوو بۆ ماڵیان، زەینەب ڕێزی لێنا و لەبەری هەستا، پێغەمبەر پشتی تێکرد، زەینەب وتی: ئەو لێرە نیە ئەی پێغەمبەری خوا، وەرە ژوورەوە دایك و باوکم بە قوربانت بێ.. پێغەمبەرﷺ نەچووە ژوورەوە، کاتێ زەید گەڕایەوە خێزانەکەی هەواڵی ئەوەی پێدا کە پێغەمبەری خواﷺ هاتوە بۆ ماڵیان، زەید وتی: ئەی پێت نەوت کە بێتە ژوورەوە؟ وتی: پێم وت بەڵام ڕازی نەبوو.

بەردەوام زەید سکاڵای لە هەڵس و کەوتی خێزانەکەی بەرامبەری دەکرد، کە قسەی ڕەقی پێدەوت و خۆی بە گەورە و ڕێزدارتر دەزانی بەهۆی بنەماڵەیەوە، ئەویش دەچووە خزمەت پێغەمبەرﷺ و سکاڵای خۆی دەکرد و مۆڵەتی لێدەخواست بۆ تەڵاقدانی، پێغەمبەریش دەیفەرموو: دەست بە خێزانەکەتەوە بگرە و لەخوا بترسە.. بەڵام پێغەمبەرﷺ دەیزانی کە هەردەبێ تەڵاقی بدات، خوای گەورەش فەرمانی پێدەکات کە لەدوای تەواوبوونی عیددەی بیخوازێت، بە مەبەستی پوچەڵکردنەوەی داهێنراوی بەکوڕی خۆکردن.

دواتر زەید لێی جیابووەوە و تەڵاقی دا و ماوەی عیدەی کۆتایی هات و پێغەمبەری خواﷺ بەردەوام بوو لەسەر ئەو بارەی هەتا خوای گەورە لە بارەیەوە ئەم ئایەتەی نارده خوارێ:

﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا : ئەوەی خودا چاکەی لەگەڵ کرد و تۆش چاکەت لەگەڵدا کردووە، تۆ پێت دەوت: دەست لە ژنی خۆت بەر مەدە ولەخودا بترسە،

شتێكیشت لە دڵی خۆتدا دەشاردەوە، كە خودا هەر ئاشكرای دەكرد. لەخەڵك دەترسای، كەچی خودا شیاوتر بوو لێی بترسی. جا كاتێ زەید لەگەڵ هاوسەرەكەی گەیشتە ئەوپەڕی، ئەومان كردە هاوسەری تۆ، هەتا خاوەن باوەڕەكان لە خواستنی ژنی زڕ كوڕی خۆیان، لەدوای ئەوەی تەڵاقیان دا، لۆمە نەكرێن، هەر فەرمانێ خودا بیدا، دەبێ پێك بێ.﴾الأحزاب/٣٧.

پێغەمبەریشﷺ بە مەبەستی بەجێهێنانی فەرمانی خوای گەورە كچەپورەكەی خۆی گوێزایەوە.. زەینەب هەموو جارێ رووی لەخێزانەكانی پێغەمبەر دەكرد و دەیوت: وەلیی من لە هی هەمووتان رێزدارترە و خوازبێنیكاریشم لە هەمووتان بەرێزترە، ئێوە كەس و كارتان بە شووی داون، من خوای گەورە لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە دامی بە شوو.[1]

زەینەب -رەزای خوای لێبێ- زۆر لەخواترس و پاك و بێگەرد و راستگۆ و ئایندار بوو، خاتوو عائیشە-رەزای خوای لێ بێ- لەو بارەیەوە گەواهی بۆ دەدات كاتێ كە لە پاش مردنی بۆی گریا و وتی: كەسم نەیدیوە هەرگیز چاكتر بێت لە زەینەب لە ئایینداری و، بێگەردی و لەخواترسی و، راستگۆ لەقسەدا و بەجێهێنەری سیلەی رەحم و مەزنتر لە خێركردندا و، وەك ئەو زۆر هەوڵ بدات لە دەرووی خۆیدا لەكاتی كاری خێرێكدا كە ئەنجامی دەدا و لەخوای گەورە خۆی پێی نزیك دەكردەوە.[2]

لە فەرموودەیەكیشدا هاتووە پێغەمبەری خواﷺ بە عومەری كوڕی خەتابی فەرمووو: زەینەبی كچی جەحشی ئەواهە پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا،

---

[1] طبقات ابن سعد: ٨/ ٧٣.
[2] صحيح مسلم: ج ٢٤٤٢

(أواه) چیە؟ فەرمووی: ملكەچ و لەخواترس، پاشان ئەو ئایەتەی خوای باڵادەستی خوێندەوە:[1]

﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ : ئیبراهیم لەسەرەخۆ و دڵنەرم و بەرەو خودا بوو.﴾هود/٧٥.

هەروەها زەینەب زۆر بەخشندە و خێرەومەند بوو، بەدەستەكانی ئەوەی لە شتی چاك بیزانیایە دروستی دەكرد تا بیبەخشێت بە هەژار و نەداران لەرێی خوادا... لە تەك ئەوەشدا زەینەب رەزای خوای لێبێ رۆژووگر و شەونوێژكار بوو لە كاتێكدا كە بەدەستی خۆی كاری دەكرد شتی لێ دەنا و پێستی خۆشەدەكرد و چنینی دەكرد و لەپێناوی خوادا دەیبەخشێ، لەبەر ئەمەش پێغەمبەری خواﷺ لە بارەیەوە فەرمووی: خێراترین كەستان كە بە من بگاتەوە ئەو كەسەتانە كە لە هەمووتان زیاتر دەستی درێژ بێت.

عائیشە دەڵێت: دەستمان درێژ دەكرد تا بزانین هی كاممان درێژترە... بەردەوام بووین هەتا زەینەب وەفاتی كرد، لە كاتێكدا كە دەستی لە ئێمە درێژتر نەبوو ئەوكاتە زانیمان كە پێغەمبەرﷺ مەبەستی لە دەستدرێژی خێرۆمەندی بووە.. لەبارەی خێرۆمەندی و دنیانەویستیەوە ئەوە دەهێنینەوە كە عومەری كوڕی خەتابرضي الله عنه لە كاتێكدا كە ئەمیری باوەڕداران بوو دوازدە هەزاری پێبەخشی، بەردەوام دەیوت: خودایا ئەو سامانەم پێنەگات لە بەرانبەردا، چونكە ئاشووبە..[2] پاشان دابەشی كرد بەسەر خزم و كەسانی هەژاردا، كاتێ عومەر بە دابەشكردنی سامانەكەی زانی ناردی بە شوێنیا و وتی: هەزار درهەمت بۆ دەنێرم بیهێڵەرەوە بۆ خۆت.

---

[1] الاستیعاب لابن عبدالبر و، الإصابة لآبن حجر.

[2] لە وەرگێرانی (استیعاب والأصابة)، (مسلم)یش بە لەفزێكی نزیك لە (فضائل الصحابة) ریوایەتی كردوە.

ئەو هەمووی بەخشی و هیچی لێ نەهێشتەوە...

کاتێ گەیشتە سەر مەرگ وتی: من کفنی خۆمم ئاماکردوە و ئەمیری باوەڕدارانیش کفنم بۆ دەنێرێت، ئێوە یەکێکیانم بۆ بکەن بە خێر، گەر توانیشتان ئەوا جلەکانیشم بکەن بەخێر.

زەینەب لە سەردەمی جێنشینی عومەری کوڕی خەتابدا و لە تەمەنی ٥٣ ساڵیدا کۆچی دوای کرد و یەکەمین کەس بوو کە لە (تابووت)دا هەڵگیرا، کاتێ عومەر تابووتەکەی بینی وتی: شارەرەوەی باشترین ئافرەتی..

لەپاش وەفاتی هیچ دینار و درهەمی لە شوێن خۆی بەجێ نەهێشت و... ئەمیری باوەڕداران نوێژی لەسەر کرد و لە خاکی بەقیع خەڵکی مەدینە بە خاکیان سپارد، زەینەبی کچی جەحش دایکی باوەڕداران و یەکەمین خێزانی کە لەپاش پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد و لە هەموویان دەست کراوەتر بوو لە هەموویان زووتر پێی گەیشتەوە.[1]

---

[1] (تراجم سيدات بيت النبوة)ی (د.عائشة عبدالرحمن)، (نساء فاضلات)ی عبدالبديع صقر بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە.

# جوەیریەی کچی حاریس

## خاتونی بەنی موستەلەق و فەرو بەرەی سەرهەندەکەی

جوەیریـە کـچی حارسـی کـوڕی ئـەبو ضـراره، بـاوکی سـەرۆکی (بـەنی مـستەلەق)ە، هـەواڵ گەیـشتە پێغەمبـەری خـواﷺ کـە (بـەنی مـستەلەق) خـۆ کۆدەکەنەوە بۆ شەڕ کردن بەرانبەری، پێغەمبەریش رۆشتە دەرەوە بۆیان تا لە کەناری ئاوێکدا پێیان گەیشت کە بـە (مریـسیع) ناسـرابوو، شـەڕ بـە دۆڕانـدنی (بەنی مستەلەق) کۆتایی هات، ئافرەتەکانیان کران بە کەنیزەك، لە نێویشیاندا جوەیریەی کچی سەرۆکەکەیانی تێدابوو کە (بیرە)ی ناوبوو.

هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و خۆی پێناساند و هـەواڵی پێدا کە ئـەو کچی گـەورەی هۆزەکەیـەتی و کەوتۆتـە بەشـی (سـابیت کـوڕی قـەیس)ەوە... منـیش خـەریکم خـۆم دەکڕمـەوە و هاتوومەتـە خزمـەتت تـا پـشتیوانیم بکـەیت لـەم کارەدا (واتە ئازادکردنی خۆیدا).

پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: ئەی ئەوە چاکتر نیە حـەقی کڕینەوەکـەت بـۆ بـدەم و پاشـان بتخـوازم، وتـی: باشـە.. پێغەمبـەری خـوا ئـەوەی ئـەنجام دا، موسڵمانەکان وتیان: ماڵە خەزورانی پێغەمبەری خـوانﷺ، لەبـەر ئـەوە هـەموو

دایـك و ئافرەتـە گیراوەکانیـان ئـازادکردن. هەمووشـیان موسـڵمان بـوون، بـەم هۆیەوە مەزنترین ئافرەت بوو لە فەڕ و ڕێژەندا بۆ سەر هۆزەکەی و، ئـەو کـارە چاکەش باشترین کاریگەری هەبوو لەسەر هەموو عەرەب.

لـە گێڕانەوەیـەکی دیکـەدا هـاتووە کـە بـاوکی هاتۆتـە خزمـەت پێغەمبـەری خواﷺ و، وتویەتی: کچی من ناکرێت بە غەنیمە و کەنیزەك، جا ڕێگەی بـدە و ئازادی بکە، پێغەمبەریشﷺ فەرمانی پێکرد کە سەرپشتی بکات (بەوە دڵخۆش بوو و، سەرپشکی کرد، ئەویش خودا و پێغەمبەرەکەی هەڵبژارد و، جوەیریـەی کـچی حاریـسی دایکـی ئیمانـداران لـە خواپەرسترین دایکـانی ئیمانـداران بـوو، (ئـیبن عـەباس و جـابر و ئـیبن عومـەر و عەبیـدی کـوڕی سـباق و، طفیـلی خوشکەزای و کەسانی دیکەش فەرموودەیان لێـوە گێڕاوەتـەوە، جوەیریـە-ڕەزای خوای لێ بێ- تا سەردەمی جێگیربوونی دەستەڵاتی (معاویە) ژیا و، لەساڵی ٥٦ی کۆچی-کە ڕاستریانە- کۆچی دوایی کرد و مەروانی کوڕی حەکـەم کـە ئـەمیری شاری مەدینە بوو نوێژی لەسەر کرد.

خـوای گـەورە لـە (جوەیریـە)ی دایکـی بـاوەڕداران ڕازی بێـت کـە ((هـیچ ئافرەتێـك نـەبووە وەك ئـەو فـەڕ و ڕێـژەنی بـۆ سـەر هۆزەکـەی لـەو مـەزنتر بێت.))[١]

---

[١] تراجم سیدات بیت النبوة: د.بنت الشاطئ، (حقوق النساء في الإسلام)ی محمد رشید رضا بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە.

# صەفیەی کچی حویەیی

## ژنەکەی بەنی نەضیر

## محمد هاوسەرمە و هارون باوکمە و موساش ماممە

دایکی ئیمانداران (صەفیەی کچی حویەیی کوڕی ئەختەب)ە و، لە نەوەی پێغەمبەر هاروونی برای موسایە، سەلامی خوایان لێبێ.

ئەو لە (بەنی نەضیر)ە و لەپاش کوژرانی مێردەکەی لە غەزای (خەیبەر)دا بەدیل گیرا و، بەر (دحیە) کەوت.. هەندێ لە هاوەڵان بە پێغەمبەری خوایانﷺ وت: ئەو ئافرەتە خاتوونی (بەنی قورەیظە)یە و تەنها شایانی تۆیە، پێغەمبەریش بۆچوونەکەی پەسەند کردن و ڕێگەی نەدا کە لای کەسێك کۆیلە بکرێت کە لەو خوارتر بێت، هەر بۆیە هەڵیبژارد و ئازادی کرد و خواستی.

پێغەمبەری خواﷺ سەرپشکی کرد لەنێوان ئەوەی ئازادی بکات و بیخوازێت، یان بیگەڕێنێتەوە بۆ هۆزەکەی، ئەویش ئەوەیانی هەڵبژارد کە ئازادی بکات و ببێتە هاوسەری..

ڕۆژێکیان پێی گەیشتەوە کە عائیشە و حەفصە پێیان وتوە: ئێمە لەتۆ بەڕێزترین لای پێغەمبەری خوا.. ئەویش هات و ئەوەی بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە و، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((ئەی بۆ پێت نەگوتن ئێوە چۆن لەمن چاکتر دەبن کە موحەممەد هاوسەرمە و هارون باوکمە و موساش ماممە)).

صەفیە-ڕەزای خوای لێ بێ- ئافرەتێکی چاکی ژیری جوان و ڕێزدار بوو، هەندێ کەس لە ژوورەکەی (صەفیە)دا کۆبوونەوە و یادی خوای گەورەیان کرد

و قورئانیان خوێند و کڕنووشیان برد، بانگی کردن.. کەنیزەکێکی صەفیە چووە خزمەت عومەری کوڕی خەتاب و، وتی: صەفیە ڕۆژی شەممەی خۆش دەوێت و هاتوچۆی جولەکەیش دەکات..

عومەریش ناردی بە شوێنیا و لەوبارەیەوە پرسیاری لێکرد.. ئەویش وتی: لەبارەی ڕۆژی شەممەوە لەوەتی خوای گەورە گۆڕیویەتی بۆم بە ڕۆژی هەینی خۆشم نەویستووە.. سەبارەت بە جولەکەش خزم و کەسم هەیە لە نێویاندا و لەسەرم پێویستە سەردانیان بکەم..

پاشان لە کەنیزەکەی پرسی: چی وای لێکردی کە ئەمە بکەی؟ وتی: شەیتان.. صەفیەش پێی وت: بڕۆ تۆ ئازادیت.

ئەو کاتەی کە عوسمانڕضي الله عنه گەمارۆدرابوو، صەفیە بەسواری وڵاخێکەوە هات بۆ لای هەتا لایان بدات، (ئەشتەر)ی پێگەیشت و دای بە دەم و چاوی ماینەکەیدا، لە کاتێکدا کە نەیدەزانی سوارەکەی کێیە.. صەفیە وتی: بمگێڕەوە بەڵام مەمشکێنەرەوە.. پاشان ڕێگەیەکی لەنێوان ماڵەکەی و ماڵی عوسماندا کردەوە و لەوێوە خواردن و ئاوی بۆ دەبرد.

صەفیە دە فەرمودەی لە پێغەمبەرەوەﷺ گێڕاوەتەوە و، کنانەی برازا و خزمەتکاری و یەزیدی کوڕی موتعەب و ئیسحاقی کوڕی عبدالله ی کوڕی حاریس و موسلیمی کوڕی سەفوان فەرمودەیان لێوە گێڕاوەتەوە.

صەفیە لەساڵی ٥٠ی کۆچی.. یان وەك لە گێڕانەوەی تردا هاتووە ساڵی ٥٢ی کۆچی لە سەردەمی جێنشینی (معاویە)دا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی (بەقیع) لەگەڵ دایکانی ئیمانداراندا بەخاك سپێردرا.[1]

---

[1] سود وەرگیراوە لە (تراجم سیدات بیت النبوە)ی (د.عائشە عبدالرحمن)، (نساء فاضلات)ی عبدالبدیع صقر، (حقوق النساء في الإسلام)ی محمد رشید رجا، بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە.

# ئوم حەبیبە

## رەملای کچی ئەبو سوفیانی ئومەوی

### بەباوکوت، ئەچێتە پێغەمبەر دانە

خاتونێکی پایەداری چاکەکارە، لەگەڵ (عوبیداللە ی کوڕی جەحش)ی هاوسەریدا لە کۆچکردنی دووەمدا بەرەو حەبەشە کۆچی کرد، پاشان لەوێ مێردەکەی بوو بە گاور و هەر بە گاوریش مرد، بەڵام رەملەی هاوسەر جێگیربوو لەسەر ئیسلامیەتیەکەی، پێغەمبەریشﷺ ناردیە لای (نەجاشی) تا داخوازی رەملەی بۆ بکات، (نەجاشی)یش چوارسەد دیناری مارەییەکەی دا، کاتێ رەملە گەڕایەوە شاری مەدینە پێغەمبەر گواستیەوە، باوکی رەملە وتی: ئەو کەڵێکە لوتی ناشکێنرێت-واتە زۆر رێزدارە-، باوکی نکوڵی لە لێهاتوویيەکەی نەکرد، بەڵکو شانازی پێوە کرد.

ئەویش باشترین هاوسەری، باوەڕ بەتین بە خوا و پێغەمبەرەکەی بوو..

کاتێ ئەبوسوفیان هاتە سەردانی پێغەمبەری خواﷺ لە شاری مەدینە ساڵی هەشتی کۆچی.. دایکی باوەڕداران بینی باوکی دێتە ماڵەکەی، لە ساتی کۆچکردنیشەوە بۆ حەبەشە چاوی پێی نەکەوتبوو، بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە بەرانبەری راوەستا، پاشان ئەبوسوفیان لای خۆیەوە لەسەر جێگاکە دانیشت، رەملەش یەکسەر جێگاکەی پێچایەوە و بەتوندی کۆی کردەوە.. باوکی پێی وت: سوێند بەخوا نازانم ئەو جێگایە بە شیاوی من نازانی، یان من بە شیاوی ئەو نازانی؟

کچەکەیشی پێی وت: بەڵکو ئەوە جێگەی پێغەمبەری خوایەﷺ و تۆش پیاوێکی هاوبەش پەیداکەری پیسی، پێم خۆش نیە لەسەر جێگەی پێغەمبەری خواﷺ دابنیشیت، ئەبوسوفیان پێی وت: سوێند بەخوا کچم، تۆ دوای من خراپت بەسەر هاتووە.. پاشان چووە دەرەوە..

هەڵوێستێك ئیمان دروستی کردووە، ڕێگە نادات باوکی (هاوبەشی بڕیاردەری) لەسەر جێگەی مێردەکەی کە باشترین دروستکراوی خوایە دابنیشێت..

ئەمجا (ئوم حەبیبە) سەری نا بە دیواری ماڵەکەیەوە و گریانی نەهات و تەواو بێتاقەت بوو..

(ئوم حەبیبە) لە شەش کتێبەکەی فەرموودەدا حەبیبەی کچی و دوو براکەی و برازاکەی و خوشکەزاکەی و خزمەتکارەکەی و کەسانی دیکە شەست و پێنج فەرموودەیان لێوە ریوایەت کردووە.

کاتێ گەیشتە سەرەمەرگ بانگی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرﷺ کرد و پێی وت: پێدەچێت ئەوەی لەنێوان هەوێدا ڕوودەدات رووی دابێت، خوای گەورە لە من و لەتۆش و لەوەی ڕوەیداوە لە نێوانماندا خۆش بێت..

عائیشە وتی: خوای گەورە لە هەموو ئەوانە و بەزیادیشەوە ببورێت و، رزگارت بێت لێی..

ئوم حەبیبەش پێی وت: دڵخۆشت کردم خوا دڵخۆشت بکات.. ناردیشی بە شوێن ئوم سەلەمەشدا و هەمان شتی پێوت..

پاشان بە ئارامیەوە ڕاکشا و جەستەی بێگەردیشی لە خاکی پاکی بەقیعی شاری مەدینەی مونەوەر، لەساڵی چل و چواری کۆچیدا بەخاك سپێردرا...[١]

---

[١] سود وەرگیراوە لە کتێبی (نساء فاضلات)ی عبدالبدیع صقر، (تراجم سيدات بيت النبوة)ی (د.بنت الشاطئ)، (حقوق الأنسان في الإسلام)ی محمد رشيد رضا، بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە.

# ماریەی کچی شەمعونی قیبتی
# دایکی ئیبراهیم

لە چاکترین ئافرەتانی سەردەمی خۆی بووە.. مقەوقسی گەورەی قیبت لە میسر بەدیاری ناردی بۆ پێغەمبەری خواﷺ لە گەڵ خوشکێکیدا کە ناوی سیرین بوو، لەگەڵ چەند دیاریەکی بەنرخی دیکەدا، هەموو ئەوانەیشی بە (حاطەبی کوڕی ئەبی بەلتەعە)دا-رەزای خوای لێ بێ- نارد، کە پێغەمبەری خوا بە نوێنەرایەتی خۆی ناردی بۆ لای (مقەوقەس).

(حاطەب)یش باسی ئیسلامی بۆ ماریە و خوشکەکەی کرد و شیرینی کرد لایان و لەسەر ویستی خۆیان هەردووکیان موسڵمان بوون..

پێغەمبەری خواﷺ ماریەی هەڵبژارد و خوشکەکەیشی بەخشیە (حەسانی کوڕی سابیت)..

پێغەمبەری خواﷺ لەو شوێنەی کە تێیدا نیشتەجێی کردبوو دەچووە سەردانی و، حیجابی بەسەردا دابوو، وەك کەنیزەکێك (ملك يمين) دەچووە لای تا لە (ذي الحجة)ی ساڵی هەشتی کۆچیدا (ئیبراهیم)ی بوو، ئەمجا پێغەمبەری خوا ئازادی کرد..

بەڵام بەختەوەریەکەی تەنها ساڵێك و هەندێکی خایاند و ئیبراهیمی کوڕی مرد و، پێغەمبەری خواﷺ گەڕایەوە بۆ لای خودا و ماریەی لەدوای خۆی بەجێهێشت و ئەویش دوای ئەو پێنج ساڵ لە گۆشەگیری و دووری لە خەڵکدا بەسەر برد و، زۆر بە کەمی (سیرین)ی خەوشکی خۆیشی دەبینی.

تەنها بۆ سەردانی گڵکۆی پێغەمبەری ئازیز لە مزگەوت و گڵکۆی کوڕەکەی لە بەقیع دەچووە دەرەوە.

کاتێك لە ساڵی شازدەی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد، ئەمیری باوەڕداران (عومەر)ﷺ خەڵکی کۆکردەوە بۆ بردنی جەنازەکەی و پاشان نوێژی لەسەر کرد و لە خاکی (بەقیع) بەخاك سپێردرا.[1]

---

[1] سود لە کتێبی (أعلام النساء)ی عمر رضا کحالة، (تراجم سیدات بیت النبوة)ی د.بنت الشاطئ، بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە وەرگیراوە.

# مەیمونەی کچی حاریس

# دواهەمین دایکی بڕواداران

لە چاکترین ئافرەتەکانی سەردەمی خۆی بووە.. خوشکی (ئوم فەضل)ی خێزانی (عەباسی کوڕی عبدالمطلب) و یەکەمین ئافرەت بووە کە لەپاش خەدیجەﷺ موسڵمان بوو، (زەینەب کچی خوزەیمە)ی دایکی باوەڕداران و دایکی هەژار و نەداران و، (ئەسمائی کچی عەمیس) و (سەلمای کچی عەمیس) لە دایکەوە خوشکین و، دایکی هەمووشیان (هندی کچی عەوف)ە..

پێغەمبەری خواﷺ لەساڵی حەوتی کۆچیدا خواستی.. عەباسی کوڕی عبدالمطلب دای پێی چونکە ئەو ئەرکی بەخێوکردنی لە ئەستۆدا بوو، مەیمونە دواهەمین ئافرەتیش بوو کە پێغەمبەری خواﷺ خواستی.

ئیبن شەهاب دەڵێت: ئەو خۆی پێشکەشی پێغەمبەر کرد، قەتادەش هەر وای باس کردووە، لە بارەیەوە ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارێ:

﴿وَٱمۡرَأَةً مُّؤۡمِنَةً إِن وَهَبَتۡ نَفۡسَهَا لِلنَّبِيِّ: هەر ژنێکی باوەڕداریش کە خۆی بە پێغەمبەر ببەخشێ.﴾الأحزاب/٥٠.

(ئیبن عبدالبر) دەڵێت: قسەی (ئیبن شەهاب) راستی وتوە.

عائیشەﷺ لەبارەیەوە وتویەتی: (سوێند بەخوا لە هەموومان بە تەقواتر و خزم دۆست تر بوو).

مەیمونەی دایکی باوەڕدارانیش لای شەش پێشەواکەی فەرموودەناس شەست و چوار فەرمودەی هەیە.. عبدالله ی کوڕی عەباس و یەزیدی کوڕی ئەصەم و کۆمەڵێك لە تابیعین فەرمودەیان لێوە گێڕاوەتەوە..

لە تەمەنی هەشتا و یەك ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و لە (سرف)ی نزیك (تنعیم) هەمان ئەو شوێنەی کە پێغەمبەری خواﷺ تێیدا گواستیەوە بە خاك سپێردرا..

عبدالله ی کوری عەباس خوشکەزایﷺ نوێژی لەسەر کرد..

سڵاو لەسەر مەیمونە..

سڵاو لەسەر هەموو هاوسەرانی پێغەمبەرﷺ، دایکانی ئیمانداران، خوا لە هەموویان رازی بێ.[1]

---

[1] لە کتێبی (سیدات بیت النبوة)ی د.عائشة عبدالرحمن، (نساء فاضلات)ی عبدالبدیع صقر بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە وەرگیراوە.

# بەشی سێیەم

## کچەکانی پێغەمبەر

+ زەینەبی کچی موحەممەدﷺ.
+ روقیەی کچی موحەممەدﷺ.
+ ئوم کەلثومی کچی موحەممەدﷺ.
+ فاتیمەی کچی موحەممەدﷺ.

---

## کچەزاکانی پێغەمبەر

+ زەینەبی کچی عەلی کوڕی ئەبوطالب
+ ئوم کەلسومی کچی عەلی کوڕی ئەبوطالب
+ فاتیمەی کچی حوسەینی کچی عەلی کوڕی ئەبوطالب
+ سەکینەی کچی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوطالب
+ نەفیسەی کچی حەسەنی کوڕی زەیدی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوطالب

# زەینەبی کچی محمد

# فیدیەدەری هاوسەرەکەی

خانمێکی پایەداری بەخشندە و، نمونەیەکی بەرزی ڕێز و ئەمەکداری بوو، بەر لەوەی باوکی ببێتە پێغەمبەری خوا مارەی کرد لە (ئەبو عاصی کوڕی رەبیع)ی پوورزای-خوشکی دایکی-، کاتێ نیگا هاتە خوارەوە لەگەڵ خوشکەکانیدا هاتنە نێو ئاینی خودا، بەڵام هاوسەرەکەی ملی نەدا و بە زەینەبی وت: سوێند بەخوا باوکت لای من تاوانبار نیە، بەڵام پێم ناخۆشە کە بڵێن هۆزەکەمم سەرشۆڕ کردووە و، لەبەر رازیکردنی خێزانەکەم لە ئاینی باووباپیرانم هەڵگەڕاومەتەوە.. ئەوەش گورزێکی لە ناکاوی یەکەم بوو بۆ زەینەب.

سالْ هات چوو، شەڕی بەدر بەرپا بوو، مێردەکەی لەنێو دیلی بێباوەڕەکاندا بوو، زەینەب ملوانکەیەکی هەبوو کاتی خۆی خەدیجەی دایکی لە رۆژی بوکێنیدا بەدیاری پێی بەخشیبوو ناردی بۆ فیدیەی (ئەبو عاص)ی مێردی، کاتێ پێغەمبەری خواﷺ چاوی پێی کەوت زۆر دڵی نەرم بوو بۆی و، فەرمووی: ئەگەر پێتان باشە کە دیلەکەی بۆ بەربدەن و ئەوەشی کە

ناردویەتی بۆی بگێڕنەوە، ئەوا بکەن.. هاوەڵانیش وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمجا ئازادیان کرد و ملوانکەکەشیان بۆ گێڕایەوە.

پێغەمبەری خواﷺ داوای لە زەینەب کرد کە خۆی بگەیەنێتە خاکی کۆچ بۆکراو، پاش ئەوەی کە فەرمانی کرد بە مێردەکەی کە تەڵاقی بدات، چونکە ئەو تا ئێستا هاوبەش بڕیاردەرە و حەڵاڵ نیە بۆی، ئەمەش خەمێکی گەورەتر بوو بۆ زەینەب.

ئەمجا زەینەب خۆی گەیاندە باوکی لە مەدینە پاش ئەوەی توشی ئازار ئەشکەنجەی توند بوو لەسەر دەستی قوڕەیشیەکان، (هباری کوڕی ئەسوەدی ئەسەدی) ترساندنی و رمەکەی کرد بە پشتی حوشترەکەیدا و حوشترەکەیشی سەری لێ شێوا و زەینەبی خستە خوارەوە و دای بەسەر بەردێکدا و تووشی خوێن بەربوون بوو، کۆرپەکەی لەسەر رووی ئەو بیابانەدا لەبارچوو.

ئەبوعاص جارێکیان بۆ بازرگانی هاتە شاری مەدینە، لە کاتێکدا کە هەر هاوبەش بڕیاردەر بوو، دەستەیەك لە دەستەکانی موسڵمانان شوێنی کەوتن.. لە شەودا خۆی حەشاردا هەتا خۆی گەیاندە ماڵی زەینەب تا داڵدەی بدات.. زەینەب هاواری کرد: ئەی خەڵکینە من پەنای (ئەبوعاصی کوڕی رەبیع)م داوە.. پێغەمبەری خواﷺ لەوکاتەدا لەگەڵ موسڵمانەکاندا لەنێو مزگەوتدا بوو، گوێی لە هاوارەکەی بوو، پاشان چوو بۆ لای کچەکەی، زەینەب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا... ئەبوعاص بە خزمایەتی بێت ئامۆزامە، خۆ گەر دوریش بێت باوکی کوڕەکەمە، منیش پەنام داوە.. پێغەمبەری خوداشﷺ بە زەینەبی کچی فەرموو: ئێ باشە کچم، رێزی بگرە و نەیەتە لات، چونکە تۆ حەڵاڵ نیت بۆی لەبەر ئەوەی بێباوەڕە.

پاشان ئەبوعاص گەڕایەوە بۆ مەککە و هەموو ئەوانەی مافیان هەبوو بەسەریەوە حەقی خۆیانی پێدانەوە، دواتر موسڵمان بوو و بە کۆچکاری و

موسڵمانێتی گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر، پێغەمبەریشﷺ زەینەبی پێدایەوە و هەموو خێزانەکە یەکیان گرتەوە.. بەڵام بۆ وادەیەکی کەم، چونکە دوای یەك یەك ساڵ لە گەیشتنەوەی بە مێردە خۆشەویستەکەی، زەینەب بەهۆی ئەو کەوتنە خوارەوەی بەسەر بەردا، کاتی دەرچوونی لە مەککە، دەمرێت.

بەراستی زەینەب-ڕەزای خوای لێبێت- نمونەیەکی بەرزی هاوسەری ئەمەکدار و بەسۆز بوو..[1]

[1] (نساء فاضلات)ی عبدالبدیع صقر، (کرائم النساء)ی احمد محمد جمال بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە وەرگیراوە.

# ڕوقیەی کچی محمد

## خاوەنی دوو کۆچ

بەر لە پێغەمبەرایەتی (عوتبەی کوڕی ئەبو لەهەبی کوڕی عبدالمطلب) مارەی کردبوو، جا ئەبولەهەب خەزووری بوو، خەسویشی (حمالة الحطب) بوو، کاتێك موحەممەد بوو بە پێغەمبەر، ئەبولەهەب بە عوتبەی کوڕی وت: سەرم لە سەری تۆ حەرام بێت ئەگەر ئەو کچەی موحەممەد تەڵاق نەدەیت.. ئەویش لێی جیابووەوە.

دواتر لە مەککە عوسمانی کوڕی عەففان خواستی و لە هەردوو کۆچەکەدا چوو بۆ خاکی حەبەشە و، لەگەڵ عوسمانی هاوسەریشیدا کۆچی کرد بۆ مەدینە لەکاتی کۆچکردنی پێغەمبەری خواداﷺ.

لەکاتی خۆ سازداندا بۆ جەنگی بەدر روقیە تووشی نەخۆشی سورێژە بوو، پێغەمبەری خواﷺ عوسمانی لەلای بەجێهێشت و، ئەویش لەلای مایەوە هەتا بەڕازیکراوی و رازی بوون لێی گیانی سپارد و گەیشتەوە بە دیداری پەروەردگاری..

زەینەب هاوسەرێکی ئارامگری کۆچکار و نمونەیەکی بەرز و بەڕێزی کچی بێگەرد و داوێن پاك بوو.

کاتێ کە وەفاتی کرد فاتیمە لەسەر لێواری گڵکۆکەی لە تەنیشت پێغەمبەری خواوەﷺ دانیشت و دەستی بە گریان کرد، پێغەمبەری خواشﷺ بە چمکی جلەکانی فرمێسکەکانی دەسڕیەوە..

لە ئەنەسیشەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: ئامادەی بەخاك سپاردنی کچی پێغەمبەری خوا بووینﷺ، پێغەمبەری خوا لەسەر گۆڕەکەی دانیشتبوو، بینیم فرمێسك بە چاوەکانیدا دەهاتە خوارێ.

کاتێ کە ئافرەتان لەسەری گریان عومەری کوڕی خەتاب سەرزەنشتی کردن، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: لێیان گەڕێ، ئەی عومەر با بگرین، پاشان فەرمووی: بگرین، بەڵام ئاگاداری قیژەی شەیتان بن، چونکە هەرچەندە لە دڵ و چاوەوە بێت ئەوا لەلایەن خواو بەزەییەوەیە، هەرچەندیش بەدەست و زمان بێت ئەوا لە شەیتانەوەیە.[1]

[1] لە کتێبی (نساء فاضلات)ی عبدالبدیع صقر، (کرائم النساء)ی احمد محمد جمال، بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە.

# ئوم کەلسومی کچی محمد

بەر لە پێغەمبەرایەتی شووی بە (عەتیبەی کوڕی ئەبولەهەب) کردبوو، کاتێ کە پێغەمبەری خوا نیگای بۆ هاتە خوارەوە و بوو بە پێغەمبەر و ئەو ئایەتە دابەزی:

﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ : هەردوو دەستی ئەبولەهەب وشك بێت و عەمری نەمێنێ.﴾المسد/١.

ئەبولەهەب بە (عەتبە)ی کوڕی وت: سەرم لە سەری تۆ حەرام بێت ئەگەر ئەو کچەی موحەممەد تەڵاق نەدەیت، ئەویش لێی جیابووەوە.. هەر لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووﷺ هەتا کۆچی کرد بۆ مەدینە.

کاتێ روقیەی خوشکی کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەری خواﷺ لە شوێنی خوشکەکەی دای بە (عوسمان کوڕی عەففان).. زۆر لای نەمایەوە تا کۆچی دوایی کرد منداڵیشی لێی نەبوو..

پێغەمبەری خواﷺ زۆر غەمبار بوو بۆی، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ کاتێ ئوم کەلسومیان خستە گۆڕەکەیەوە فەرمووی: با ئەو کەسەی ئەمشەو لەگەڵ خێزانەکەیدا ئاوێزان بووە دانەبەزێتە نێو گۆڕەکەی..

ئـەمجا فـەرمووی: ئایـا کەسـتان تێدایـە ئەمـشەو ئـاوێزان نـەبوبێت لەگـەڵ خێزانی؟ ئەبوتەڵحە وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا..

فەرمووی: دابەزە... ئەویش دابەزی.

خوای گەورە رەحمـی بـە ئـوم کەلـسوم کـرد کـە رزگـاری کـرد لـە نەهامـەتی هەتیوی و بێوەژنی، ئـەو نـە وەفـاتی بـاوکی بینـی دوای سـاڵێك، نـە تیاچوونی ناخۆش و پڕ لە ئازاری عوسمانی مێردی بینی.[1]

# فاتیمەی کچی محمد

پێشتر لە باسی چاکترین ئافرەتانی جیهانیاندا لەبارەیەوە دواین..

[1] لـەکتێبی (نـساء فاضـلات)ی عبدالبـدیع صـقر، (تـراجم سـیدات بیـت النبـوة)ی د.عائـشة عبدالرحمن، بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە٤.

# پچە زاكانی پێغەمبەر

## زەینەبی كچی عەلی كوڕی ئەبوتالب

### خاوەنی هەڵوێستە مەزنەكان

خاتونێكی پایەداری هۆشمەنـدی بیروڕا جوانی زمـان پـاراوی قسەزان بـوو، پێنـج ساڵ بەر لە وەفاتی موحەممەدی باپیریﷺ لەدایك بوو، دواتـر شووی كـرد بە (عبدالله ی كوڕی جەعفەری كوڕی ئەبوطالب)ی ئامۆزای.

عەلی كوڕی ئەبوطالب باوكیەتی و، دایكیشی (فاتیمەی زەهرا)یە.

لە سایەی چاودێرییەكی تایبـەتی موحەممـەدی بـاپیریﷺ و سـۆزێكی زۆری كەس و كارە بەڕێزەكەیـدا گەشـەی كـرد، خـوای گـەورەش وەك روەكێكـی چـاك پێی گەیاند.

پێغەمبەری خواﷺ ناوی نا (زەینەب) تا هاوناوی (زەینـەب)ی كـچە گـەورەی خۆی بێت.. كە زۆر شێوەی لەوی دەكرد، ئەوەش وایكردبوو كـە پێغەمبـەر زۆر پەیوەست بێت پێوەی..

زەینەب زۆر لەخواترس و خۆپارێز بوو، بە رۆژدا بەرۆژوو، شـەونوێژ كـاری شەوانی بوو، زانایەكی خانەدان بـوو، هێنـدە زانـست و زانیـاری شـارەزا بـوو كـە

کردبوویە جێی وردبوونەوەو سەرنجی ناودارانی هۆز و سەرداری زانایان و تێگەیشتوان.. بە چاکەمەندی و ڕێزداری و دانایی و بەرچاوروونی ناسرابوو، هەروەها ئاکار پەسەند و جێگای پرس و راوێژ پێکردنیش بوو..

لەگەڵ (حوسەینی کوڕی عەلی) برایدا کارەساتی کەربەلای بینی و نارەحەتی زۆری تێدا بەسەر هات و، سەرپەرشتی کاری ئافرەتانی تێکۆشەر و ڕێکخستنی کاروباری فریاگوزاری بریندارەکانی دەکرد و، لە خزمەتی نەخۆشەکاندا بوو، هەڵدەستا بە جۆشدانی گیانی حەماسەت و مەردایەتی و بەرگریکردن لەو حەقەی کە لەسەری دامەزراوە..

موحەممەدی کوڕی عەمر، عەتائی کوڕی سائب و فاتیمەی کچی حوسەینی کوڕی عەلی فەرموودەیان لێوەی گێڕاوەتەوە..

لە وتەکانیشی... (هەرکەسێك ویستی کە دروستکراوێك شەفاعەتی بۆ بکات لای خوای گەورە، ئەوا با سوپاسگوزاری خوا بێت، ئایا گوێبیستی ئەو وتەیان نەبوون کە دەڵێن ((سمع الله لمن حمده: خوا گوێبیستی ئەوانەیە کە سوپاسگوزاری ئەو دەکەن))، جا لەخوا بترسە چونکە توانا و دەستەڵاتی هەیە بەسەرتا و، بەهۆی نزیکی لێتەوە شەرمی لێ بکە).

زەینەب-خوا لێی رازی بێت- ژیانی وەك فێرگەیەکی دانایی و، هێمایەکی خۆپارێزی و تەقوا و، بەیداخێکی شەکاوەی سەر ڕێی جیهاد و ئارامگری و ئامادەباشی لەپێنای بەرزکردنەوەی پەیامی ئیسلامدا گوزەراند..[1]

---

[1] لە کتێبی ((الداعية زينب الغزالي، ميسرة وجهاد) ئامادەکردنی (ابن الهاشمی) و.. (نساء فاضلات)ی عبدالبديع صقر وەرگیراوە.

# ئوم کەلسومی کچی عەلی کوڕی ئەبوتالب

لە چاکترین ئافرەتانی سەردەمی خۆی بوو، بەر لە وەفاتی پێغەمبەری خواﷺ لەدایك بووە و، عومەری کوڕی خەتاب خوازبێنی کرد لە عەلی کوڕی ئەبوطالب، عەلی وتی: هێشتا منداڵە... عومەر پێی وت: ئەی باوکی حوسەین پێم بدە کەس نیە وەك من چاوی لە رێزداریەکەی بێت.

عومەر خواستی و زەیدی کوڕی عومەری گەورەو روقیەی کچی عومەری لێ بووە..

ئوم کەلسوم-خوا لێی رازی بێت- وتاربێژێکی لێهاتوو بوو.

عومەر لە هاتندا بوو بۆ کۆڕی کۆچکاران کە لەنێوان گڵکۆی پێغەمبەر و دوانگەکەیدا دانیشتبوون، پاشان عەلی و عوسمان و زوبێر و تەڵحە و عبدالرحمن ی کوڕی عەوف هاتن، عومەر هەر شتێك رووی لێ بکردایە، دەهات هەواڵی پێدەدان و لەبارەیەوە پرس و راوێژی پێ دەکردن.

عومەر وتی: کۆم بکەنەوە، وتیان: بەکێ ئەی ئەمیری باوەڕداران، وتی: بە کچی عەلی کوڕی ئەبوطالب.. ئەمجا وتی: لە پێغەمبەری خوامﷺ بیستووە فەرمووی: هەموو رەچەڵەك و بنەچە و ژن و ژنخوازییەك لە رۆژی قیامەتدا دەپچڕێت تەنها رەچەڵەك و ژنخوازی من نەبێت، منیش رەچەڵەك و بنەچەم

هەبوو لەگەڵ پێغەمبەرﷺ دەمەوێ ژنخوازیشی بخەمە پاڵ، ئەوانیش هاوکاریان کرد و کارەکەیان پێکهێنا و، لە مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی (١٧)ی کۆچیدا گواستیەوە.[١]

# فاتیمەی کچی حوسەینی کوڕی عەلی

یەکێکە لە راویەکانی فەرمودە و.. بە (مرسل) لە فاتیمەی داپیرەی و باوکی و (زەینەب)ی پووری و، بیلال و عبدالله ی کوڕی عەباس و، ئەسمای کچی عەمیس و عائیشەی دایکی ئیمانداران و کەسانی دیکەوە فەرمودەی گێڕاوەتەوە..

عبدالله و ئیبراهیم و حوسەینی کوڕی و، دایکی جەعفەری بەنو حەسەنی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی و کەسانی دیکە فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە.

ئەبوداود و ترمذی و ابن ماجە ریوایەتەکانیان هێناوەتەوەو، (ابن حبان)یش لە متمانەپێکراوەکانیدا باسی کردووە..

کاتێ (حوسەین)ی باوکی کوژرا.. وتی: ئەی یەزید ئایا کچانی پێغەمبەری خوا غەنیمە و کەنیزەکن؟

---

[١] لە کتێبی (نساء فاضلات)ی عبدالبدیع صقر وەرگیراوە بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە.

یەزید وتی: نەخێر بەڵکو ئازاد و رێزلێگراون و بچۆ ژوورەوە بۆ لای کچە ئامۆزاکانت دەبینیت ئەوەی کە تۆ کردوتە ئەوانیش کردویانە، ئەمجا فاتیمە چووە ژوورەوە بۆ لایان لە نەوەکانی سوفیان کەسی نەبینی نەگری، حەسەنی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوطالب خواستوویەتی.

لە دوای مردنی عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی عوسمانی کوڕی عەففان، عبدالرحمن ی کوڕی ضحاکی فەهری خوازبێنی کرد، کە ئەو کاتە کاربەدەستی مەدینە بوو.. فاتیمە وتی: سوێند بەخوا شوکردنم ناوێت و بەدیار ئەم کوڕانەوە دادەنیشم..

فاتیمە کچی حوسەین لەلای عومەری کوڕی عبدالعزیز- کە رێزێکی زۆری هەبوو لای- باسی کردووە کە ئەو ئاشنای خراپە نیە، عومەریش وتی: ئاشنانەبوونی بە خراپە بۆتە هۆی دوورخستنەوەی لە خراپە.

فاتیمە لەسالی ١١٠ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.[١]

[١] لە کتێبی (نساء فاضلات)ی عبدالبدیع صقر وەرگیراوە بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە.

# سوکینەی کچی حوسەینی کوڕی عەلی

خاتونێکی پایەداری خاوەن ڕێز و پایە بوو، لەتەك پایەبەرزانی قوڕەیش دادەنیشت و شاعیر و نووسەرانی لەلا کۆدەبووەوە و ئەوەی کە لەلایان گەلاڵە بووبوو دەیانخستە بەردەمی، ئەویش گفتوگۆی لەسەر دەکرد و بەهێز و لاوازی بۆ جودا دەکردنەوە، بەهۆی بەهێزی بەڵگە و فراوانی شارەزاییەوە وتوێژێکی زانستی لەگەڵ هەڵەکاردا ساز دەکرد بەجۆرێ کە دان بنێت بە هەڵەکەیدا.

سوکینە چەند شوویەکی کردووە، لەوانە عبداللە ی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی ئامۆزای و، موصعەبی کوڕی زوبەیر و، عبداللە ی کوڕی عوسمانی حوزامی و، زەیدی کوڕی عەمری کوڕی عوسمان و، هەروەها ئەصبەغی کوڕی عبدالعزیزی کوڕی مەروان و، ئیبراهیمی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عەوف.. کە ئەم دوانەیان نەیانگواستبوەوە.

لەگەڵ موصعەبی کوڕی زوبەیری مێردیدا بەشداری شەڕی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانی کردووە..

سوکینە خۆڕاگر و داوێن پاك بوو.. بەڵام لە ئافرەتە دیارە قسەخۆش و گاڵتەو گەپکارەکان بوو، پێی وتراوە: ئەی سوکینە! تۆ فاتیمە دایکتە و ئاوەهاش گاڵتەوگەپ دەکەیت، لە کاتێکدا خوشکەکەت واناکات؟! ئەویش وتی: لەبەر ئەوەیە ئەوتان بەناوی داپیرە باوەڕدارەکەیەوە ناوناوە (فاتیمە) و، منیشتان بەناوی ئەو داپیرەیەوە ناوناوە کە ئیسلامی پێنەگەیشتووە و مردووە، مەبەستی پێی ئامینەی کچی وەهەب بوو..

سوکینە هەواڵی نارد بۆ لای سەرۆکی پۆلیسەکان کە شامییەك هاتۆتە ماڵەکەیەوە، پۆلیس بنێرە بۆ لامان، کاتێ پۆلیسەکە هاتە دەرگاکەیان فەرمانی کرد بۆیان کردەوە و فەرمانی بە یەکێك لە کەنیزەکانی کرد، ئەویش کێچێکی بۆ دەرهێنا و، پێی وت: ئەمە ئەو شامییەیە کە سکاڵامان لەدەستی کرد، پۆلیسەکانیش دەستیان بە پێکەنین کرد و چوونەوە.

ئافرەتێکی زۆر ئارامگریش بوو، دوومەڵێك لەژێر چاوی سوکینە دەرهاتبوو تا وای لێهات گەورە بوو، پاشان هەموو روخسار و چاوی و ئێسکەکانی گرتەوە، سوکینەش بەو کەسەی چارەسەری دەکرد وتی: ئەرێ نازانیت ئەمە چیە تووشم بووە؟ ئەویش وتی: ئایا لەسەر ئازارەکەی ئارام دەگریت تا بۆت هەتوان دەکەم؟ وتی: بەڵێ.. ئەویش هات و رایکشاند و هەموو پێستی دەم و چاوی درِی و لەژێرەوە گۆشتەکەی لێ هەڵکەند تا ئێسکەکانی دەرکەوت، شتێ لەژێر گلێنەیەکیدا بوو، گلێنەکەی بەرز کردەوە تا خستیە لایەکیەوە پاشان دومەڵەکەی لە ژێرەوە ڕادا تا هەمووی رۆیشت، پاشان گلێنەکەی گەڕاندەوە شوێنی خۆی، لە کاتێکدا کە سوکینە بێ جوڵانەوە و نکەنك لەبەردەمیدا راکشابوو، هەتا تەواو بوو لەوەی کە دەیویست و ئەوانەی لابرد و چاك بووەوە.

سوکینە لەگەڵ کەس و کارەکەیدا پاش کوژرانی باوکی چوونە دیمەشق و پاشان بەرەو مەدینە رۆشتن..

لە باوکیەوە فەرمودەی گێڕاوەتەوە و، (فاید مەدەنی خزمەتکاری عبیداللە ی کوڕی ئەبورافع) و خەڵکی کوفە فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە..

لەشاری مەدینەی لە پێنجی مانگی ربیع الاول ی ساڵی ١١٧ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.[1]

---

[1] لە کتێبی (نساء فاضلات)ی عبدالبدیع صقر. وەرگیراوە بە پوختەکراوی و دەستکاریەوە.

# نەفیسەی کچی حەسەنی کوڕی زەیدی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی

لە پێشەنگەکانی پەرستش و چاکسازی و خۆپارێزی(ورع) بـوو.. سـاڵی ١٤٥ی کۆچی لە شاری مەککە لەدایك بـووە و، لەشـاری مـەدینـە گـەورە بـووە و، پاشـتر لەگەڵ ئیسحاقی کوڕی جەعفەر صادقی هاوسەریدا چۆتە میسر..

نەفیسە قورئانی پیرۆز و تەفسیرەکەی لەبـەر بـووە، دەگێڕنـەوە کـە ئیمـامی شافعی کاتێ چۆتە میسر، رۆشتووە بۆ لای و گـوێی لـە فـەرموودەکانی گرتـووە، هەروەها نەفیسە (رەحمەتی خـوای لێبـێ) زۆر دەگریـا و بـەردەوام شـەونوێژی دەکرد و بە رۆژدا بـەڕۆژوو بـوو، لـە سـێ شـەودا یـەك جـار نـانی دەخـوارد، لـە تەمەنیشیدا سێ جار حەجی کردووە و خۆی بە پەردەکانی کەعبەوە دەنوساند و بەکوڵ دەگریا.

زەینـەبی کـچی یـەحیا متـەوج دەڵـێ: چـل سـاڵ خزمـەتی نەفیـسەی پـورم کردووە، هەرگیز نەمبینیوە شەو بنوێت و بە رۆژدا رۆژووی شکاندبێت، منیش پـێم وت: ئـەی نەفیـسە، ئـەرێ بـەزەییت بـە خۆتـدا نایەتـەوە؟! وتـی: چـۆن بــەزەییم بێتــەوە بــە خۆمــدا کــە کۆســپی وەهــام لەپێــشدایە تــەنها بــراوە و سەرکەوتوەکان دەتوانن بەسەریدا بڕۆن.

بیشری کوڕی حارسی مامی زۆر سەردانی دەکرد، جارێکیان بیشر نەخۆش کەوت، نەفیسە هاتە سەردانی، لەکاتێکدا کە ئەم لای بوو، پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هاتە سەردانی، سەیری نەفیسەی کرد، پێشەوا ئەحمەد لە بیشری پرسی: ئەمە کێیە؟ بیشر وتی: ئەوە نەفیسەیە، هەواڵی پێگەیشتووە کە نەخۆشم هاتۆتە سەردانم.

پێشەوا ئەحمەد بە بیشری وت: داوای لێ بکە بپاڕێتەوە بۆمان، بیشر پێی وت: لەخوا بپاڕێوە بۆمان، ئەویش وتی: خودایا بیشری کوڕی حارس و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل پەنات پێدەگرن لە ئاگری دۆزەخ، تۆش ئەی (أرحم الراحمین) پەنایان بدە.

نەفیسە ئافرەتێکی خاوەن سامان و چاکەمەند بوو بەرانبەر نەخۆش و گەڕەکان، بەرانبەر پێشەوا شافیعیش زۆر چاك بوو کاتێ هاتە میسر، کاتێکیش شافیعی کۆچی دوایی کرد فەرمانی کرد جەنازەکەی بهێننە لای ئەوانیش هێنایان و نوێژی لەسەر کرد.

پاش ئەوەی کە حەوت ساڵ لە میسر مایەوە نەخۆش کەوت و، نامەی نارد بۆ ئیسحاقی هاوسەری و بە دەستی خۆی لە نێو ماڵەکەیدا گۆڕی هەڵکەند، هەموو جارێ دەچووە ناوی و زۆر نوێژی دەکرد، بەردەوام بەم جۆرە دەچووە ناوی و نوێژی زۆر دەکرد و قورئانی دەخوێند و بەکوڵ دەگریا هەتا لە ساڵی ٢٠٨ی کۆچیدا لە کاتێکدا کە بەرۆژوو بوو مەرگ بووە میوانی، زۆریان لێکرد رۆژووەکەی بشکێنێت، زۆریان پێوت و لێیان دووبارەکردەوە، وتی: زۆر سەیرە، پاش سی ساڵ رۆژوو بشکێنم.. لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە لەکاتێکدا بەرۆژوم پێی شاد ببم.. ئەرێ ئێستا بیشکێنم، ئەمە نابێت، پاشان سورەتی (الانعام)ی خوێند، شەو داهاتبوو، کاتێ گەیشتە ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿لَهُمۡ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ رَبِّهِمۡۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ : ئـــەو كەســـانە لـــە پـەروەردگاری خۆیانـەوە شـوێنەكەیان ئـەنوای هێمنایـەتی دەبـێ و لـە بەرانبـەر كارەكەیان دۆستایەتی ئەویان هەیە.﴾الأنعام/١٢٧.

گیانی پاكی بەرەو لای پەروەردگاری گەڕایەوە و لەلای رۆژهـەڵاتی باشـووری شاری قاهیرە لە میسر بەخاك سپێردرا.[١]

---

[١] لە كتێبی (نساء فاضلات)ی عبدالبدیع صقر. وەرگیراوە بە پوختەكراوی و دەستكاریەوە.

# بەشی پێنجەم

# هاوەڵانی ئافرەت

+ ئەسمائی کچی عەمیس.
+ خەولەی کچی سەعلەبە.
+ئوم شورەیك.
+ ئوم کەلسومی کچی عوقبە.
+ ئەروای کچی عبدالمطلب.
+ فاتیمەی کچی خەتاب.
+ فاخیتەی کچی ئەبوطالب
+ ئەسمائی کچی یەزیدی کوڕی سەکن.
+ عاتکەی کچی زەیدی کوڕی عەمر.
+ فاتیمەی کچی ئەسەدی کوڕی هاشم.
+ موعاذەی کەنیزەکی عبدالله ی کوڕی ئوبەی.
+ ئەمیمەی کچی رەقیقە.
+ ئوم حەرامی کچی مەلحەم.

+ بیسرەی کچی صەفوانی کوڕی نەوفل.

+ زەینەبی کچی ئەبوسولمای مەخزومی.

+ ئوم رومان کچی عامری کەنانی.

+ ئوم حەکەمی کچی ئەبوسوفیان.

+ ئوم عەلای ئەنصاری.

+ شیفائی کچی عبداللە.

+ خەیرەی کچی حدرەد (ئوم دەرداء).

+ خەولەی کچی حەکیمی کوڕی ئومەییە.

+ ئوم ذری غیفاری.

+ روبەیعی کچی مەعوذی ئەنصاری.

+ ئوم کەلسومی کچی ئەبوبەکر.

+ ئەم وەرەقەی کچی عبداللە ی ئەنصاری.

+ ئومەییەی کچی قەیسی ئەبو صەڵت.

+ هیندی کچی عوتبەی کوڕی رەبیع.

+ئوم حەمیدی ئەنصاری.

# ئەسمای کچی عەمیس

## لە چاکترین خوشکە موسڵمانە نەمرەکان

هێندە ئازا و قسە لەڕوو، ئارەزوومەندی حەق بوو کە وای لێ بکات لە دەستەی یەکەمی موسڵمانە پێشەنگەکان بێت کە کۆچیان کرد.

زۆرێك لە پیاوانی ناودار و فێرخوازانی حەق و کۆڵەکەکانی ئاین فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە ، لەوانە قاسمی کوڕی عبداللە ی کوڕی جەعفەر و، قاسمی کوڕی موحەممەد و، سەعیدی کوڕی موسەیەب و، عروەی کوڕی زوبەیر..

بەهۆی چاکە و پاك ژینی و توانینی ئاشنابوونی زانستی ریوایەت و نهێنیەکانی هاتنەخوارەوە و لێکدانەوەوە وای لێ کردبوو کە هاوەڵانی پایەدار و بەتەمەن دەهاتنە لای و بیروبۆچوونیان وەردەگرت و لێوەی فێردەبوون، تەنانەت ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتابیش ﷺ دەچوو بۆ لای و داوای لێکدانەوەی خەوەکانی لێدەکرد.

ئەسما-رەزای خوای لێ بێ- بەتواناترین کەس بوو لە حۆگرتندا لەکاتی وتارداندا، یان لەکاتی چارەسەرکردنی گرفتێکدا کە رووی بدایە، هەر ئەو بوو لاشەی مێردەکەی خۆی شوشت کە ئیمامی ئەبوبەکری جێنشینی پێغەمبەری

خواﷺ بوو لەسەر راسپاردەی خۆی، كاتێ هەواڵی كوژرانی موحەممەدی كوڕی ئەبوبەكری كوڕیشی پێگەیشت، خواپەرستانە و دونیانەویستانە و ئارامگرانە و لەلای خودا حیساب بۆ كراوانە لەسەر بەرماڵەكەی مایەوە.

خوای گەورە لە چارەی نووسیبوو كە رێزی شووكردن بە گەورە هاوەڵانی وەك جەعفەری كوڕی ئەبوطالب و، ئەبوبەكری صدیق و، عەلی كوڕی ئەبوطالب-خوا لە هەموویان رازی بێت- بە دەست بهێنێت.

منداڵیشی لێیان بوو بوو، ئەسما لەو ئافرەتانە بوو كە زۆر منداڵیان بووە و، لە هەمووشیان پتر خاوەنی راوبۆچوونی چاك و دروست بووە و، لە هەمووشیان زیاتر تەقوادار بووە لە ئاینی خوادا.[1]

---

[1] لە كتێبی (میسرة وجهاد الداعیة زینب الغزالي) ئامادەكردنی (ابن الهاشمی) بە كورتكراوەیی و دەستكاریەوە وەرگیراوە.

# خەولەی کچی سەعلەبە

## گفتوگۆکاری ئامۆژگاریکار

هاوەڵێکی پایەدار و، هاوسەری ئەوسی کوڕی صامتی ئامۆزایەتی، ئەوس زوو موسڵمان بوو بوو، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداری بەدر و ئوحود و، خەندەق و، هەموو ڕووداوەکانی دیکەی کردبوو.

خەولە نموونەی ئافرەتی چاکەکار و، هاوسەری ئەمەکدار و، دایکێکی پێشەنگی پەروەردەکار بوو.. کوڕەکانی لەسەر بەجەرگی پەروەردە کردبوو، ڕایهێنابوون لەسەر هەڵمزینی تەپ و تۆزی جەنگەکان و، مەشقیشی پێکردبوون لەسەر وەشاندنی شمشێر و لێدانی ڕمەکان.

کاتێ مێردەکەی چووە تەمەنەوەو، پیر بوو، تووشی خەڵەفان بوو، هەندێجار لێی بەئاگا دەهاتەوە و کەمێك هۆشی دەهاتەوە سەر خۆی، لە کاتێکدا هاتبووەوە سەر هۆشی خۆی بە خەولەی خێزانی وت: (پشتی تۆ لەسەرم وەك پشتی دایکمە).. پاشان پەشیمان بووەوەو بە خێزانەکەی وت: وابزانم تازە تۆ لەسەر من حەرامیت..

خەولە پێی وت: ناوی تەڵاقت نەهێناوە، ئەو حەرام بوونەش بەر لەوەی خوای گەورە پێغەمبەر ﷺ بنێرێت بۆمان لەنێوماندا باوبوو.

بەڵێ.. هاوسەرێکی زۆر ژیر بوو، بە هەموو شێوەیەك سوور بوو لەسەر تێك نەچوونیماڵەکەی و، نەفەوتانی منداڵەکانی و، جیانەبوونەوەی هاوسەرەکەی سەرەڕای پیربوون و توندوتیژی هەڵسوکەوتی.

پاشان خەولە چووە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ لە ماڵەکەی عائیشە و پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوس باش دەناسیت، باوکی منداڵەکانمە و ئامۆزاشمە و، خۆشەویستترین کەسە لام، خۆت دەزانی تووشی کەمێك خەڵەفان بووە، قسەیەکی کردووە، بەڵام سوێند بەو خوایەی قورئانی بە حەق بۆ ناردووی ناوی تەڵاقی نەهێنا، تەنها پێی وتم: پشتت لەسەر من وەك پشتی دایکمە.. پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: وای دەبینم کە تۆ لەو حەرام بوویت.

گفتوگۆی لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ کرد و دووبارەی کردەوە، پاشان وتی: خودایە من سکاڵای تەنگانە و، سەختی جیابوونەوەم لێی لەلای تۆ دەکەم، خودایە شتێك بۆ سەر زمانی پێغەمبەرەکەت بنێرە خوارەوە دەرووی منی تێدا بێت..

عائیشە دەڵێت: دەستی کرد بە گریان و ئەوەشی لەوێدا لەگەڵماندا بوو لە کەس و کار هەموو گریان، بەزەییان هاتەوە پێیدا، جا لە کاتێکدا کە ئەو بەوجۆرە لە خزمەت پێغەمبەری خواداﷺ بوو، قسەی لەگەڵ دەکرد، لە ئاسمانەوە نیگا دابەزی..

هێشتا پشتی هەڵنەکردبوو بڕوات، پێغەمبەرﷺ بە زەردەخەنەوە پێی فەرموو: ئەی خەولە.. وتی: بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا.. پێی فەرموو: خوای گەورە لەبارەی تۆ و هاوەڵەکەت ئایەتی ناردۆتە خوارەوە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ يُظَـٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَـٰتِهِمْ ۖ إِنْ أُمَّهَـٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّـٰٓـِٔى

وَلَدْنَهُمْۚ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ
يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ
وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمْ
يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًاۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ وَلِلْكَٰفِرِينَ
عَذَابٌ أَلِيمٌ: **خودا قسەی ئەو ژنەی بیست كە سەبارەت بە مێردەكەی لەگەڵ تۆ كێشەی دەكرد و گازاندەی لای خودا دەكرد، خودا دەیبیست كە ئێوە وتوێژتان بوو، خوداش بیسەر و بینایە.. ئەو كەسانەی لەناو ئێوە بە ژنی خۆیان دەڵێن تۆ دایكمی؛ ژنەكان نابن بە دایكیان، هەر ئەو ژنانە دایكیانن كە ئەوانیان بووە؛ ئەوان قسەی خراپ دەكەن و بوختانە هەڵی دەبەستن. خودا لەگوناه دەبورێ و خەتاپۆشە.. جا ئەوانەی بە هاوسەری خۆیان دەڵێن تۆ دایكمی و پاشی پەشیمان دەبنەوە، بەر لەوەی پێكەوە بنون، ئەشێ كۆیلەیەك ئازاد بكەن، خوا ئاوا ئامۆژگاریتان دەكا، خودا لە هەركارێ دەیكەن ئاگادارە.. هەركەس نەیبوو با دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بێت، بەر لەوەی بە یەكتر بگەن. كەسێ ئەمەشی نەتوانی، خۆراك بە شێست هەژار بدا. ئەمە بۆیە كە باوەڕتان بە خوا و پێغەمبەری هەبێ و ئەمە سنوری خودایە. بۆ ئەوانەش كە خودایان نەناسیوە، ئازارێكی بەژان هەیە.﴾المجادلة/١-٤.**

**پاشان خەولە دەڵێت: پێغەمبەری خوا پێی فەرمووم: ((فەرمانی پێبكە بەندەیەك ئازاد بكات..**

**وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بەندەی نیە تا ئازادی بكات.**

**فەرمووی: دەی با دوو مانگ بەرۆژوو بێت بەسەر یەكەوە.**

**دەڵێت: وتم: سوێندم بەخوا پیرە و توانای رۆژووگرتنیشی نیە.**

**فەرمووی: دەی با شەست هەژار تێر بكات بە بارێك خورما.**

دەڵێت: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەشی نیە.

پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئێمە بە دۆشاوی خورما یارمەتی دەدەین.

دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا، منیش بە هەندێك دۆشاوی خورما هاوکاری دەکەم.

فەرمووی: پێکات و چاکت کرد، دە بڕۆ لەبری ئەو بیبەخشە، پاشان بە چاکی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئامۆزاکەتدا بکە.

دەڵێت: منیش وام کرد.

خۆشی و شادی گەڕایەوە بۆ خەولە، بەڵام زۆری نەبرد و ئەوسی مێردی کۆچی دوایی کرد، لەپاش مردنی مێردەکەی لەسەر خوداپەرستی و، بەزەیی پێداهاتنەوەی ژیاو، داوای لێبوردن و لێخۆشبوونی بۆ دەکرد لە پەروەردگار.

لەسەردەمی جێنشینی عومەری کوڕی خەتابدا (رەزای خوای لێبێت) رۆژێکیان عومەر لەگەڵ چەند هاوەڵێکدا لە مزگەوت هاتنە دەرەوە، ئافرەتێك هاتە سەر رێگاکەی و، سڵاوی لە عومەر کرد، عومەریش وەڵامی دایەوە، ئەمجا بە عومەری وت: ئای بۆ عومەر لەبیرمە شوانێتی مەڕەکانت دەکرد بە گۆچانەکەت، زۆری بەسەردا رۆیشت تا وات لێ هات ناوت بنێن عومەر، پاشان زۆری نەبرد هەتا ناونرای ئەمیری باوەڕداران. دەسا عومەر لەخوا بترسە لەوەی کە خراوەتە ئەستۆت، ئەوەش بزانە کە هەرکەس لە دوارۆژ و هەڕەشەکان بترسێ، دووری لێ نزیك دەکاتەوەو هەرکەس لی مردن ترسا کات بەفیڕۆدانی لانامێنێت.

ئەو هاوەڵەی کە لەگەڵ عومەردابوو، وتی: ژنەکە زۆر بڵێیت کرد بەرانبەر ئەمیری باوەڕداران، ئەمجا عومەر پێی فەرموو: وازی لێ بێنە، دەڵێی نایناسیت؟ ئەوە خەولەی کچی سەعلەبەیە، هاوسەری ئەوسی کوڕی صامت، کە خوای

گەورە گوێبیستی قسەکانی بوو لە سەرووی حەوت ئاسمانەوەو، جا سوێند بەخوا عومەر زۆر رەواترە کە گوێ لە قسەکانی بگرێت.

خەولە هەروەك چۆن نموونەی ئافرەتی بڕواداری بە تەقوا و، هاوسەری دڵسۆز و ئەمەکدار بوو، بە هەمان شێوە وێنەیەکی شەنگی ئافرەتی موسڵمانی بوێری ئامۆژگاریکار بوو، کاتێ عومەری ئەمیری باوەڕدارانی راگرت تا ئامۆژگاری بکات بەوەی تەقوای هەبێت لەوەی کە خوای گەورە خستویە ئەستۆی لە کاروباری موسڵمانان و بەرژەوەندیەکانیان.

خودا لە عومەر رازی بێت لەنێو خەلیفە تەقوادارەکانداو، خوداش رەحم بە خەولە بکات، لەنێو ئافرەتانی چاکەکاردا.[١]

---

[١] کتێبی (نساء انزل الله فیهن قرآنا)ی د.عبدالرحمن عمیرە، چاپی سێیەم دار اللوا- بۆ پەخش و بلاوکردنەوە، (بەپوخت و کورتکراوەیی)
کتێبی (کرائم النساء)ی احمد محمد جمال

# ئوم شورەیك
## غەزیەی کچی جابر
### خوا لەسەردەستی ئەو هیدایەتی هۆزەکەیدا

ئافرەتێکی بڕوادارو، موهاجیری ئارامگرە، لەپێناو ئیسلامەکەیدا زۆر ئەشکەنجەی چەشت، تا واز لە ئایینی یەکتاپەرستی بهێنێت، بەڵام کۆڵی نەدا.. خوای گەورەش ڕێزی لێناو لە چنگی ئەشکەنجەو سزا دەربازی کرد.

ئەو لە هۆزی دەوس بوو، مێردەکەی کۆچی کرد بۆ شاری مەدینەو ئوم شورەیك بە تەنها لە ماڵی خۆی مایەوە تا دەگەڕێتەوە بۆ لای، ئەوان لەسەردەستی (توفەیلی کوڕی عەمری دەوسی) ڕەزای خوای لێ بێ، ئیمانیان هێنابوو، خزمەکانی مێردەکەی هاتنەلای و، لە ماڵەکەی دەریانکرد، هەڕەشەی سزاو ئەشکەنجەی سەختیان لێکرد گەر واز لە ئایندارییەکەی نەهێنێت، بەڵام ئەم رازی نەبوو، جا هاتن لەسەر سەرشێت ترین حوشتریان دایانا و، نان و هەنگوینیان دەرخوارد دەداو ڕێگەیان نەدەدا کە ئاو بخواتەوە، کاتێ ڕۆژ دەگەیشتە نیوەڕۆ و گەرما تینی دەسەند، بەتەنها بەجێیان دەهێڵا، تا گەرمای نیوەڕۆ بیسوتێنێ، سێ ڕۆژ وایان لێکرد، پاشان هاتنەوە لای و داوایان لێکرد کە

دەستبەرداری ئاینەكەی بێت، ئەویش بە پەنجەكانی ئاماژەی بۆ ئاسمان دەكرد كە یەكتاپەرستە.

ئوم شورەیك (رەزای خوای لێ بێت) دەڵێت:

سوێند بەخوا من هەر لەسەر ئەم شێوەیە بووم، ماندوبوون و تینویەتیم گەیشتە ئەوەی بینیم گۆزەیەك لەسەر سنگمە، سەرنجم دا گۆزەی ئاوە، منیش هەڵمگرت و كەمێكم لێ خواردەوە، پاشان بەرزكرایەوەو لێم وەرگیرایەوە، سەیرم دەكرد بینیم وا لەنێوان ئاسمان و زەویدا هەڵواسرابوو، پاشان دوبارە گەڕایەوەو كەمێكم لێ خواردەوە، دواتر بەرز بویەوە، سەرنجم دایەوە، لەنێوان ئاسمان و زەویدا هەڵواسرابوو، بۆ جاری سێیەم گەڕایەوەو لێم خواردەوە، هەتا تینویەتیم شكاو ئاوەكەی دیكەم كرد بە سەر جەستە و جل و بەرگەكانمدا.

كاتێ هۆزەكەم خەبەریان بویەوە، سەرنجیان دا و وتیان: ئەمەت لەكوێ بوو، ئەی دوژمنی خوا؟

منیش پێم وتن: دوژمنی خودا ئەو كەسەیە كە سەرپێچی ئاینەكەی بكات نەك من، لەبارەی ئەوەش كە دەڵێن لەكوێت بوو، ئەوە بزانن لەلای خوداوە هاتوەو، خوای گەورە پێی بەخشیوم.

پاشان رۆشتن و سەیری گۆزەو كوندەی ئاوی خۆیان كرد و بینیان هەروەك خۆیەتی، چۆنیان بەجێهێشتبوو هەروابوو، هەربۆیە دەست بەجێ موسڵمان بوون و وتیان، شاهێدی دەدەین كە پەروەردگاری تۆ خودامانەو، ئەو زاتەی ئەوەی پێ بەخشیت كە پێی دایت لەم جێگایەدا، پاش ئەوەی كە ئێمە بەسەرمان هێنایت، هەر ئەو زاتەیە كە ئاینی ئیسلامی بۆ دارِشتوین.

هەموویان موسڵمان بوون و، كۆچیان كرد بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، كاتێ رۆشنایی ئیمانیان بۆ روون بوویەو، رێگای هیدایەتیان بۆ ئاشكرابوو، كۆچیان كرد..

ئەوە كردەوەی ئەو ئافرەتە بێ دەستەڵاتانەیە كە تەنها دەستیان بەرێزی خۆوە گرتبوو، هانایان تەنها بۆ هێزی باوەڕ دەبرد.

بە راستی ئافرەتێك بوو، خوای گەورە ویستی خۆڕاگری و جەسوورییەكەی بەردەوامی پێ بەخشی و، دڵێكی ئاوەدان بە ئیمان و متمانەیەكی تەواو بەرز بە خودای پێدرا بوو، ئەویش دەستی بە هیدایەتی پەروەردگاریەوە گرت و، خوای گەورەش لەسەر دەستی ئەمدا هیدایەتی هۆزەكەیدا.[١]

---

[١] لە كتێبی (میسرة وجهاد الداعیة زینب الغزالي) ئامادەكردنی (ابن الهاشمی) بە كورتكراوەیی و دەستكاریەوە وەرگیراوە.

# ئوم کەلسوم بنتی عوقبە

## ئافرەتێکی بڕوادار هەروەک قورئان ناوی نا

کۆچکارێکی پایەدارە و، زۆر زوو لە شاری مەککە موسڵمان بوو و، بەر لە کۆچ پەیمانی دا بە پێغەمبەرﷺ و، لە ئاگر بەستی حودەیبیەشدا لەگەڵ موسڵمانانندا هاتە دەرەوە و... هیچ ئافرەتێکی قورەیشی موسڵمان نەبوو کە لە نێو ماڵی باوك و دایکیدا کۆچی کردبێت جگە لەم... بڕوادار و گوێڕایەڵ و، هاوسەرێکی ئارامگر و، دایکێکی میهرەبان بوو بەرانبەر بە منداڵەکانی، دڵ و دەروونی ئاشنای رێبازی ئیمان بوو، ئەمیش بۆ ئەو ئیمانە ژیا و، شاری مەککەی بەو هەموو چەم و دۆڵەیەوە لەبەرچاو تەنگ بوویەوە و، بەرەو لای پەروەردگاری هەڵهات و هیجرەتی کرد و، کەژاوەو نشینگە ئارامەکەی خۆی بەجێ هێشت و، لە ژێر باڵی شەودا، تەنها و دەربەدەر بەسەر چیا و کێوەکانی نێوان مەککە و مەدینەدا بە پێ رێگای بڕی، رۆیشت بەرەو شوێنی ئاینەکەی و خانەی هیجرەت بۆ کراوی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری یەسریب...

وەلید و عمارەی برایشی کەوتنە شوێنی، تا لە ئیسلام پاشگەزی بکەنەوە، خوای گەورەش بە ئیسلامەتیەکەی پاراستی و، ئەم ئایەتەی لەسەر ناردە خوارێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ﴾: ئەی گەلی باوەڕداران، ئەگەر ژنی بەباوەڕی ئاوارە دەگاتە لاتان، بیانخەنە بەر ئەزمونەوە، خوا لە بیروباوەڕەکەیان ئاگادارترە﴾ (الممتحنة ١٠)

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بە خوا راستە...

ئومم کەلسوم لە پێغەمبەری خوا ﷺ و بسرەی کوڕی صەفوانیشەوە دە فەرموودەی گێڕاوەتەوە و، حەمید و ئیبراهیمی کوڕیشی کە لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بوون و، حەمیدی کوڕی نافیع و کەسانی دیکەش فەرموودەیان لە ئومم کەلسوممەوە گێڕاوەتەوە[1]...

---

[1] (نساء أنزل فيهن قرآنا) د.عبدالرحمن عميرة.
(نساء فاضلات) عبدالبديع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).
عبدالرحمن عميرة...(بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# ئەروای کچی عبدالمطلب

## پووری پێغەمبەری خوا

ئەو خوشکی حەمزەی سەرداری شەهیدان بوو (ﷺ)، ئەروا لە شاری مەککە موسڵمان بوو، کۆچیشی کرد بۆ شاری مەدینە و، بەر لە موسڵمان بوونی بە دەم پشتیوانی لە پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد و، کوڕەکەی خۆی هان دەدا کە پشتی بگرێت و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بێت.

کاتێ (کلیبی کوڕی عومەیر)ی کوڕی لە ماڵی ئەرقەم موسڵمان بوو، پێی وت: ڕەواترین و چاکترین کارت کرد کە بویتە پشتیوان و هاوکاری خاڵۆزاکەت سوێند بە خوا ئەوەی بە پیاوان دەکرێت لە توانای ئێمەشدا بوایە شوێنی دەکەوتین و بەرگریمان لێ دەکرد.

ئەبو جەهل پێی وت: نابینی کلیبی کوڕت خۆی کردۆتە پارێزگاری موحەممەد؟ ئەروا پێی وت: باشترین ڕۆژگاری ئەو ڕۆژەیە کە پارێزگاری لە خاڵۆزاکەی دەکات، کە لە لای خوای گەورەوە حەقی هێناوە، پێیان وت: تۆش شوێنی موحەممەد کەوتیت؟ وتی: بەڵێ.. کاتێ ئەبوجەهل هەواڵی موسڵمان بوونی بیست، چوو بۆ لای و پێی وت: زۆر سەیرم دێ لە تۆ بەوەی شوێنی موحەممەد کەوتویت و ئاینی عەبدولموتەڵیبت واز لێ هێناوە، ئەروا وتی: ئەوە

لە کۆن دا بوو، هەستە تۆش پشتی برازاکەت بگرە و بەرگری لێ بکە، ئەگەر کارەکەی سەربکەوێت، تۆ ئەومت لە بەردەمدایە یا بچیتە سەر ئاینەکەی یان ئەو لەسەر ئاینی تۆ بێت، خۆ گەر تیاچوو ئەوا بە هانەت دەبێت لەسەر برازاکەت و قسەت لەسەر نامێنێ...

ئەروا لە ساڵی ١٥ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد[١].

---

[١] لە کتێبی (نساء فاضلات)ي عبدالبدیع صقر...وەرگیراوە بە (کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# فاتیمەی کچی خەتتابی کوڕی نوفیل

لە ئافرەتە هەرە چاکەمەندەکانە، لە زووەوە موسڵمان بوو، بەر لە عومەری کوڕی خەتتابی برای و، ئیسلامەتیشی بە چاکی وەرگرت و، پەیمانی دا بە پێغەمبەر (ﷺ)، جا لەوانە بوو کە لەسەرەتاوە پەیمانیان دا و، موسڵمان بوونەکەشی لە عومەری برای دەشاردەوە لە ترسی زەبر و زەنگەکەی..

رۆژێکیان عومەر شمشێرەکەی هەڵگرت تا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکوژێت، پیاوێکی بەنی زەهرە پێی وت: سەعیدی کوڕی زەیدی زاوات و فاتیمەی خوشکت وازیان لە ئاینەکەت هێناوە، عومەریش بەرەو لایان کەوتە رێ، لەو کاتەدا "خباب کوڕی الارث" (رضي الله عنه) لە لایان بوو و قورئانی پێ دەخوێندن. عومەر چووە ژووری خەباب خۆی شاردەوە، فاتیمەش پەڕەی قورئانەکەی خستە ژێر رانیەوە، عومەر پێی وت: ئەو دەنگوباسە چییە گوێم لێی بووە..

فاتیمە وتی: من هیچم نەبیستووە، وتی: بیستوومە هەردووکتان شوێن ئاینەکەی موحەممەد کەوتوون، پاشان پەلاماری سەعیدی زاوای دا، فاتیمەش هەستا تا لە مێردەکەی دوور بخاتەوە، عومەر لێی دا و سەری شکاند، لێرەدا فاتیمە پێی وت: بەڵێ موسڵمان بووین و ئیمانمان بە خودا و پێغەمبەرەکەی هێناوە و چیت لە دەست دێ درێغی مەکە..

عومەر کاتێ ئەوەی بینی کە بەسەر خوشکەکەی هێنا، سۆز و دڵنەرمی دایگرت و لە رەفتارەکەی پاشگەز بوویەوەو بە خوشکەکەی وت: ئەو پەڕەیەم

بدەرێ، فاتیمە چاوی بڕیبووە موسڵمان بوونی و پێی وت: براکەم تۆ بەهۆی بێ باوەڕیتەوە پاك نیت، ئەم پەڕاوەش دەبێت تەنها کەسانی پاکژ دەستی لێ بدەن، ئەمجا عومەر هەستا و خۆی شۆرد و پەڕەکەیان پێ دا و، ئەم ئایەتەی لە خۆ گرتبوو: ﴿طه ﴿١﴾ مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ ﴿٢﴾ إِلَّا تَذۡكِرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰ: تا، ها، ئەم قورئانەمان بۆ نەناردی کە تووشی چەوسانەوە بی، تەنها بیرهێنانەوەیە بۆ کەسێ کە ترسی هەیە﴾ ئایەتەکانی دەستپێکی سورەتی (طه) بوو[1]...

عومەر فەرمووی: گوتەی زۆر جوانن..لەو کاتەدا خەباب لە حەشارگەکەی هاتە دەرێ و، وتی: ئەی عومەر ئومێدەوارم خوای گەورە خستبیتیە بەر پاڕانەوەی پێغەمبەرەکەی، چونکە دوێنێ گوێم لە پێغەمبەر بوو دەیفەرموو: خودایا ئیسلام بەهێز بکە بەهۆی (ئەبی حەکەمی کوڕی هشام) یان (عومەری کوڕی خەتتاب).. الله الله ئەی عومەر..

ئەمجا عومەر فەرمووی: ئەی خەباب، موحەممەدم نیشان بدە.. دواتر عومەر بەرەو لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشت و لەبەردەمیدا شایەتمانی هێنا و موسڵمان بوو...

خوای گەورە لە عومەر و، فاتیمەی خوشکی و سەعیدی هاوسەری فاتیمە و، خەباب رازی بێت..کە کلیلەکانی ڕێنمایی بوون لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا[2]..

---

[1] سورة طه: ئایەتی/١_٣.

[2] (أعلام النساء) عمر رضا کحالة وەرگیراوە (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# فاختەی کچی ئەبو تالیب

# أم هانئ

لە ئافرەتە چاکەمەندەکانی سەردەمەکەی بوو، خوشکی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو (رضي الله عنه) لە ساڵی ڕزگار کردنی مەککەدا موسڵمان بوو..

لە ڕۆژی ڕزگار کردنی مەککەدا (حارث کوڕی هشام) هانای بۆ ماڵەکەی هێنا تا پەنای بدات، عەلی برای هات بۆ لای و، ئەویش هەواڵی پێدا، عەلی شمشێرەکەی هەلگرت تا (حارث) بکوژێت، فاختەی خوشکی پێی وت: براکەم من پەنام داوە، عەلی گوێی بە قسەکەی نەدا و هەڵمەتی بۆ برد، دەستی گرت و، وتی: سوێند بە خوا نایکوژی، چونکە من دالّدەم داوە، ئیدی عەلی نەیتوانی قاچی لەسەر زەوی بەرز بکاتەوە و، هەوڵی دا ڕزگاری بێت بەڵام نەیتوانی.

ئەمجا پێغەمبەری خودا (ﷺ) هاتە ژوورەوە، فاختە ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە...

پێغەمبەر خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەو کەسەی تۆ دالّدەت دابوو وا دالّدەمان دا و تۆش عەلی تورە مەکە، چونکە خوای گەورە بە تورە کردنی تورە دەبێت، بەری بدە، ئەویش بەریدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی عەلی ژنێک

سەرکەوت بەسەرتدا...عەلی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نەمتوانی قاچم لەسەر زەویەکە بەرز بکەمەوە.

(ئـوم هـانئ) چـل و شـەش فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە و، (أبـو مـره)ی خزمـەتکاری و (عبـدالله کـوڕی عبـاس) و، (عـروە کـوڕی زوبـیر) و کەسـانی دیکەشی فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە[1].

---

[1] لە (أعلام النساء)ی عمر رضا کحالة وەرگیراوە بە پوختە و دەستکاریەوە.

# ئەسمای کچی یەزیدکوڕی سەکەنی ئەنساری

## وتاربێژی ئافرەتان

هاوەڵێکی پایەدارە و، فەرموودە وێژێکی بەڕێز و، تێکۆشەرێکی ئازا بووە لە جەنگی یەرموکدا بە شیشێك کە شاردبویەوە نۆ ڕۆمی کوشت..

دینداریکی ژیر و، وتاربێژێکی تێگەیشتوو بوو، بە جۆرێ نازناوی وتاربێژی ئافرەتانیان لێ نابوو..ڕۆژێکیان هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتێکدا کۆمەڵێك هاوەڵی لە خزمەتتدا بوو، وتی: دایك و باوکم بە قوربانت بێ ئەی پێغەمبەری خوا... من نێردراوی ئافرەتانم بۆ خزمەتت.. خوای گەورە تۆی بۆ پیاوان و ئافرەتان تێکڕا ڕەوانە کردووە، ئێمەش بڕوامان بە خۆت و پەروەردگارەکەت هێنا، جا ئێمەی کۆمەڵی ئافرەتان، سنوردار و بێدەسەڵاتین، دانیشتووی نێوماڵەکانتان و، بەجێهێنەری ئارەزووەکانتان و، هەڵگری منداڵەکانتانین، ئێوەی دەستەی پیاوانیش، لە کۆبوونەوە و نوێژی بە کۆمەڵ و، سەردانی نەخۆش و، بەڕێکردنی جەنازە و، حەج لە دوای حەج و، چاکتر لەوەش تێکۆشان لە ڕێی خودای باڵا دەست دا، فەزڵتان دراوە بەسەرماندا، هەر کاتێ یەکێك لە ئێوە بۆ حەج یان بۆ تێکۆشان دەردەچێ، ئێمە سامانەکەتان دەپارێزین و، جل و بەرگەکانتان بۆ دەچنین و، منداڵەکانتان بۆ بەخێو دەکەین، جا ئێمە لە پاداشتی ئەو کارانەتاندا بەشدارین؟

پێغەمبەر (ﷺ) بە تەواوی ئاوڕی لە هاوەڵانی دایەوە و فەرمووی: ئایا هەرگیز گوێتان لە ئافرەتێك بووە پرسیاری لەمە چاکتر لە بارەی کاروباری ئاینەکەیەوە بکات؟؟ پاشان پێغەمبەر ئاوڕی دایەوە لە أسما و فەرمووی: خاتوون گوێ بگرە و، ئەو ئافرەتانەشی لەگەڵ تۆدان پێیان ڕابگەیەنە چاك هەڵس و کەوتی ژن لەگەڵ مێردەکەی و، شوێنکەوتنی ئەوەی جێی ڕەزامەندیەتی، شوێنی هەموو ئەوانە دەگرێتەوە...

ئەمجا ئەسما بە دڵخۆشیەوە گەڕایەوە

ئەسما هەشتا و یەك فەرموودەی لە پێغەمبەر (ﷺ) گێڕاوەتەوە و، محمودی کوڕی عەمری ئەنصاری خوشکە زای و، موجاهیدی کوڕی جوبەیر فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە و، (أبو داود) و (ترمذي) و (نسائی) و، (ئیبن ماجە) و (مهاجری کوڕی أبی سلم) و (شهری کوڕی حوشب) فەرموودەکانیان تۆمار کردووە..

خوای گەورە ڕەحم بە ئەسمای کچی یەزید بکات و، لێی ڕازی بێت، چونکە ئامۆژگارییەکی زۆر بە نرخی لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) پێشکەش بە ئافرەتان کرد، تا ببێتە چرایەك و لە ژیانی هاوسەرێتیاندا ڕێنماییکاریان بێت[1]...

---

[1] لە (نساء فاضلات)ي عبدالبدیع صقر بە (دەستکارییەوە) وەرگیراوە.

# عاتیکەی کچی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نفیل

## هەرکەسێ دەیەوێ شەهیدبێ باعاتیکە بخوازێ

شاعیرێکە لە شاعیرانی عەرەب، خاوەنی جوانی و تەواومەندی و ڕەوشت بەرزی بوو، بە پەسەندی عەقڵ و بیروڕا پاڕاوی ناسرا بوو..

شووی کرد بە (عبدالله)ی کوڕی (أبو بکری صدیق)، مێردەکەی زۆر ڕێزی لێدەنا و بەرزی ڕادەگرت و، بایەخی پێدەدا، کاتێ باوکی فەرمانی پێ کرد تەڵاقی بدات، هەستا بە تەڵاق دانی، پاشتر زۆر خەفەتی دەخوارد بۆ جیابوونەوەی لە عاتکە، ئەبوبەکریش دڵی بۆی نەرم بوو، لە کاتێکدا ئەو هۆنراوەی بەسەردا هەڵدەدا، فەرمانی پێکرد بیهێنێتەوە، کاتێ هێنایەوە باخێکی پێدا بە مەرجێ پاش ئەم شوو نەکاتەوە، کاتێ بەهۆی ئەو تیرەی بەری کەوتبوو مرد، عاتکە زۆر پەرێشان و غەمبار بوو بۆی، پاشان عومەری کوڕی خەتتاب خوازبێنی کرد، ئەویش باسی باخەکەی بۆ کرد لەگەڵ مەرجەکەی، ئەویش پێی وت: باخەکە بگێڕەوە بۆ کەس و کارەکەی و شوو بکە... ئەمجا شووی بە عومەر کرد.

کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) کوژرا و ماوەی (عیدە)کەی تەواو بوو، زوبێری کوڕی عەوام خواستی و، داوای لێکرد کە نەچێتە دەرەوە بۆ مزگەوت، ئەو کاتە ئافرەتێکی بە تەمەنی قەڵەو بوو، وتی: ئەی زوبێر ئایا ئەتەوێت

بەهۆی غیرە کردنی تۆوە واز لە مزگەوت بێنم کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەبو بەکر و عومەردا نوێژم تێدا ئەنجام داوە؟

ئەمجا زوبێر وتی: ڕێگریت لێ ناکەم.

کاتێ بانگی بەیانی درا، دەست نوێژی گرت و چووە دەرەوە، ئەویش لە سەقیفەی بەنی ساعدە بۆی ڕاوەستا، تێپەڕی دەستی دا لە جلەکانی و، پێی وت: چیتە خوای گەورە دەستت ببڕێت و... گەڕایەوە، کاتێ زوبێر لە مزگەوت گەڕایەوە وتی: ئەی عاتکە ئەوە چی بوو لە شوێنی نوێژ کردنەکەت نەمبینیت؟ وتی: خودا ڕەحمت پێ بکات باوکی عبدالله... پاش تۆ خەڵکی خراپ بووە، ئەمڕۆ نوێژ لە شوێنی خۆت ئەنجامی بدەیت باشترە لەوەی لە ماڵدا بیکەن، لە ماڵیشدا باشترە تا لە حوجرە...

پاش ئەوەی ماوە (عید)ەکەی لە زوبێر کۆتایی هات، عەلی کوڕی ئەبو تالب ناردیە خوازبینی، ناردی بۆ لای و وتی: ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا من وا گومان دەبەم کە بکوژرێیت، عەلی کوڕی ئەبو تالب دەیفەرموو: هەر کەس حەزی لە شەهید بوونی ئامادەیە با عاتکە بخوازێت..

پاشان حوسێنی کوڕی عەلی مارەی کرد، یەکەم کەسیش بوو لە ڕۆژی کوشتنەکەیدا دەم و چاوی لەسەر خۆڵەکە بەرز کردەوە.. پاش ئەوە بێوەژن کەوت، عبدالله کوڕی عومەریش دەیووت: هەر کەس مەبەستی شەهید بوونە با عاتکە بخوازێت.

عاتکە (ﷺ) لە نزیك ساڵی ٤٠ی کۆچی بوو مرد[١].

---

[١] لە (نساء فاضلات)ی: عبدالبدیع صقر وەرگیراوە (بە کورتکردنەوەوە).

# فاتیمەی كچی ئەسەدی كوڕی هاشم

## دایكی عەلی كوڕی ئەبوتالیب

یەكێكە لەو ئافرەتانەی فەرموودەیان ریوایەت كردووە..چل و شەش فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاوەتەوە، ئافرەتێكی چاكەخواز و بە تەقوا بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەردەم لە ماڵەكەی خۆیدا سەردانی دەكرد و، رێزی لێدەگرت و بەرزی ڕادەگرت...كاتێ لە شاری مەدینە وەفاتی كرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) كراسەكەی خۆی لەبەركرد، هەندێ لە هاوەڵانی پێیان وت: نەماندیوە ئەوەی بۆ ئەمت كرد بۆ كەست ئەنجام دابێت؟ ئەویش فەرمووی: لە پاش ئەبو تالیب هیچ كەس هێندەی ئەم بۆم چاك نەبووە.

ئەو لە كۆچكارانی لە پێش بوو..هاشمی بوو، هاشمیشی لێ بوو..خودا لە هەموویان رازی بێت[١]..

---

[١] لە (نساء فاضلات)ی: عبدالبدیع صقر (بە دەستكارییەوە).

# معازە
## کنیزەی عبداللەی کوڕی ئوبەی بن سەلول

موسڵمان بوو.. پەیمانی دا بە پێغەمبەر (ﷺ)، لە لای (عبدالله)ی کوڕی (ئوبەی) دیل بوو، (عبدالله) لێی دەدا تا خۆی بدات بە دەستیەوە و سکی لێی ببێت، تا بەو هۆیەوە فیدیە وەربگرێ، کە خوای گەورە لە بارەی ئەو جۆرە کارەوە دەفەرمێت: (لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا)[1]، جا (معاذە)ش موسڵمان بوو بە قسەی نەدەکرد...

(الزهری) دەڵێت : موسڵمانێکی زۆر پایەدار بوو بۆیە خوا ئەم ئایەتەی لەسەر دابەزاند: (وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ )[2] واتە: کچانتان ناچاری لەشفرۆشی مەکەن، پاشان ئازاد کرا و شووی کرد بە (سهل)ی کوڕی (قرطة)[3].

---

[1] سورة النور الاية/٣٣.

[2] سورة النور الاية/٣٣.

[3] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة (بە دەستکاریەوە). هەروەها سەیری الطبقات (إبن أسعد) بکە.

# ئەمیمەی کچی رەقیقە

یەکێکە لەو ئافرەتانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوە..دەگێڕێتەوە کە لەگەڵ ژمارەیەك ئافرەتدا هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا بەیعەت بدەن، وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا بەیعەتت پێ دەدەین کە هیچ هاوبەشێك بۆ خودا دانەنێین و دزی و زینا نەکەین و، منداڵەکانمان نەکوژین و، بوختان بۆ کەسێك هەڵنەبەستین لە نێوان دەست و قاچماندا و سەرپێچیت نەکەین لە چاکەدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەوەندەی بتوانن و بۆتان بکرێت..دەڵێت: وتمان خودا و پێغەمبەرەکەی لە خۆمان بە بەزەیی ترن بۆمان، دەی با بەیعەتت پێ بدەین ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: من تەوقە لەگەڵ ئافرەتان ناکەم، قسە کردنم بۆ سەد ئافرەت وەك قسە کردنم بۆ یەك ئافرەت وایە.[1]

[1] (أعلام النساء) عمر رضا کحالة _ (بە دەستکاریەوە). هەروەها سەیری الطبقات (إبن أسعد) بکە.

# ئوم حەرام کچی ملحان کوڕی خالد کوڕی زەید

موسڵمان بوو..بەیعەتی دا و کۆچی کرد.. پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێزی لێدەنا و چاك بوو لەگەڵیدا و، سەردانی دەکرد لە ماڵەوە، پێنج فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گێڕاوەتەوە، لە (ابن ام حکیم کچی زوبیر) و (أنس کوڕی مالیك) و (عبادە)ی کوڕی (صامت) و کەسانی دیکە فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە...

لە کاتی دەستەڵاتی معاویە و خەلافەتی عوسماندا بۆ غەزا کردن لەگەڵ (عبادە)ی کوڕی (صامت)ی مێردیدا ڕۆیشتووە، کاتێ گەیشتنە دوورگەی (قبرص) دابەزیە دوورگەکە، ئاژەڵێکی دڕندەی لێ نزیك بوویەوە و پەلاماری دا و لە ساڵی ٢٧ی کۆچیدا، لە (قبرص) وەفاتی کرد (خوا لێی ڕازی بێت)[١].

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە دەستکارییەوە).

# بوسرەی کچی صەفوانی کوڕی نەوفلی کوڕی ئەسەدی قەرەشی

یەکێك بوو لەو ئافرەتانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوە..یازدە فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە گێڕاوەتەوە، ئوم کەلسومی کچی عوقبە و، مەروانی کوڕی حەکەم و سەعیدی کوڕی مسەیب و کەسانی دیکە فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە..

شافعی دەڵێت: پێشینەی هەیە و زوو کۆچی کردووە، تا سەردەمی دەستەڵاتی معاویە ژیاوە[١].

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە دەستکارییەوە).

# زەینەبی كچی ئبو سەلەی مەخزومی

فەرموودە ناسێكی شارەزا بوو...لە تێگەیشتووترین ئافرەتانی سەردەمەكەی بوو..حەوت فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) گێڕاوەتەوە، (أبو عوبەیدەی كوڕی (عبدالله)ی كوڕی (زمعە)) ی كوڕی، لەگەڵ (أبو سلمە) و (عروە)ی كوڕی (زبیر) و كەسانی دیكە فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە..

لە (حسن)ەوە دەگێڕنەوە كە لە ڕۆژی (حرە)دا دەڵێت: سوێند بە خوا كەسێك دەرباز نەدەبوو، هەردوو كوڕەكەی زەینەبی كچی (أبی سلمە)ش كە زڕ كچی خێزانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) كوژران، ئەمجا هەردووكیان هێنا و خرانە بەردەستی، وتی: سوێند بە خوا كۆستی ئێوە زۆر گەورەیە...

ئەو لەمەدا، پەرۆشتر بوو بۆ یەكێكیان _مەزنتر بوو لێی لەوەدا_ ئاماژەی بۆ ئەوەی دیكەیان كرد_ چونكە ئەوەیان دەستی درێژ كردووە و لێی دڵنیا نیم، بەڵام ئەمەیان لە ماڵی خۆیدا دانیشتووە و چوونەتە سەری و كوژراوە..داوای بەزەیی بۆ دەكەم لای خوا.

ساڵی ٧٣ی كۆچی وەفاتی كرد... خوای گەورە ڕەحمەتی فراوانی خۆی بەسەردا بڕژێنێ و لێی ڕازی بێت[١].

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە دەستكارییەوە).

# ئوم ڕومانی کچی عامری کوڕی عوەیری کەنانی

یەکێکە لەو ئافرەتانەی فەرمووودەیان ڕیوایەت کردووە... موسڵمان بووە و بەیعەتی داوە و کۆچی کردووە..ئەو _ڕەزای خوای لێ بێت_ لە کۆچکارە پێشینەکان و، لە ئافرەتە ئیماندارە گوێڕایەڵەکان بوو، فەرمووودەی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گێڕاوەتەوەو فەرمووودەیان لێ گێڕاوەتەوە.. ئیمامی بوخاریش فەرمووودەکانی هێناوە.

کاتێك دایکی بڕواداران عائیشە _کە کچی بوو_ بوختانی بۆ هەڵبەسترا، لە داخاندا هۆشی لای خۆی نەبوو..ساڵی ٦ی کۆچی لە شاری مەدینە مردووە..هەندێ دەڵێن ساڵی چوار یان پێنجی کۆچی مردووە...

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دابەزیووەتە نێو گۆڕەکەی و داوای لێخۆشبوونی بۆ کردووە و فەرموویەتی: خودایە خۆت دەزانی (ئوم رومان) چەند تاڵی چەشتووە لە پێناوی تۆ و پێغەمبەرەکەتدا..دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەس پێی خۆشە سەیری ئافرەتێك بکات لە حۆریە چاو ڕەشەکانی بەهەشت بچێت با سەیری (ئوم رومان) بکات[1].

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە دەستکارییەوە).

# ئوم حەکەمی کچی ئەبی سوفیان

لە راویەکانی فەرموودەیە... پێغەمبەری (ﷺ) بینیووە و لەو کەسانە بووە کە لە رۆژی رزگار کردنی مەککەدا موسڵمان بوون.

بەیعەتی داوە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و فەرموودەی لە معاویەی برایەوە گێڕاوەتەوە و، (عبدالرحمن)ی کوڕی (عبدالله الثقفي) کە کوڕی بوو فەرموودەی لێ گێڕاوەتەوە.

(ئەبو زرعە) دەڵێت: لەو ئافرەتانەی کە لە شام فەرموودەیان دەگێڕایەوە: (ئوم حەکەم)ی کچی (أبی سفیان).

(ابن سمیع)یش کە لە تابعیەکانی خەڵکی شامە دەڵێت: ئوم حەکەمی کچی ئەبی سوفیان... کە لە دیمەشق نیشتەجێ بوو[١].

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر.

# ئوم عەلائی ئەنصاری

یەکێکە لەو ئافرەتانەی فەرموودەیان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاوەتەوە، موسڵمان بووە و بەیعەتی داوە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و شەش فەرموودەی گێڕاوەتەوە لێی و... لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بەشداری جەنگی خەیبەری کردووە.

(خارجەی کوڕی زەید) و (عبدالملك کوڕی عمیر) و، (خزامی کوڕی حەکیمی ئەنصاری) فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە.

لە کاتی نەخۆش کەوتنیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی دەکرد[1].

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر.

# شەفائی کچی عبداللەی کوڕی عبدالشمس

هاوەڵێکی پایەدارە، هۆشمەندی و چاکە و بیروڕا پەسەندیەکەی بە جۆرێ بوو کە عومەری کوڕی خەتتاب بیروڕای وەردەگرت و راوبۆچوونەکەی زاڵ دەکرد.

پێش کۆچ کردن موسڵمان بووە و، کۆچی کردووە بۆ شاری مەدینە و، لە کۆچکارانی پێشەوە بووە و... بەیعەتی داوە بە پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووە: حەفصە فێری دوعای سڕبوون بکە[١]، هەروەك چۆن فێری نوسینت کرد.

لە پێغەمبەر (ﷺ) و عومەری کوڕی خەتتابەوە (رضي الله عنه) فەرمووی گێڕاوەتەوە، سولەیمانی کوڕی (أبی خیپمە)ی کوڕی و هەردوو نەوەکەی (أبو بکر) و (عثمان)ی کوڕانی (سولەیمان) و، خزمەتکارەکەی (أبو إسحاق) و، حەفصەی دایکی باوەڕداران فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە...أبو داودیش فەرموودەی لێ تۆمار کردووە.

شیفا _خوا لێی ڕازی بێت_ ساڵی ٢٠ی کۆچی وەفاتی کرد[٢].

---

[١] النملە: نەخۆشییەکە وەك سڕبوون، لە کوردەواریدا بەو سڕبوونە دەوترێت مێرولەکردن.

[٢] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر (بە دەستکارییەوە).

# خیرەی کچی ئەبی حەدرەد

# ئوم دەرداء

لە راویەکانی فەرموودەیە، خاوەنی هۆشمەندی و بیروراو ئاین و چاکە بووە، پێنج فەرموودەی لە پێغەمبەر (ﷺ) و (أبو دەرداء)ی مێردییەوە ریوایەت کردووە..هەندێ لە شوێنکەوتوانی وەك (صفوانی کوڕی عبداللە) و (میمونی کوڕی مهران) و (زیدی کوڕی أسلم) فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە، دوو ساڵ بەر لە (أبو درداء) لە سەردەمی خەلافەتی (عوسمانی کوڕی عەفاندا) (رضي الله عنه) لە شام مردووە[1].

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر (بە دەستکارییەوە).

# خەولەی کچی حەکیم کوڕی ئومەییەی سەلەمی

یەکێکە لەو ئافرەتانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، پازدە فەرموودەی لە پێغەمبەر (ﷺ) گێڕاوەتەوە و، ئیمامی موسلیمیش فەرموودەی لێ ڕیوایەت کردووە، هەروەها (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) و (سەعیدی کوڕی موسەیەب و کەسانێکی تر فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە، یەکێکیشە لەو ئافرەتانەی خۆیان پێشکەشی پێغەمبەر (ﷺ) کرد و ئەویش ڕەتی کردەوە.

خزمەتی پێغەمبەری (ﷺ) دەکرد و خێزانی هاوەڵی پایەدار (عوسمانی کوڕی مضعون) بوو[1].

---

[1] لە کتێبی (نساء فاضلات)ي عبدالبديع صقر...وەرگێراوە بە (پوختە و دەستکارییەوە).

# ئوم زەری غیفاری

خێزانی هاوەڵی پایەدار (ئەبو ذەڕی غیفاری)یە و، یەکێکە لە شاعیرانی عەرەب...

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ئەبو ذەڕی فەرمووو: ئەی ئەبا ذەڕ باسی سەرەتای موسڵمان بوونی خۆتم بۆ بکە، ئەبو ذەڕ وتی: بتێکمان هەبوو ناوی (نهم) بوو، منیش ماستم هێنا و کردم بەسەریدا، پاشان ڕۆیشتم، دەبینم دواتر سەگێك ئەو ماستە دەخوات، کە لێ بوویەوە قاچی بەرز کردەوە و میزی کرد بەسەر بتەکەدا کاتێ باسی ئەوەم بۆ ((ئومم ذەڕ) کرد وتی:

ألا فابغنا ربًا كريما    جواداً في الفضائل يا ابن وهب

ئایا چاك نیە ڕوو لە پەروەردگارێکی بەخشندە بکەین، دەست بڵاو بێت لە چاکە و جوانیدا ئەی کوڕی وەهەب

فما من سامه كلب حقير    فلم يمنع يداه لنا برب

ئەوەی کە سەگێکی بێ نرخ پیسی کرد و بە دەستەکانی بەرگری بۆ نەکرا پەروەردگارمان نەبێ

فما عبد الحجارة غير غاو    ركيك العقل ليس بأهل لب

بەرد پەرستان، جگە لەسەر لێ شێواو چین    عەقڵ زبر و خاوەن هۆشی تەواو نین

پێغەمبەری خوداش (ﷺ) فەرمووی: (ئومم ذەڕ) راستی وت، بەرد پەرست سەر لێ شێوا و گومڕایە[1]..

---

[1] لە کتێبی (نساء فاضلات)ي عبدالبديع صقر... وەرگیراوە بە (پوختە و دەستکارییەوە).

# روبەیعی کچی معوەزی کوڕی عفرائی ئەنصاری

هــاوەڵێکی پایــەدارە، لەگــەڵ پێغەمبــەردا بەشــداری غــەزای کــردووە و، چارەسەری برینداره‌کانی دەکرد و کوژراوانی بۆ شاری مەدینە دەگواستەوە، لە ژێـر (داری رضـوان)دا بەیعـەتی داوە بـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)، بیـست و یـەك فەرموودەی لە پێغەمبەر (ﷺ) گێڕاوەتـەوە... (عائیـشەی کـچی ئەنەسـی کوڕی مالیك) و، (خالید)ی کوڕی (ذکوان)و کەسانی تر فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە... بوخاری و موسلیم و کۆمەڵی زانایان (الجماعة) فەرموودەیان لێ وەرگرتـووە لـە نزیکەی ساڵی ٤٥ی کۆچیدا..روبەیعە کۆچی دوایی کردووە[١] _رەزای خـوای لێ بێت_.

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر (بە کورتکراوەیی).

# ئوم کولسومی کچی ئەبوبەکر

لە ئافرەتە چاکەکانی سەردەمی خۆی بوو..خوشکی (عائیشە)ی دایکی ئیماندارانە _ رەزای خوای لیّ بێت_، عومەری کوڕی خەتتاب خوازبێنی کرد، بەڵام شووی پیّ نەکرد...

عائیشەی خوشکی و (إبراهیم)ی کوڕی (عبدالرحمن)ی کوڕی (عبدالله) کوڕی (أبي ربیعة)و، (جابر)ی کوڕی (عبدالله)ی ئەنصاری، وە (طلحة)ی کوڕی (یحی) فەرموودەیان لێوە ڕیوایەت کردووە، (موسیلم و ترمذي)یش لە ڕیوایەتەکانیان هێناوە[١]...

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر (بە کورتکراوەیی).

# ئوم وەرەقەی کچی عبداللەی کوڕی حارسی ئەنصاری

## شەهیدی ناوماڵەکەی خۆی

هاوەڵێکی چاکە کارە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی دەکرد و ناوی نابوو (شەهیدە).

لە کاتی خۆ ئامادە کردن بۆ جەنگی بەدر، (ئومم وەرەقە) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا...مۆڵەتم بدە لەگەڵتاندا بێم، چارەسەری برینداران دەکەم و نەخۆشەکان تیمار دەکەم، بەڵکو خوا شەهیدیم پێ ببەخشێ...

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: خوای گەورە شەهیدیت پێ دەبەخشێ و لە ماڵی خۆتدا بمێنەرەوە تۆ شەهیدی..

ئەو قورئانی کۆکردبوویەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکرد پێش نوێژی بۆ کەس و کارەکەی بکات، بانگدەرێکیشی هەبوو..تا ئەو کاتەی خزمەتکار و کەنیزەکێکی کەفیلیان نابوویەوە بێ هۆشیان کرد، تا لە پاش مردنی ئازاد بین، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عومەری کوڕی خەتتابدا (ﷺ) کوشتیان، کاتێ عومەر بەوەی زانی قسەی بۆ خەڵکی کرد و وتی: ئومم وەرەقە لە لایەن خزمەتکار و کەنیزەکەکەیەوە بێ هۆش کراوە و کوشتوویانە... پێغەمبەری خوا (ﷺ) راستی فەرموو کاتێ دەیگوت: سەردانی شەهید دەکەین... فەرموودە ناسان فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە[1].

---

[1] لە کتێبی (نساء فاضلات)ی عبدالبدیع صقر...وەرگیراوە بە (پوختە و دەستکارییەوە).

# ئومەییەی کچی قەیسی ئەبو سەلتی غیفاری

هاوەڵێکی پایەدارە و، لە دوای کۆچکردن موسڵمان بووە و بەیعەتی داوە و... لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بەشداری غەزای خەیبەری کردووە.

لەگەڵ دەستەیەك لە ئافرەتانی (بەنی غیفار)دا، هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) و داوایان لێ کرد بەشداری شەڕی خەیبەر بکەن، پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی: لەسەر بەرەکەتی خوا...

(أمیە) دەڵێت: ئەمجا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چووین، من کەنیزەکێکی تازە پێگەیشتوو بووم، ئەویش جانتای سەفەرەکەی خستە پشتمەوە، دابەزی بۆ (المصبح) و دابگرن، کاتی خوای گەورە لە خەیبەردا موسڵمانانی سەرکەوتوو کرد، لە غەنیمەت بەشی داین و پشکی بۆ دانەناین، ملوانکەیەکیشی بە دەستی خۆی هەڵگرت و کردیە ملم، سوێند بە خوا هەرگیز لێم جیا نابێتەوە...

ئەو ملوانەکەیەش لە ملیدا مایەوە تا کاتی مردنی و......وەسیەتیشی کرد کە لەگەڵیدا بنێژرێت.[١]

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر (بە دەستکارییەوە).

# هیندی کچی عوتبە کوڕی ڕەبیعە

## ڕەزای لێبێ تۆبەی کردوو

لە ئافرەتانی ڕاوێژ پێ کراو و هۆشمەند و... قسە زان و زمانپاراوی... ئەدەب و هۆنراوە بوو.

دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی بوو...پاشان موسڵمان بوو بە شێوەیەکی چاك و، ئیسلام غەم و کینەکانی کپ کردەوە و، هاتە ریزی ئافرەتانی راستگۆ و بڕوادار.

لە جەنگی بەدردا باوکی و مامەی و ئامۆزاکەی کوژران، ڕق لێبونی موسڵمانان لە دڵیدا بڵێسەی داو، دەستی کرد بە هاندانی قوڕەیشیەکان و جۆشدانی هەستی تۆڵە و ڕق لێبونی موسڵمانان لە دڵی پیاو و ئافرەتانیاندا بە ئومێدی وەرگرتنەوەی تۆڵەی بەدر..

لە رۆژی ئوحوددا، لە کاتێکدا حەمزەی کوری عبدالمطلب _شێری خودا_ بکوژی باوك و مامەی _ بە ئازایی و بوێرانە لە گۆڕەپانی جەنگەکەدا دەهات و دەچوو، ڕق و کینەی هیند زیاتر تاوی سەند و (وەحشی) هان دەدا کە حەمزە بکوژێت، تا لە ناکاو لێی بدات و، داخ لە دڵان لەسەر تەرمەکەی کۆبوونەوە، لە پێش هەموویانەوە هیند و، هەستان بە شێواندن و ئەتك کردنی و، پاشان

جەرگیان دەرهێنا و هیند لە نێو دەمیدا دەیجوی تا ئاگری دڵی پێ خامۆش بکات...

ئەم هیندە، ئەوەی کە کردی کردی، پاشتر خوای گەورە سنگی گوشاد دەکات بۆ ئیسلام و، هەر کە زانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی خۆش بووە، دەچێتە خزمەتی بۆ بەیعەت دان و بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا... من سوپاسگوزاری خوای گەورەم کە ئەم ئاینەی سەرخست...تا بەزەیی و ڕەحمەتی تۆ بە منیش بگات، ئەوا وەك بڕوادارێك بۆ بەیعەت پێدانت هاتووم.

پێغەمبەری نازداریش کە خوای گەورە وەك بەزەیی بۆ جیهانیانی ڕەوانە کردووە دڵی بۆی نەرم بوو، ئەمجا پێی فەرموو: "بەخێر بێیت ئەی هیند...."

هیند وتی: "سوێند بە خوا هیچ کەسێکی سەر زەوی نەبووە هێندەی سەر شۆڕ بوونی ئێوە پێم خۆش بوو بێت، ئێستاش وام لێهاتووە کە هیچ کەسێکی خەڵکی سەر زەوی نیە هێندەی ئێوە پێم خۆش بێت سەر بەرز بن".

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: پەیمانم پێ دەدەیت کە بە هیچ شێوەیەك هاوبەشی بۆ خودا بڕیار نەدەیت...هیند وتی: سوێند بە خوا تۆ شتێك لە ئێمە وەردەگری کە لە پیاوانی وەرناگری و ئێمەش پێت دەدەین...

فەرمووی: دزیش نەکەن...وتی: سوێند بە خوا من لە سامانی ئەبوو سوفیان دەبەم _کە لەوێدا ئەبو سوفیانی مێردی ئامادە بوو_ ئەبو سوفیان وتی: ئەوەی ڕۆیشتووە با حەڵاڵت بێت..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: زیناش نەکەن...وتی: ئایا ئافرەتی ئازاد زینا دەکات..

فەرمووی: منداڵەکانتان نەکوژن... وتی: بە ساوایی بەخێومان کردن و بە گەورەیی ئێوە لە ڕۆژی بەدردا کوشتنتان، جا ئێوە زیاتر ئاگاداریانن..

فەرمووی: وە نابێ بوختـان هەڵبەبەسـتن لـە نێـوان دەم تـا قاچـەکانتان بـۆ کەسانی دیکە...

وتی: سوێند بە خوا بوختان شتێکی زۆر ناشیرینە...

فـەرمووی: لـە کـردەوەی چـاکدا سەرپێـچیم نەکـەن...وتـی: لێـرەدا دانەدەنیشتین ئەگەر سەرپێچی کردنی تۆمان لە چاکەدا مەبەست بوایە...

ئـەمجا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـە عومـەری کـوڕی خـەتتابی فـەرموو: بەیعەتیان لێ وەربگرە و داوای لێخۆشبوونیان لای خوا بۆ بکە...

هینـد پـاش موسـڵمان بـوون و بەیعەتـدانی بـوو بـە یـەکێك لـە ئافرەتـە موسـڵمانە ڕاسـتگۆکان و، لەگـەڵ مێـردە موجاهیدەکەیـدا لـە پێنـاوی خـودا بەردەوام بوو، هیند بەشداری جەنگی یەرمووکی کرد و، هـانی شـەڕ کردنـی لـە دژی ڕۆمـەکان دەدا و، دەیـووت: ئـەی کۆمـەڵی موسـڵمانان بـە شمـشێرەکانتان پشتگیری ئەوانە بکەن بەر سمێڵیان کردووە".

لـە پێغەمبـەری خـوداوە (ﷺ) فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە و، معاویـەی کـوڕی ئـەبو سـوفیانی کوڕیـشی فـەرموودەی لێ گێڕاوەتـەوە، لەگـەڵ عائیـشەی دایکـی بڕواداران.

هیند لەسەردەمی خەلافەتی عومـەری کـوڕی خەتتابـدا (ﷺ) کۆچـی دوایـی کرد[1].

---

[1] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة.

(كرائم النساء) أحمد محمد جمال (بە پوختە و دەستکاریەوە) .

# ئوم حەمیدی ئەنصاری

هاوەڵێکی پایەدار بوو، یەکێك بوو لە ئافرەتە خواپەرستەکانی سەرەتای ئیسلام.....ڕۆژێکیان بە پێغەمبەری خودای وت (ﷺ) : من پێم خۆشە لەگەڵ تۆدا نوێژ بکەم.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: زانیومە کە حەز دەکەیت لەگەڵ من نوێژ بکەیت..بەڵام نوێژ کردنت لە جێگاکەی خۆت باشترە لە نوێژ کردنت لە ژوورەکەتدا، نوێژ کردنت لە ژوورەکەتدا چاکترە لە نوێژ کردنت لە نێو ماڵەکەی خۆتدا، نوێژ کردنی نێو ماڵی خۆت باشترە لە نوێژ کردنت لە نێو مزگەوتی کەس و کارەکەتدا...نوێژ کردنشیت لە نێو مزگەوتی کەس و کارەکەتدا چاکترە لە نوێژ کردنت لە مزگەوتەکەی مندا.

ئەمجا فەرمانی کرد کە مزگەوتێکی لەو پەڕی ماڵەکەی بۆ دروست بکەن و سەری گرت...ئیدی تا گەیشتەوە بە دیداری پەروەردگاری نوێژی تێدا دەکرد[١]..

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة (بە دەستکارییەوە).

# بەشی شەشەم

# ئافرەتە ناودارەکان

بەلقیس.

دایکی عەمماری کوڕی یاسر.

ئەسمائی کچی ئەبوبەکر.

خەنساء.

زوبەیدەی کچی جەعفەر.

رابیعەی عەدەوی.

ئەمامەی کچی (حارث).

# بەلقیس
# فەرمانڕەوای خۆراگر

قورئانی پیرۆز (بەلقیسی کچی ئەلیەشرەح)ی وەك نموونەیەکی پرشنگداری ئافرەتی داوێن پاکی ژیر و، فەرمانڕەوایەکی خۆڕاگر نیشان داوە، چیرۆك و بەسەرهاتەکەشی پەند و پێشەنگایەتی بۆ ئافرەتانی چاکەکار تێدایە.

بەلقیس کورسی دەستەڵاتی لە مێردەکەی و باوکیەوە بۆ بەجێ مابوو، پێویستی بەو تەلارەی ئەوان نەبوو، ئەوە بوو تەختێکی پادشایی وەها جوانی بۆ خۆی هەڵبژارد کە خوای باڵا دەست بە مەزن ناوی دەبات و دەفەرمووێت: ﴿وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴾.[1] واتە: لە هەموو جۆرە دەسەڵات و ناز و نیعمەتێکی پێ بەخشراوە، تەختێکی پاشایەکی گەورەشی هەیە.

بەلقیس و میللەتەکەی لە بری خوای گەورە خۆریان دەپەرست، هەروەك پەیوو سولەیمانە چاوی پێ کەوت و، بۆ سولەیمان پێغەمبەر (عليه السلام) باسی کرد و، خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا هێناویەتی: ﴿ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ اللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴾[2].

---

[1] سورة النمل /الآية/٢٣.

[2] سورة النمل /الآية/٢٤.

واتە: بینیم خۆی و قەومەکەی سوژدە بۆ خۆر دەبەن لەجیاتی خوا، شەیتان کاروکردەوەی (چەوتیانی) بۆ رازاندۆتەوەو رێبازی راست و دروست نادۆزنەوە.

جا ئەم ئافرەتە تێگەیشتووە دەستەڵاتی یەمەنی گرتە دەست و، بەڵێنی بە گەلەکەی دا کە بە دادوەری و راوێژ کردن فەرمانڕەواییان بکات...

قورئانی پیرۆزیش ئا ئەم کارە پەسەندەی بۆ چەسپاندووە، کاتێ کە نامەکەی سولەیمانی پێ دەگات (عليه السلام) کە بانگی دەکرد بۆ لای ئاین و سوننەتەکانی و، پەپووسولەیمانە فڕێی دایە بەردەستی، لە کاتێکدا وەزیر و راوێژکارانی لە دەوری بوون...

بەلقیس لوتبەرزی بە خراپە داینەگرت، بەڵکو بە ڕەوشت جوانیەکی کەم وێنەوە پێی ووت: ﴿ قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ إِنِّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيمٌ (٢٩) إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ (٣٠) أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ ﴾[1].واتە: (شاژن هات و نامەی بینی و خوێندیەوەو وەزیران و ئەنجومەنەکەی خۆی کۆکردەوەو) وتی: ئەی رێزداران، من نامەیەکی پیرۆز و بەڕێزم بۆ دانراوە، (نامەکە) لە سولەیمانەوەیە، بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبانەوە (دەست پێدەکات و دەڵێت) کە خۆتان بە گەورە مەزانن و لێم یاخی مەبن و وەرن موسڵمان بن.

بەلقیس لە دەرکردنی بڕیارەکەدا کە پەیوەست بوو بە کاروباری گەلەکەیەوە بیروڕای خۆی نەسەپاند بەسەریاندا، بەڵکو داوای راوێژکاری لێ کردن: ﴿قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي أَمْرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴾[2]. واتە: وتی: ئەی رێزداران راتان چیە، چی بکەم باشە، خۆ من هیچ بڕیارێکم نەداوە هەتا ئێوە لێی ئاگادار نەبووبن و راتان لەسەری نەدابێت.

---

[1] سورة النمل /الآية/٢٩_٣١.

[2] سورة النمل /الآية/٣٢.

بەمجۆرە شاژنە بەلقیس پرسیاریان لێدەکات لە بارەی بیروڕایانەوە و، دوپاتی دەکاتەوە کە ئەو بڕیار دەرناکات و کارەکە یەکلا ناکاتەوە تا ئەوان بیروڕای خۆیان دەرنەبڕن، هەروەك چۆن لە رۆژی هەڵبژاردنیدا بە پادشایان پەیمانی پێدابوون..

بەڵام کەسانی دەوروبەری بەلقیس شانازی بەهێزیانەوە دایان دەگرێت و، پێی دەڵێن: ﴿ قَالُوا۟ نَحْنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٍ وَأُو۟لُوا۟ بَأْسٍ شَدِيدٍ ﴾[١]. واتە: وتیان ئێمە خاوەنی هێز و تواناو دەسەڵاتی سەخت و تەواوین.

بەڵام زۆری نەبرد هاتنەوە هۆش خۆیان، لە کاتێکدا ئەوان ئاشنای هۆشمەندی و زرنگی و لێزانی و داناییەکەی بوون، کە تا چەند سوورە لەسەر بەرژەوەندی وڵات و گەلەکەی، لێرەوە بە هۆشیاریەوە لەگەڵی دەدوێن و پێی دەڵێن: ﴿وَٱلْأَمْرُ إِلَيْكِ فَٱنظُرِى مَاذَا تَأْمُرِينَ ﴾[٢]. واتە: فەرمانیش فەرمانی تۆیە، بیربکەرەوەو تێفکرە چ فەرمانێك دەدەیت.

گفتوگۆ و بیروڕا گۆڕینەوەکە بەردەوام دەبێت و، شاژن بیروڕا و راوێژیان لەگەڵ دەکات، دواتر شوێنەواری وێرانکاری و خوێن ڕێژی شەڕ بۆ سەر وڵاتەکەی دەخاتە ڕوو بۆیان و دەڵێت : ﴿ قَالَتْ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً ۖ وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴾[٣]. واتە: وتی: بەراستی پاشاکان هەرکاتێ چوبنە شار و دێهاتەکانەوە وێران و کاولیان کردوەو، کەسانی خاوەن دەسەڵات و پیاوی ناوداری ئەو شوێنەیان زەلیل و ریسوا کردوە، هەمیشە ئەوە پیشەیانەو بەو جۆرە دەکەن.

---

[١] سورة النمل /الآية/٣٣.

[٢] سورة النمل /الآية/٣٣.

[٣] سورة النمل /الآية/٣٤.

بیروڕای خۆی خستە ڕوو بۆیان، کە مەبەستیەتی سولەیمان تاقی بکاتەوە تا بزانێت ئایا پادشایەکی ئاسایی یە، یان پێغەمبەر و نێردراوە، ئەمجا وتی: ﴿وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ﴾[1]. واتە: بڕیارم داوە کە دیارییەکیان بۆ بنێرم.

خۆ گەر دەستی لە ئامانجەکەی هەلگرت ئەوا پادشایە، ئێمەش خاوەن هێز و توانای خۆمانین کە بەشی تێکدانی تەختەکەی دەکات، خۆگەر رەتی کردەوە و وازی لێ هێنا ئەوا لەوانەیە پێغەمبەر بێت و بەلگەیەکمان نیشان بدات و، ڕێنوێنیمان بکات بۆ راستە ڕێ..

کاتێك نیردراوەکانی گەیشتە خزمەت سولەیمان بە دیاریە بە نرخەکەیەوە، فەرمووی: ﴿أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ﴾[2]. واتە: ئێوە دەتانەوێت بە مالّ و سامان و دیاری کۆمەکیم بکەن؟! کە ئەو شتانەی خوا پێی بەخشیوم چاکترە، ئەوە ئێوەن کەبە دیارییەکەتان دلّتان خۆشە.

لێرەدا بۆ بەلقیس ڕوون بوویەوە کە سولەیمان لە پالّ ئەوەی پاشایە پێغەمبەرێکی ڕەوانە کراوە و، پێویست دەکات کە بچێت بۆ لای و ببێتە گوێڕایەلّی خۆی و ئاینەکەی.

بەلاّم پێش ئەوەی بگاتە خزمەت سولەیمان و، لە کاتی رۆشتنیدا بۆ لای، سولەیمان تەختی پادشایەکەی لە سەبەئەوە بە ماوەی چاوتروکاندنێك هێنا وەك موعجیزەیەك تا بڕوای پێ بهێنێت کە پێغەمبەرێکی ڕەوانە کراوە.

بەلقیس گەیشتە لای سولەیمان لە قودس و دەستی کرد بە سەیر کردنی تەختی پادشاییەکەی، سەرسام بوو، چۆن لە سەبەئی باشووری دوورگەی

---

[1] سورة النمل /الآية/٣٥.

[2] سورة النمل /الآية/٣٦.

عەرەبیەوە گەیەنراوەتە فەڵەستین کە لە باکووریەتی، ئەمجا سولەیمان لێی پرسیی: ﴿أَهَٰكَذَا عَرۡشُكِۖ قَالَتۡ كَأَنَّهُۥ هُوَۚ﴾[١]. واتە: تەختی پاشایەتی تۆ ئاوایە؟! وتی: هەر دەڵێی ئەوەو لەو دەچێت.

بەلقیس سوور نەبوو لەسەر ئەوەی کە تەختی پادشایەتیەکەی بێت، نەبادا درۆ یان هەڵە بکات، ئەمەش بەلگەیەکی دیکەی پێگەیشتووی عەقڵ و رادەی بەرزی ئەدەبیەتی، تەنانەت کاتێ بەلقیس کە رێنوێنی سولەیمانی پێگەیشت و ئاینی باوك و باپیرانی گۆڕی بۆ ئاینی خودای باڵا دەست و ئیسلام، وتی: ﴿رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[٢]. واتە: پەروەردگارا من تا ئێستا ستەمم لەخۆم کردووە، ئیتر وا لەگەڵ سولەیماندا تەسلیمی خوای پەروەردگاری جیهانەکان بووم.

ئەمەش رێگەی خامۆش بوونی ئاگر پەرستی بوو لە تێکڕای یەمەندا....

ئەمانە ئایەتانێکی قورئانی پیرۆزن کە بە هۆی چاکەمەندی ئافرەتێك و هۆشمەندی و بیروڕا پەسەندیەکەیەوە هاتوون..

هێز و توانا و لووت بەرزی پادشایەتی بەلقیسی وای لێ نەکرد دوور بگرێت لە وەرگرتنی حەق و چوونە ناوی...ئەمەش بەیاد هێنانەوە و پەندە بۆ ئەو کەسەی گوێ رادەگرێت و ئامادەیە...[٣]

---

[١] سورة النمل /الآية/٤٣.

[٢] سورة النمل /الآية/٤٤.

[٣] (كرائم النساء) أمجد محمد جمال
(المرأة العربية في جاهليتها وإسلامها) عبدالله عفيفي (بە پوختە و دەستکارییەوە).

# سومەیەی کچی خیاط
# دایکی عەممەری کوڕی یاسر

## یەکەمین شەهیدی ئافرەت لە ئیسلامدا

یەکێکە لەو کەسانەی زۆر زوو موسڵمان بوون و لەم ڕووەوە یەکێکە لەو هەشت کەسەی یەکەمجار موسڵمان بوونی خۆیان ئاشکرا کرد...

لە کاتێکدا قورەیشیەکان لە هاتوچۆدا بوون بۆ ئەشکەنجەدانی ئەو کەسانەی بێدەسەلاتن و موسڵمان بوون، بە جۆرێ سنووری ئەشکەنجە و سزا دانیان بەزاند و گۆڕیان بۆ فرت و فێڵ لە نواندن و ئازاردانداا...

سومەیە دایکی عەمماری کوڕی یاسرە (ڕەزای خوای لێ بێت) یەکێك بوو لەو کەسانەی ئەشکەنجەدانیان بەرکەوت...کاتێك گەرمای نیوەڕۆ دادەهات و بیابان داخ دەبوو، بەنی مەخزوم سومەیە و عەمماری کوڕی و یاسری مێردیان دەبرد بۆ بیابان و، قەڵغانی ئاسنیان لەبەر دەکردن و، پاش ئەوە زیخە داخ بووەکەی بەر هەتاوی گەرمی بیابانیان دەکرد بەسەریاندا، ئەمجا بەردبارانیان دەکردن، سومەیە خۆڕاگرانە ئارامی دەگرت و دەستی بە ئیمانەکەیەوە دەگرت

و، بەرگەی ئەشکەنجەدانی گرت و، رازی نەبوو خواستی بێ باوەڕان بەدی بێنێت و لە باوەڕ هێنانی پاشگەز بێتەوە...

دەروونی پێغەمبەر (ﷺ) پڕ بوو بوو لە بەزەیی و سۆز بۆ ئەو نارەحەتیەی کە بەسەر خانەوادەی یاسردا دێت، لە ئەشکەنجە و سزای هەمە چەشن، ئەو وتە شیرینانەشی لە زاری پیرۆزیەوە دەردەچوون بە وێنەی کاریگەری ئەو بارانە بوو کە خوای گەورە بۆ بوژاندنەوەی زەوی دەیبارێنێ پاش مردنی: "مژدە بێت لە خانەوادەی یاسر...وادەی ئێوە بەهەشتە"....

ئەوە بەهەشتە ئەی سومەیە..خۆی دەڕازێنێتەوە و ساز و ئامادە دەبێت بۆ پێشوازیتان، ئەوە بەهەشتە ئەی خانەوادەی یاسر، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) مژدەی پێداون، هەموو شتێ پاش ئەوە ئاسانە و گشت ئەشکەنجەیەك لە پێناوی خوادا سانا دەبێت..

لە پەرۆشی بەهەشتی پەروەردگاردا و، لە پێناوی رەزامەندی خوای گەورەدا دەروونە بڕوادارەکان لە بەرانبەر ئەشکەنجەداندا بەهێزتر دەبێت...

لە بەرانبەر خۆڕاگری ئەم ئافرەتە ئیمان پتەوە، بیروباوەڕە پۆڵاینەدا ئەبوجەهل زیاتر داخ لە دڵ ئەبێت، هەر بۆیە ئەشکەنجەدانیان زیاتر دەکات..

سومەیە ئاوڕ دەداتەوە، تا دوا هەناسەکانی مێردەکەی ببینێ کە ئەشکەنجە دەدرێ بە توندی، یاسر بە دەم سومەیەوە پێدەکەنێ لە کاتێکدا کۆتا هەناسەکانی تەمەنیەتی و دەڵێت: من بۆ لای ئەچم ئەی سومەیە..بۆ لای پەروەردگار ئەڕۆم.. ئەمجا جەستەی پیری تا ڕۆژی دوایی ئارام دەگرێت و...سومەیەش بە چاوی پڕ ئەشکیەوە کۆتا سەرنجی دەدات...بەرەو ڕەحمەتی خودا و، بەهەشتی بەرینی ئەی یاسر...

ئەبوجەهلیش چاودێری ئەم هەڵوێستە سامناکە دەکات و، جنێو و شادی چاوەکانی پڕ دەکەن و، سومەیەش بە دەم وتنەوەی چەند ئایەتێکی قورئانی

پیرۆزەوە سەربەرزانە تەماشای ئەبوجەهل دەکات بە جۆرێ کە سوکایەتی تێدا بێت بۆی... ئەبوجەهلیش رمەکەی بەرز دەکاتەوە و، لە سومەیەی دەدات و، جەستەی بێگەردی کون کون دەکات، لەکاتێکدا کە ئەو بە عەمماری کوڕی دەوت: بەرەو دیدار لە بەهەشتی بەرینی خوای گەورەدا، کوڕم..

بەڵێ ئەبوجەهل سومەیەی کوشت چونکە ئامادە نەبوو جگە لە خوای گەورە سەر بۆ کەسی دیکە نەوی بکات: ﴿وَمَا نَقَمُواْ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ﴾[1]. واتە: ئەم رق و داخ لەدڵییەیان لە ئیمانداران هەر لەبەر ئەوەبوو کە ئەوانە باوەڕی بەتینیان هێنابوو بەخوای باڵادەستی شایستەی سوپاسگوزاری.

سینەی پیرۆزی کۆتا هەناسەکانی دەدات و، گەردون لەگەڵ یەکەمین ئافرەتی شەهیدی ڕێی ئیسلامدا دەڵێتەوە: "لا اله الا الله محمد رسول الله"..

---

[1] سورة البروج/ئایەتی/٨.

# ئەسمای کچی ئەبوبەکری صدیق
# خاوەنی دوو پشتێن

کۆچکارێکی پایەدارە، بە هۆشمەندی و، داوێن پاکی و دەروون بەرزی و، بەهێزی ویست و، جوانی هەڵس و کەوت و، زمان شیرینی و زمان پاراوی لە شیعر و پەخشاندا ناسرا بوو..

ئەسمائی کچی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) زۆر زوو موسڵمان بوو، پاش موسڵمان بوونی حەڤدە کەس و، بەیعەتی دا بە پێغەمبەر (ﷺ) و بە شێوەیەکی پتەو ئیمانی پێ هێنا..

یەکێك لە سیما جوانەکانی موسڵمان بوونی ئەوە بوو، کاتێ (قوتیلەی کچی عبدالعزی) کە دایکی ئەسماء بوو (ئەبوبەکری باوکی لە سەردەمی نەفامیدا تەلاقی دابوو) بە دیاری مێوژ و رۆن و گوارەی بۆ هێنا بوو، بەڵام ئەسماء ئامادە نەبوو دیاریەکەی قبوڵ بکات و، عائیشە (کە لە باوکیەوە خوشکی بوو ناردیە لای پێغەمبەری خوا و پێی وت: پرسیار بکە لە پێغەمبەری خوا...

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: "با بێتە ماڵەکەی و دیاریەکەشی وەربگرێت".

كاتێ ئەبوبەكر هەموو سامانەكەی خۆی لە كاتی كۆچ كردنیدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڵگرت، (أبو قحافه)ی باپیری هاتە ژوورەوە بۆ لای لە كاتێكدا كە چوو بووە تەمەن و، چاوەكانی كز بوو بوون، بە ئەسمائی وت: سوێند بە خوا وا دیارە هەر چۆن خۆی لێ كردن، سامانەكەیشی لێ كردن. ئەسماء پێی وت: نەخێر باپیرە گیان، باوكم خێرێكی زۆری بۆ جێ هێشتووین، ئەمجا چەند بەردێكی خستە ئەو جێگایەی كە باوكی سامانەكەی تێدەكرد و كراسێكی دا بەسەریدا و دەست باپیری گرت و لەسەر بەردەكانی دانا، تا وای نیشان بدات باوكی پارەی زۆری بۆ جێ هێشتوون، باپیرەی وتی: ئێ باشە: ئێ باشە، بەمەش توانی دڵتەنگی و نیگەرانی ئەو پیرە كۆتایی پێ بهێنێ..

ئەسماء پێشتریش و، بەردەوام نمونەیەكی بەرزی ئافرەتی موسڵمان و، هاوسەری دڵسۆزە، كە بە رەزامەندی و دڵنیاییەوە بەشداری خۆشی و ناخۆشی مێردەكەی كرد و، بڕوای وابوو كە ئەوە ئەوە ئەركی سەر شانیەتی، ئەسماء هاوسەری زوبێری كوڕی عەوام بوو (رضي الله عنه) كە حەواری پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) و یەكێك بوو لەو دە كەسەی لە دونیادا مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە، لەگەڵ ئەوانەدا زوبێر هەژار بوو، دەست مایەیەكی نەبوو..

ئەسمائی _هاوسەری_ لە پاڵ نازداری و پایەیدا لە ماڵی ئەبوبەكری باوكیدا كە دەوڵەمەند بوو، خۆی عەلەف و كای دەدا بە ئەسپ و حوشترەكانی هاوسەرەكەی و، بە دەستی خۆی ناوكی خورمای پێ دەدان و، ئاوی دەدان و، سەتڵی هەویر شێلانی پڕ ئاو دەكرد و، عەلەف و كای ئاژەڵەكانی بۆ ماوەیەكی زۆر دەخستە سەر سەری..

ئەمە كاری بوو تا باوكی كەنیزەكێكی بۆ نارد تا خزمەتی ئەسپ و حوشترەكانی بۆ بكات..

سەرەڕای هەژاری مێردەکەی و، دەوڵەمەندی باوکی، زۆر دونیا نەویست و، لێ بووردە و، چاکە خواز بوو، ئامۆژگاری ئافرەتانی دەکرد و بە کچەکانی دەوت: ببەخشن و چاوەڕوانی پاداشت مەکەن.

ئەسماء (٥٨) فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاوەتەوە، هەندێك دەڵێن (٥٦) فەرمووده، بوخاری و موسلمیش یەکدەنگن لەسەر (١٤) فەرموودەیان، بوخاریش بە تەنها (٤) فەرموودەی هێناوە، موسلمیش بۆ خۆی بە تەنها چوار فەرموودەی هێناوە.. لە ڕیوایەتێکدا: لە هەردوو صەحیح (بوخاری و موسلیم)دا (٢٢) فەرموودەی هێنراوە، (١٣) یان (متفق علیە) و پێنجیشیان بوخاری و چواریان موسلیم هێناویەتی.

ئەسمائی کچی ئەبوبەکر تەمەنێکی زۆر ژیا و، لەو ماوەیەدا چەندین دەستەڵاتی بینی لەناوچوون و، ئاژاوە و جەنگ بڵێسەی دەدا، ئەو دوو قۆناغی هەبووە ماوەی لاوێتی و پێگەیشتن، لەگەڵ ماوەی پیری و دانایی، بە خاوەن دوو پشتێنیش ناودەبرا، چونکە پشتێنەکەی هێنا و کردی بە دوو پارچەوە، یەکێکیان بۆ توێشووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و، ئەوی دیکەشیان بۆ ئاوهەڵگرتن، لە شەوی دەرچوونی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەبوبەکردا بۆ ئەشکەوت.

بە تەنها ئەسماء ئەو پەناگەی دەزانی کە هەردووکیان پەنایان بۆ برد بوو، هەر ئەویش بوو بە تەنها شارەزای ئەو ڕێگایانە بوو کە بەرەو ئەوێ گرتبوویانە بەر، هەموو دەمە و ئێوارەیەکی درەنگ خواردن و ئاوی بۆ دەبردن، لەگەڵ ئەوەدا هەواڵی قوڕەیشیەکانیشی پێ دەگەیاندن تا دڵنیا بن لەسەر سەلامەتی و ئاسایشی هاوەڵە کۆچبەرە بەڕێزەکان، عبداللەی برای هەر هەواڵ و چالاکیەکی دوژمنی هەست پێ بکردایە بۆی دەبرد، ئەویش دەیگەیاندە هەردوو هاوەڵە کۆچبەرەکە..

ئەبوجەهل بەرەو مالّی هات و لە دەرگای دا، ئەسماء ئاشنای دڕندەیی و ستەمکاری ئەو بوو، پرسیاری دەربارەی محمد و باوکی لێ کرد، ئەویش وەك ئافرەتێکی بڕواداری بوێر وەڵامی دایەوە: هیچ شتێك لە بارەیانەوە نازانێت، توڕەیی و ڕقی ئەبوجەهل بلّیسەی دەسەند و، ڕقەکەی بە زللەیەکی توند تەقاندەوە بە دەستی بێ بڕوای ئاڕاستەی روخساری بێگەردی ئەسمائی کرد..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵەکەیدا دەگەنە جێگای ئارامی خۆیان و، ئەسمائیش خۆی گەیاندە لایان و، لە (قباء) یەکەمین منداڵی موسڵمانی پاش کۆچکردن بوو، کە ئەویش (عبدالله ی کوڕی زوبەیر)ە (رضي الله عنه).

ئەسماء لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بەشداری جەنگی یەرمووکی کرد و مەینەتی زۆر تێدا بینی..

تەمەنی درێژەی هەبوو تا وای لێهات چاوەکانی کز بوون، لە کاتێکدا جیاوازی نێوان (عبدالله)ی کوڕی و (عبدالملك ی کوڕی مەڕوان)ی خەلیفەی بینی، سوپای حەجاجی بەدی کرد هێرشی بۆ دەوروبەری ی(ئوم لقوڕا) دەبرد و، (عبدالله ی کوڕی زوبێر)یش بەردەوام دەبێت لە جیهاد و تێکۆشانی لە دژی حەجاج و ستەمکاری و دەستەڵاتەکەی، هۆز و بنەماڵەکەی سەرشۆڕی دەکەن و، حەجاجیش پێی دەڵێت کە واز لە شەڕ بهێنێت و بەیعەت بدات بە (عبدالملك ی کوڕی مەڕوان) ئەوا دەیکاتە فەرمانڕەوای مەککە، عبداللەش دەچێت بۆ لای دایکی و، ڕاوێژی پێ دەکات، لێرەدا پرشنگی جەسووری و بوێریەکەی دەردەکەوێت، هەرچەند دەزانێت کە هۆزەکەی وازیان لێی هێناوە ڕێگە نادات سەری شۆڕ بکات و، پێی دەڵێت :

"نەخێر.. با منالّەکانی نەوەی ئومەیە یاریت پێ نەکەن، سەربەرزانە بژی و، سەر بەرزانە بمرە، سوێند بە خوا من ئومێدەوارم پرسە و ماتەمینیم بۆ تۆ چاك بێت، پاش ئەوەی پێشم دەکەوی یان پێشت دەکەوم، بێزارییەك هەیە لە

دەروونمدا بەرانبەرت هەتا سەیری ئەوە بكەم كە دێت بەسەرتدا، پاشان پێی وت: مانەوەت لە دونیادا چەندە؟ (ابن زوبێر) بە كوژران زیاتر ڕازی دەبێت، سوێند بە خوا شمشێر لێدانێكی سەربەرزانە، خۆشترە لەلای خوا، لە لێدانی قامچیەك. پاشان ڕووی كردە پەروەردگاری و پاڕایەوە: خودایە ڕەحم بەم ماندووە بكە كە لە رۆژە گەرمەكانی مەدینەدا بەڕۆژوو دەبوو، چاكیش بوو بەرانبەر دایكی، خودایە من خۆم تەسلیمی تۆ دەكەم و، ڕازیم بە قەزای تۆ و، خودایە پاداشتی سوپاسگوزارانم لە عبدالله دا پێ بدە"..

جا وەك ئەوەی عبدالله هەستی بە ئایندەی خۆی كرد بێت، بە دایكی وت كە دەترسێ دوژمنان پاش كوشتنی سوكایەتی بەلاشەكەی بكەن، لێرەدا وتە نەمرەكەی دەڵێت: "ئەی عبدالله.. بەران لە پاش سەربڕینی بە كەوڵ كردن زیانی پێ ناگات".

عبدالله لە ڕووی ستەمكارێتی _حەجاج_دا خۆی ڕاگرت هەتا هەستا بە كوشتن و هەڵواسینی.. (ئەسماء)ی دایكیشی بە لای تەرمەكەیدا تێدەپەڕی و دەستی لێ دەدا، بە ئارامگری و چاوەڕوانی پاداشتی خوای گەورەوە، زمان و دڵ بوێر، دوپاتی دەكردەوە: " كاتی ئەوە هاتووە ئەم سوارچاكە دابەزێت"..

ئەمجا ئەو پلار تێ گرتن و گاڵتەكردنەی زیاتر داخی دەكردە دڵی حەجاجی ستەمكار و توتد و تیژ، هەر بۆیە بە ئەسمائی وت: چۆن دەڕوانیتە ئەوەی بە كوڕەكەتم كرد؟ ئەسماء وتی: دونیاكەیت لێ خراپ كرد و، ئەویش رۆژیی دوایی تۆی خراپ كرد..

ئەسماء چەند شەوێك دوای كوژرانی كوڕەكەی لە ساڵی ٧٣ی كۆچیدا و لە تەمەنی سەد ساڵیدا لە شاری مەككە، لە كاتێكدا كە هیچ ددانێكی نەكەوتبوو، عەقڵیشی گۆڕانی بەسەردا نەهاتبوو كۆچی دوایی كرد..

خوای گەورە لێت ڕازی بێت و ڕەحمەت پێ بکات ئەی ئەسمائی بڕواداری ڕاستگۆ و، موجاهیدی ئارامگر و، هاوسەری دڵسۆز کە بەشداری تاریکی و ناخۆشی ژیانی مێردەکەت کرد..

هەروەها وەك دایکێکی چاکترین پێشەنگ بۆ دایکان خودا ڕەحمەت پێ بکات، بە ڕاستی منداڵەکانت لەسەر شەهامەت و داوێن پاکی و دەروون بەرزی پەروەردە کرد و، هەموو بنەماکانی جوانی هەڵس و کەوت کردن و پاکخویت تێدا چاندن[١]..

---

[١] (کرائم النساء) أحمد محمد جمال.
(نساء فاضلات) عبدالبديع صقر.
"الداعية زينت الغزالي مسيرة وجهاد" إعداد: ابن الهاشمي " بە پوختە و دەستکاریەوە".

# خەنساء

## دایكی شەهیدان

ناوی (تماضر) ی كچی عەمری كوڕی (حارث)ی كوڕی (الشرید)ه و، بە خەنساء بەناوبانگە..

شاعیرێكی ناودار و... هاوەڵێكی پایەدارە، لە ڕەچەڵەكدا سەر بە بەڕێزترین و، بەخشندەترین بنەماڵەكانی عەرەبە... لەگەڵ هۆزەكەیدا (بەنی سەلیم) هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ) و موسڵمان بوو لە گەڵیاندا..

خەنساء دوو برای هەبوو "معاویە و صخر" بە شێوەیەكی بێ وێنە خۆشی دەویستن، هەردووكیان كوژران، خەنساء پاش ئەوانە بەردەوام شیوەن و ڕۆڕۆی بوو بۆیان، بە جۆرێ دونیای عەرەبی پڕ كردبوو لە شیوەنە ئەسریناویەكانی.

خەنساء بەر لە موسڵمان بوونی زۆر گریا، كاتێ موسڵمان بوو، ئیسلام بارەكەی بۆ ئاسان كرد و، دڵی بە دڵنیایی ڕووناك كردەوە و، بە دڵێكی پڕ لە باوەڕ و ئارامەوە پێغەمبەری خودای (ﷺ) بەجێ هێشت. بەڵام هەر براكانی دەلاواندەوە، بەبێ ئەوەی لە ڕوخساری خۆی بدات، یان سنگی دابدڕێت، چونكە ئیسلام ئەوەی لەسەر حەرام كرد.

هەتا سەردەمی عومەری كوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) كە چووە خزمەتی و، لە لای گریا، عومەر پێی وت: چی فرمێسكی چاوانت پێ دەڕێژێ؟!! وتی: گریانم بۆ سەردارانی (مضر)ه، عومەر وتی: ئەی خەنساء ئەوان لە ئاگردان، خەنساء وتی: ئەوە ناڵە و گریانەكەی زیاتر و بە كوڵتر كردوم بۆیان.

پاش ئەوە خەنساء بەشداری ئافرەتە موسڵمانەکانی دەکرد لە بانگەواز بۆ ئیسلام و تێکۆشان لە پێناویدا، بە جۆرێ کە هەر چوار کوڕەکەی کە لە یەك جەنگدا و لە یەك کاتدا کوژران بە خاك سپارد.

بەڵێ.. ئەوە جەنگی قادسیە بوو، خەنساء لەگەڵ چوار کوڕەکەیدا بەشداری تێدا کرد..

پێش ئەوەی بڕۆنە گۆڕەپانی شەڕەکە، کۆی کردنەوە و، دەستی کرد بە هاندان و جۆشدانیان و، گیانی بەرگری تێدا دەوروژاندن و، پێی دەوتن: "ئەی کوڕەکانم : ئێوە بە ویستی خۆتان موسڵمان بوون و، بە ئارەزووی خۆتان کۆچتان کرد، جا سوێند بە خودای تاکی بێ هاوتا ئێوە کوڕی یەك پیاو و، یەك ئافرەتن، ڕەچەڵەکتانم نەشێواندووە و، بنەماڵەتانم نەگۆڕیوەو، ناپاکیم لە باوکتان نەکردووە، ئاگاداری ئەو پاداشتە نەبڕاوەن کە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ ئەو کەسانەی لە دژی بێ باوەڕ دەجەنگن و، ئەوەش بزانن ئارامگای هەمیشەیی زۆر چاکترە لە ئارامگای بڕاوە، جا ئێوەش ئارامگر و خۆڕاگر و دامەزراو بن و، تەقوای خواتان هەبێ بەڵکو سەربکەون".

ئەی کوڕەکانم.. گەر بە ویستی خوای گەورە تا سبەینێ سەلامەت بوون، ئەوا بە بەرچاوڕوونی بچنە مەیدانی شەڕ کردن لە دژی دوژمنەکەتان، پشت بە خوا بەسەر دوژمنەکەتاندا سەرکەوتوو دەبن، خۆ گەر بینیتان جەنگەکە بەرەو گەرم بوون دەچوو، بەرەو دۆڕان دەچوو، بچنە قەرەباڵغیەکەی و سەرۆکەکەی بکوژن و، غەنیمەت و کەرامەت بە دەست بهێنن، لە ئارامگای نەمری و سەر بەرزیدا".

ئێی چەندە جوانە ئیسلام و، هێزی باوەڕ و، ڕەندی ئارامگری.. خەنساء لە سەردەمی نەفامیی و سەرەتای ئیسلامدا بۆ مەرگی دوو براکەی دونیای پڕ

کرد لە گریان و ناڵە، پاشان پەرۆشی و دڵتەنگیەکەی دەگۆڕێت بۆ باوەڕ و ئارامگری و هانی هەر چوار کوڕەکەی دەدا بۆ جەنگ و شەهید بوون!!

جەنگەکە بڵێسەی سەند و، هەر چوار کوڕەکەی چوونە پێشەوە و، بێ باکانە لە دژی دوژمنەکەیان جەنگان، بێ گوێدانە مردن..هەتا هەموویان ئاواتەکەیان هاتە دی..

ئەوەتا ئێمە چاودێری خەنساء دەکەین لە کاتێکدا هەواڵەکەی پێدەگات، بێ گومان هێزی باوەڕ، پرشنگی پێ دەبەخشێت و، لە ڕوخساردا دەردەکەوێت... هەواڵەکەی پێ گەیشت.. هیچ دانەما و دڵتەنگ نەبوو..

دڵنیا بوونەکەی هەموو لایەکی پڕ کرد و، وتی: (سوپاس بۆ خودا کە ڕێزی کوژرانی هەموویانی لێ نام، لە پەروەردگارم خوازیارم لە نێو ناز و نیعمەت و ڕەحمەتی خۆیدا بە یەکترمان شاد بکاتەوە).

خەنسائی _دایك_ دڵتەنگ نەبوو، خۆ گەر لێرە خۆر بە کوژرانی چوار کوڕەکەی ئاوا بوو بێت، ئەوا لەوێ ئێستا خەریکە بە بەرزی لە ئاسۆکانی فیردەوسی باڵادا هەڵدێت و...لەسەر ڕووبارەکانی بەهەشت پڕشنگ دەداتەوە و، ئەمیش شانازی دەکات و سەر بەرزە بە شەهید بوونیان..

بە ڕاستی خەنساء نمونە بوو، کە شوێن پێی هەڵبگیرێ، لە لایەن ئافرەتانی ئازاد و بەڕێز و، خوشکانی بە ئەمەك و خۆشەویست و، هاوسەرانی چاك و دەست پاك و، دایکانی جەسوور و خۆڕاگر، کە منداڵەکانی لەسەر ئارامگری و تێکۆشان و، چاکە و باوەڕ پەروەردە دەکرد..

خەنساء _ڕەزای خوای لێ بێت_ لە سەرەتای خەلافەتی عوسمانی کوڕی عەففاندا (ﷺ) ساڵی _٢٤ی کۆچی_ کۆچی دوایی کرد[1]

---

[1] (کرائم النساء) أحمد محمد جمال.
(نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر" بە پوختە و دەستکاریەوە"..

# زوبێدەی کچی جەعفەر

## کەوەزای هاشمی لەیەدەا زینرو

لە هەرە دیارترین ئافرەتانی ئیسلامە و، ئەستێرەی دەمەوبەیانە لە ئاسمانی مەزنەکاندا،... ژیانی لاپەڕەیەکی مەزنە لە لاپەڕەکانی مێژووی ئیسلام..

بەهۆی چاکەکاری زۆر و دەست کراوەیی و، دڵ فراوانی و، ژیری بێ وێنە و، بێ گەردی ئاکاریەوە وەك نمونە دەهێنرێتەوە و باسی دەکرێت..

ئەوەش میراتی دایکانی هۆشمەندێتی لە بنەماڵەکانی (بەنی هاشمی و... لە خاوەن چاکە و باشە بوو، هێندە کاری مەزن و چاکی هەبوو کە بیکاتە یەکێك لە دایکانی چاکە خواز "أمهات المحسنین" لە ئیسلامدا.

ئەمەش "زوبێدەی کچی جەعفەر"ە، پەروەردە کراوی نێو تەلاری خەلیفەکانە، (المنصور) باپیرەتی و، (مەهدی) مامەیەتی و، (الرشید) مێردی و، (محمد الامین)یش کوڕی...

(مەنصور)ی باپیری زۆری خۆش دەویست و، بە: "تۆ وەك کەرێی سپیت بەڵکو تۆ کەرێیت (أنت کالزبد بیضاء بل أنت زبیدة)، بانگی دەکرد و، ئەو نازناوەی لێ نابوو، بەوەش زوبێدەی لای گەورە بوو، خاوەنی هێزێکی پەنهان و دەروونێکی سەرنجراکێش بوو، گواسترایەوە بۆ هاروون ڕەشیدی ئامۆزای، هارون ڕەشیدیش لەم هاوسەرگیریەدا هاوسەرێکی ئەمەکدار و، ئارامگەیەکی پڕ خۆشەویستی دەست کەوت و، لە دڵیدا جێگەیەکی بەرینی بۆ ئامۆژگاری و ڕاوێژ کردن بە زوبێدە تەرخان کرد بوو، لە کاتێکدا کە لەسەر مەزنترین تەخت بوو کە مێژووی عەرەب لەو چاخەدا ناسیبێتی.

ساڵانێکی پڕ بەختیاری گوزەراند و، (ئەمین)ی کوڕی لێ بوو، هەتا کەنیزەك بە دیاری هاتنە نێو کۆشکەوە، کە لە چاکترین کۆشکەکانی کیسرا و قەیسەرەکانەوە هاتبوون، زوبێدەش وەك هەر ئافرەتێکی دیکە دڵتەنگ بوو پێیان، بەڵام خۆی راگرت و ئارامی گرت لەسەر غیرە کردنیان و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی ڕەشید...

لەگەڵ ئەوەشدا زوبێدە بە خاوەن بیروڕا لە دڵی ڕەشیدا وکۆشك و دەوڵەتەکەیدا مایەوە...

ئارامگرتنەکەشی بەرەو کارێکی پایەدار ڕێنمایی کرد، ئەوە بوو قورئانی پیرۆزی فێری سەد کەنیزەکی کرد و، گوێی لە خوێندنەوەیان دەگرت کە وەك گیزەی هەنگ وا بوو، لەم گوێ بیستبوونەی قورئانی پیرۆزیشدا سوکنایی و دڵئارامی بۆ دەهات..

وەك سوننەتی خوا لە دروستکراوەکانیدا ..ڕەشید مرد..پاش خۆی کوڕەکەی جێنشینی گرتە دەست، بەڵام بەهۆی ئەو ئاشووبەی کە دڵ پڕ کینەکانی لایەنگری مەئمون بەرپایان کرد، ئاگری دوو بەرەکی لە نێوان (ئەمین) و (مەئمون)دا کە لە باوکەوە برای بوو هەڵگیرسا.

لەو ململانێیەدا هەر دەبوو یەکێکیان بکەون، زوبێدەش ئەگەر چی ئەمینی کوڕی خۆشەویستی بوو، بەڵام خوازیاری چارەنووسێك نەبوو بۆ مەئمون کە بۆ ئەمین پێی خۆش نەبێت... زۆر دڵنیاش بوو لە سەرکەوتنی کوڕەکەی لەو ململانێیدا لەگەڵ مەئمونی برای.. لەبەر ئەوە عەلی کوڕی عیسای سەرکردە کە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای مەئمون دەچوو دەرێ بە جۆرێك ڕایسپارد کە مێژوو ڕاسپاردەکەی تۆمار بکات، وەگ بەڵگەیەکی بێ گەردی دەروونی و، هیمەت بەرزی و، ڕەسەنیی بنەچەی و، ئاکار پەسندی.. پێی ووت: " ئەی عەلی : ئەمیری باوەڕداران گەرچی کوڕمە، من بۆ مەئمونیش پەرۆش و بەسۆزم و پێم خۆش نیە تووشی ناڕەحەتی و ئازار ببێت، جا ئاگاداری مافی

مەئمون بە لەمەڕ ئەمینی برای و، وەك کۆیلە سەرکزی مەکە، مەیشکێنە بە بەستنەوە و زنجیر و کۆت کردن و، زۆری لێ مەکە بۆ ڕۆیشتن و، لە ڕۆیشتندا هاوشانی مەڕۆ و، لە پێشیەوە سواری ئەسپ مەبە و، جڵەوی وڵاخەکەی بۆ بگرە لە ڕۆشتندا".

بەڵام گومانەکەی زوبێدە وا دەرنەچوو، لە ململانێی نێوان هەردوو برادا ئەمین کوژار و، مەئمونیش دەستی لە کوشتنەکەیدا نەبوو، بەڵکو تیری وێڵی یەکێك لە سەرکردەکان لێی دا و کوشتی...

ئەمجا مەئمون دەچێت بۆ لای زوبێدە، پۆزشی بۆ بهێنێتەوە و، پێی دەڵێ: " ئەی خاتوونم.. غەمگین مەبە من لە جێی ئەمین دەبم بۆت".

ئەویش ژیرانە وەڵامی دەداتەوە: " چۆن غەمبار نەبم کە برایەکی وەك تۆی لە دوای خۆی جێ هێشتووە؟!!".

ئەوەندەش بە کوڵ گریا تا مەئمونیش دەستی کرد بە گریان و..پاش ئەوە بە غەمباری و خەفەتباری ژیا، هەردەم تازیە بار بوو بۆ کوڕەکەی...

پاشان لە حەج کردنی ماڵی خودا مەزنترین سوکنایی و دڵنەوایی بەدی کرد.

هەر بۆیە خۆی ئامادە کرد بۆ سەفەر کردن بەرەو ئەو شوێنەی نیگای تێدا هاتۆتە خوارێ و، قورئانی تیا دابەزیوە و، زەوی پێغەمبەری ئازیز بووە (ﷺ).

زوبێدە بینی خەڵکی و حاجیەکان لە مەککە زۆر پێویستیان بە ئاوە و تەنانەت بۆ قومێ ئاو تینون و، یەك جەوەندەی بە دینارێك دەکڕن، ئەمە نیگەرانی کرد و گریا و ڕاستگۆیانە سوێندی خوارد کەچی لە توانادا بێت ئەنجامی بدات بۆ دابینکردنی ئاو بۆ دانیشتوانی مەککە و حاجیەکان...

هەروەها زوبێدە لە کاتی حەج کردنەکەیدا ئەوەندە چاکە و کاری جوانی ئەنجام دا قسە بۆ کەس نەهێڵێتەوەو، ڕێگەش لە بەردەم شانازی کاردا نەمێنێتەوە، ئەمەش بەهۆی دروستکردنی چەندین مزگەوت و خانو و پەناگە

و شوێنی ئاو خواردنەوە لەسەر ڕێگەی مەککە، هەموو ئەمانە لە ڕووی چاکێتیەوە زمانێکە و تا هەتایە باس لە چاکەی دەکات، ئەمانەش هیچ شایانی باس کردن نیە ئەگەر لەگەڵ شانازییە نەمرەکەیدا (کانی زوبێدە) بیپێوین، چونکە ئەو کانیە ئاوی بێگەردی شادی ژیانی گەڕاندەوە بۆ (ئوم لقورا) کە جێی سەرنجی موسڵمانانە و، ئومێدی یەکخواپەرستانە...

بەهۆی ئەو کانیەش کە هەڵی کەند، ناسۆر و بار قورسی لەسەر شانی هەزاران حاجی ماڵی خوا لابرد کە لە دوورەوە بەسەر شان ئاویان دەهێنا و نارەحەتی دەکردن، لێرەوە ئەگەر باسی لە هەموو ناوچەکاندا نەمێنێت و، خەڵکی لە گشت شوێنێ چاکەکانی لە یاد بکەن، ئەوا ناوی بە هەمیشە زیندوویی و ئالا شەکاوەیی دەمێنێتەوە چەندێ خوا ویستی لەسەر بێ لەو دۆڵە پیرۆزەدا، کە جێی بەیەك گەیشتنی میوانانی ماڵی خودایە، لە کاتێکدا کە بەرەو بەرزاییەکانی بەزەیی بەرز دەبنەوە و فرمێسك لە چاوانیان قەتیس ماوە و بە یەك دەنگ هاوار دەکەن: "لبیك اللهم لبیك" خۆ ئەگەر هەڵوێستەکانیان تینوویان بکات، ئەوا ئەو سەرچاوە پاکە تینویەتیان دەشکێنێت و فێنکی دەبەخشێتە دەروونیان.

ئەمە شوێنەواری ئەو ئافرەتە نەمرەیە، کە هەتا ژیان بمێنێت باس لە چاکەکانی دەکات و شاهێدە لەسەر ئیمان و کارە پەسەندەکانی.

خۆ ئەگەر وەك ڕۆیشتنی خەڵکیش چوو، ئەوا زوبێدە لە ویژدانی مێژوودا بەردەوام لەو شازادە پایە بەرزانە دەبێت کە ئیسلام هەردەم شانازییان پێوە دەکات[1].

---

[1] (كرائم النساء) أحمد محمد جمال.
"شهيرات النساء في العالم الإسلامي" : قدرية حسين.
"المرأة العربية في جاهليتها وإسلامها" عبدالله عفيفي.
"بە پوختە و دەستکارییەوە".

# ڕابیعەی عەدەوی

## خواپەرستی دونیا نەویست

بە (ئوم الخیر)ی کچی ئیسماعیل ناودەبرا... ئافرەتێکی پایەدارە و نموونەیەکی بەرزە لە کاروانی ئافرەتانی چاکەکار و گوێڕایەڵ و دونیا نەویست دا، بگرە لە دونیا نەویستی و تەقوا و چاکە و زانست و، زانین و ئەدەبدا پێش ئافرەتانی سەردەمەکەی کەوتبوو.

زانایان و پارێزکاران سەردانیان دەکرد و، لە چاکە و تەقواکەی و، بەردەوامی پەرستشیدا ئارامی دەروونی و، بە یاد هێنانەوەی خودایان بە دەست هێنا..بەڵێ..ئەوە رابیعەی عەدەویە..قەدەر گەیاندیە بەندێتی پیاوێکی ستەمکار و، ماوەیەکی زۆر بەندی کرد، پاشان فرۆشتی بە پیاوێکی دیکە کە دڵ ڕەقیەکەی لەوەی پێشتر کەمتر نەبوو، بەڵام ئەو بەرگەی گرت و ئارامگر و خۆڕاگر بوو، هەتا خوای گەورە پاش ئەو بەڵایە دەرووی خێری لێ کردەوە، ئەوە بوو ڕۆژێکیان گەورەکەی چاوی پێ کەوت لە ژوورەکەی خۆیدا نەوازش و ملکەچیەوە خواپەرستی دەکات و، سکاڵای کەم دەستی خۆی دەکات لە ئەمەکداری بەرانبەر پەروەردگار لە پەرستشیدا، چونکە ئەو بەند کراوە و هیچی بە دەست نیە، ئەمجا خوای گەورە سۆز و بەزەیی خستە دڵی گەورەکەی و، سەرسام بوو بە پەرستشە چاکەکەی، ئەوە بوو ئازادی کرد، ئەویشماڵی

گەورەكەی بەجێ هێشت تا بە ڕەنجی شانی خۆی بژی و، یەكلا بێتەوە و خۆی تەرخان بكات بۆ پەرستشێكی ئازادانەی دوور لە هەموو كۆت و بەندێك سەربەست لە گشت زمانێك..

ڕۆژێكیان سۆفییەك سكاڵای ڕەوشی دونیا و تیاچوون و كۆتاییهاتنی كرد لای، ئەویش لە تەصەوفی ڕاستەقینە تێی گەیاند و پێی وت: تۆ زۆر باسی دونیا دەكەیت و، لەسەر زمانت دووبارە دەبێتەوە جا تۆ شەیدای دونیایت و، سەرقاڵی بە خۆشیەكانیەوە، ئەگەر پەیوەندی خۆت لەگەڵدا ببڕیایە، ئەوا بەمجۆرە باست لە چاكە و خراپەكانی نەدەكرد.

رابعە دونیا نەویست و قانع بوو، ئەوەی خەڵكی پێیان ببەخشایە هەمووی ڕەت دەكردەوە و دەیووت: (هیچ پێویستیەكم لە دونیادا نیە)...

جارێكیان كەسێك بەخششێكی زۆری بۆ هێنا، رابعەش پێی وت: ئایا نازانیت خوای گەورە ڕۆزی ئەوانەش دەدات كە لێی بێ ئاگان، ئیدی ئەبێ چۆن بێت بۆ ئەو كەسانەی یادی دەكەنەوە؟ جا من چۆن دیارییەكەت وەربگرم كە نازانم چۆن سامانەكەت پەیدا كردووە، لە حاڵاڵەوەیە یا لە حەڕام؟

ڕۆژێكیان پرسیاری لێ كرا: ئایا خوا لە بەندە پەشیمانەكانی خۆش دەبێت؟

لە وەڵامدا وتی: خوای گەورە بۆیە پەشیمانی بە بەندەكانی داوە تا تەوبە بكەن، جا لەبەر ئەوەی پاشگەز بوونەوەی تێدا جوڵاندن و، تەوبەیەكی چاكی بۆ ڕەوانە كردن، ئەوا لێخۆشبوونی فراوانی بۆ دابین كردوون.

ڕۆژێكیان بە هەندێ میوانی وت: سێ شت سەرقاڵیان كردووم:

یەكەم: ئایا لەسەر باوەڕی تەواو دەمرم؟

دووەم: ئایا لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا نامەی كردەوەكانم بە دەستی ڕاستم وەردەگرم؟

سێیەم: لە ڕۆژی حەشردا نازانم لەگەڵ چ كۆمەڵێكدا دەبم..

لەگەڵ ئەوانەدا دەبم کە بەرەو بەهەشت دەچن، یان لەگەڵ ئەوانەی لە نێو ئاگردا تیا دەچن؟

ئەوەش هیچ راست نیە کە دەدرێتە پاڵی گوایا بە ڕووت و بەڕەڵایی و سەرپێچی خودا گەورە بووە، ئەو وتە خراپانەش راست نیە کە لە بارەی دونیا نەویستیەکەیەوە دراوەتە پاڵی وەك عەشقی خودایی و گۆرانی وتن بۆ خودا و زیادە ڕەوی دیکەی سۆفیگەریانە، چونکە خودای پاك و بێگەرد باڵا دەستە بەسەر دروستکراوانیدا و چاوەکان پێی ناگەن.

لە کاتی سەرەمەرگیدا کەنیزەکەکەی بانگ کرد و پێی وت: ئازارم مەدە بە مردنم و لەم کراسەمدا کفنم بکە (کە کراسێك بوو لە خوری دروست کرابوو، کاتێك خەڵك دەخەوتن لەبەری دەکرد)، خزمەتکارەکەش ئەو کراسەی کردە کفنی کە لە خوری دروست کرا بوو و لەبەری دەکرد لە ساڵی ١٣٥ی کۆچی لە (بیت المقدس) نێژرا.

خوای گەورە ڕەحم بە رابعەی عەدەوی بکات و، لە هاوەڵانی بەهەشتی دابنێت، چونکە ئەو ژیانی لە پەرستش و پەروەردە کردنی دەروونی لەسەر چاکبوون و تەقوا بەسەر برد و، نمونەیەکی دەگمەنی ئافرەتانی موسڵمان و، بڕواداری خواپەرست و، دونیا نەویست و گوێڕایەڵ بوو[١].

---

[١] (نساء زاهدات) محمد خير يوسف.
(نساء فاضلات) عبدالبديع صقر.

# ئومامەی کچی حارس

## خاوەنی وەسیەتە بەناوبانگەکە

لە ئافرەتە دیارە زمان پاراو و رەوان بێژ و، هۆشمەند و خاوەن بیروڕاکان بوو..(حارث)ی کوڕی (عمرو)ی پادشای (کننده) کچەکەی خواست، باوکیشی پێی دا، ئەمامە بە کچەکەی وت: ئەگەر ئامۆژگاری لەبەر چاکی ئاکار و ڕەوشت وازی لێ بهێنرایە، ئەوا تۆ پێویستیت پێی نەبوو، بەڵکو یاد هێنانەوەیە بۆ بێ ئاگا و پاڵپشتە بۆ ژیر و هۆشمەندەکان..

کچەکەم.. ئافرەتان بۆ پیاوان دروست بوون و، پیاوانیش بۆ ئافرەتان دروست کراون.. دەی کچەکەم: تۆ لەو ڕەوشەدا دادەبڕێیت کە تێیدا دەرچوویت و، ئەو هێلانەیە بەجێ دەهێڵیت کە تێیدا ڕاهاتوویت، بەرەو هێلانەیەك کە پێی ئاشنا نیت و، هاوڕێیەك لەگەڵی ڕانەهاتووی و، بەهۆی دەستەڵاتەوە بەسەرتا دەبێتە چاودێر و سەردارت، تۆش وەك کەنیزەك بە بۆی، ئەویش وەك کۆیلە دەبێت بۆت..

کیژۆڵەکەم: دە خەسڵەت لە منەوە وەربگرە، دەبێتە توێشوو و یاد هێنەرەوە بۆت: هاوڕێی قەناعەت بە و، هاوژینیت بەجوانی گوێڕایەڵی و گوێبیستی بێ و، ڕابێ لەسەر ئەو شوێنەی چاوی دەکەوێتە سەری و بەسەر کردنەوەی ئەو شوێنەی لوتی بۆنی دەکات، با چاوەکانی شتی دزێوت تێدا

نەبینێت و، تەنها بۆنی خۆشت تێدا هەست پێ بکات و، کلیش چاکترینی شتە باشەکانە، ئاویش باشترین چاکی ون بووە و، ڕابێ لەگەڵ کاتی نانخواردنی و، هێمن بە لە کاتی خەوتنیدا، چونکە گەرمی برسێتی بڵێسەدارە و، بێزار کردنیش لە کاتی خەوتندا ناڕەحەتکارە، پاراستنی ماڵ و سامانەکەی و، چاودێریکردنی دەروون و حەیا و منداڵەکانی، چونکە پاراستنی سامان چاك ڕاگرتنی ڕێز گرتنیەتی، چاودێری کردنی منداڵ و حەیا چاك ڕێککردنە..

هیچ نهێنیەکیشی بڵاو مەکەرەوە و، سەرپێچی فەرمانی مەکە، چونکە گەر نهێنیت بڵاو کردەوە، ئەوا لە فێڵی دەرباز نابیت و، گەر سەرپێچیشت کرد ئەوا دڵی بەرانبەرت گەرد دەگرێت..پاش ئەمە ئاگاداری شادی و خۆشی بە لە کاتی ناخۆشی و تەنگانەی ئەودا، وە دڵتەنگی و غەمگینی لە کاتی شادی ئەودا، چونکە سیفەتی یەکەم لە کەمتەرخەمیەوەیە، سیفەتی دووەمیش لە نەزانیەوەیە، زۆر سوور بە لە بەگەورەگرتنی، ئەویش زۆرتر سور دەبێت لە ڕێز گرتنت، زۆریش سوور بە لەسەر ئەوەی ڕێك بکەوی لەگەڵی، ئەو زیاتر لەگەڵت پێکدێت..

ئەوەش بزانە کاتێ دەگەیتە ئەوەی کە حەزت لێیەتی کە ڕەزامەندی ئەو بخەیتە پێش ڕەزامەندی خۆتەوە و، ئارەزووی ئەو بخەیتە پێش ئارەزووی خۆتەوە لەوەی کە پێت خۆشە و ڕقت لێیەتی و.. خوای گەورەش باشترینت بۆ هەڵدەبژێرێت..

کچەکەش ئەم ئامۆژگاری و وەسیەتەی لێ وەرگرت و، شوێنی لە لای بەرز بوو، ئەو حەوت پادشایەی لێ بوو کە پاش خۆی یەمەنیان بەڕێوەبرد[1]..

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبديع صقر.

# بەشی حەوتەم

# ئافرەتانی شوێنکەوتوو (تابعین)

عائیشەی کچی طەلحەی کوڕی عبیداللە.

(هجیمە)ی کچی (حویەی) ئەوصابیە.

عەمرەی کچی (عبدالرحمن) کوڕی زرارە.

عائیشەی کچی عەلی کوڕی ئەبی فەتح.

شەهدەی کچی ئەحمەدی کوڕی دینەوەریە.

صەفیەی کچی ئەبوبەکری کوڕی ئەیوب.

عائیشەی کچی موحەممەدی مەقدەسی.

(خناثە)ی کچی (بکار)ی مەغافری.

فاطمەی کچی عبداللەی کوڕی (المتوکل علی اللە).

زەینەبی کچی ئەحمەدی کوڕی عبدالرحیم.

سەیدەی کچی (عبدالغنی) عەبدەری.

فاطمەی کچی ئەسعەدی خەلیل.

(ست الملك) کچی (عبدالعزیز باللە)ی فاطمی.

فاطمەی کچی موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی سەمەرقەندی.

فاطمەی کچی موحەممەدی دەیروطی.

ئەمیرەی بەڵخ.

صەفیەی کچی (شیبە)ی کوڕی (عثمان)ی کوڕی (أبی طلحة).

(کریمە)ی کچی (محمد)ی کوڕی (حاتم).

خەیزەران: دایکی هارون ڕەشید.

(فاطمەی)ی کچی (عبدالملك)ی کوڕی (مروان).

(قطر الندی): خێزانی خەلیفە (معتضد).

(خوند تتر): کچی (محمد)ی کوڕی (قلاوون).

(هند)ی کچی (نعمان)ی کوڕی (بشیر).

(مزینە)ی کچی (مروان)ی کوڕی (محمد الاموی).

(فاطمە)ی کچی (محمد)ی کوڕی (حسین).

(عاتکە)ی کچی (یزید)ی کوڕی (معاویە).

(عائشە)ی کچی (یوسف)ی باعونی.

# عائیشەی کچی تەلحەی کوڕی عبیدالله

لە ئافرەتە دەگمەنەکانی سەردەمەکەیەتی لە ڕووی داوێن پاکی و ڕەوشت بەرزی و جوانیەوە، شوی کردووە بە (عبدالله)ی کوڕی (عبدالرحمن)ی کوڕی (أبوبکر الصدیق)، کە جگە لەم لە هیچ هاوسەرێکی دیکەی منداڵی نەبوو بوو..

پاشان (مصعب)ی کوڕی (زبیر) خواستی و بەدەستی تووشی ئازار بوو، (عائشە) سوێندی لە (مصعب) خواردو و پێی وت: تۆ بۆ من وەك پشتی دایکمی، (مصعب) هەوڵی زۆری لەگەڵدا تا قسەی لەگەڵ بکات، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو، ئەمجا کێشەکەیان بردە لای شوعەیبی شارەزای خەڵکی عێراق و، ئەویش پێی وتن: ئەوە هیچ نیە.

کاتێ (مصعب) کوژرا، شووی کرد بە (عمر)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (معمر)ی تەمیمی و هەشت ساڵی لەگەڵ بردە سەر و مێردەکەی مرد، ئەمیش بۆی گریا و چاکەکانی دەژمارد، لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵ کرا، پێی وتن: ئەم لە هەموویان بەڕێزتر و بەسۆزتر بوو بۆم و، حەزم کرد لە دوای ئەم شوو نەکەمەوە..

کاتێ بێوەژن کەوت، ساڵێ لە مەککە دەژیا و ساڵێکی تری لە مەدینە دەبردە سەر..

(عائشە) لە پووریەوە (دایکی ئیماندااران) _کە خوشکی دایکی بوو _ فەرموودەی گێڕاوەتەوە، (طەلحە)ی کوڕی (عبداللە)ی کوڕی (عبدالرحمن)ی کوڕی (أبو بکر الصدیق) و (طەلحە)ی کوڕی (یحیی)ی برازای و (عطاء)ی کوڕی (أبی رباح) و کەسانی تر و... هەر پێنج ئیمامەکە (الجماعة) فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە.. (یحیی)ی کوڕی (معین) دەڵێت: عائیشە متمانە پێکراو و بەڵگەیە.. (العجیلی)یش دەڵێت: مەدینەییەکی شوێنکەوتووی متمانە پێکراوە، (إبن حبان)یش لە متمانە پێکراوەکاندا هێناویەتی[١]..

---

[١] لە (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە پوختە و دەستکارییەوە).

# هەجیمەی کچی حویی ئەوسابی دیمەشقی
# ئوم دەردائی بچوك

شارەزایەکی زانا و، خواپەرستێکی کارکردوو، دونیا نەویستێکی ژیان زبر بوو، ژنی (ئەبو دەرداء) بوو، کاتێك مرد، (معاویە)ی کوڕی (ئەبو سوفیان) داخوازی کرد، بەڵام ئەم وتی: نا سوێند بە خوا شوو ناکەمەوە لە دونیادا، تا بە ویستی خوا لە بەهەشتدا شوو بە (ئەبو دەردا) بکەمەوە..

بە زۆری لە لای بەنی ئومەیە بوو، شەش مانگ لە (بیت المقدس) و شەش مانگیش لە (دیمەشق) دەمایەوە..

(عون)ی کوڕی (عبدالله) دەڵێت: ئێمە لە لای (ئوم دەرداء) دادەنیشتین و یادی خودامان دەکردەوە، پێیان وت: لەوە دەچێت بێزارمان کردبێت؟ ئەویش پێی وتن: وا دەزانن کە ئێوە منتان بێزار کردووە، لە کاتێکدا من داوای پەرستشم کردووە لە هەموو شتێکدا، هیچ شتێکم نەبینیووە وەك کۆڕی یادی خوا سارێژی دەروونم بکات..

هەروەها دەڵێت: باشترین زانست مەعریفەیە، ..بە منداڵی فێری دانایی ببن لە گەورەییدا کاری پێ دەکەن، چونکە هەموو جوتیارێك ئەوە دەچنێتەوە لە چاك و خراپ کە چاندوویەتی..

لە وتەیەکی دیکەدا دەڵێت: ئەوە چیتانە.. هەیە لە ئێوە دەڵێت: خوایە

ڕزقم بدە، لە کاتێکدا دەزانێت کە خوای گەورە دینار و درهەمی لە ئاسمانەوە بەسەردا نابارێنێت، بەڵکو ڕۆزی هەندێکیان لە هەندێکی دیکەتانەوە دەدات، جا ئەوەی شتێکی پێ بەخشرا ئەوا با وەری بگرێت، خۆ گەر دەوڵەمەندیش بوو ئەوا با بیداتە برایەکی هاو ئاینی کە پێویستی پێیەتی، ئەگەر هەژاریش بوو ئەوا با پێویستی خۆی پێ جێبەجێ بکات و، ڕۆزی خۆی لە لای خودا نەگەڕێنێتەوە..

جارێکیان پیاوێك پێی وت: من دەردێك لە دڵمدا هەست پێ دەکەم کە دەرمانی نیە و، هەست بە دڵ ڕەقی و ئومێد درێژی دەکەم.. ئەمیش پێی وت: بڕۆ سەردانی گۆڕستان و مردوان ببینە..چونکە ترس لە دڵی ئادەمیزاددا وەك سوتانی برین وایە کاتێ کە موچڕکەی پێدا دێت..

ئافرەتان لەگەڵ (ئوم دەرداء)دا خواپەرستیان دەکرد، کاتێ بێ هێز بوونایە لە نوێژ کردن بە ڕاوەستانەوە بە پەت خۆیان دەگرت.

زۆر فەرموودەشی لە (ئەبو دەرداء) و (سەلمانی فارسی) و (ئەبو هریرە) و (کعب)ی کوڕی (عاصم)ی ئەشعەری و (عائیشە)ی دایکی باوەڕدارانەوە گێڕاوەتەوە..

زۆر فەرموودەشیان لێوە ڕیوایەت کردووە..لەوانە: (جبیر)ی کوڕی (مطعم) و، (أبو حاز)ی کوڕی (دینار) و، (إسماعیل)ی کوڕی (عبیدالله)ی کوڕی (أبی المهاجر) و، (مهدی) کوڕی (عبدالرحمن)ی برازای و، (أبو عمران) ئەنصاری و، زۆر کەسی دیکە..

(مسلم) و (أبو داود) و (الترمذي) و (ابن ماجه) ڕیوایەتەکانیان هێناوە.

پاش ساڵی ٨١ی کۆچی وەفاتی کردووە، ڕەحمەتی خوای لێ بێت[١].

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# عومرەی کچی عبدالرحمنی کوڕی ئەسعەدی کوڕی زرارە

فەرمووودەناس و زانایەکی شارەزا بوو.. لە (عائشە)ی دایکی بڕوادارانەوە کە لەلای بوو فەرمووودەی زۆری لەبەر کردووە.

هەروەها فەرمووودەی لە (حمنە)ی کچی (جحش) و، (أم سلمە) و، (حبیبە)ی کچی (سهل) و کەسانی دیکەوە ڕیوایەت کردووە و...(عروە)ی کوڕی (زبیر) و (محمد)ی کوڕی (عبدالرحمن)ی برای و هەردوو کوڕەکەی و کەسانی تریش فەرمووودەیان لێ گێڕاوەتەوە.. (عبدالعزیز) دەڵێت: کەس نەماوە هێندەی (عومرە) شارەزای ئەو فەرمووودانە بێت کە (عائشە) گێڕاویەتیەوە..

(إبن أسعد)یش وتوویەتی..(عومرە) زانایە..

(عمر)ی کوڕی (عبدالعزیز) نامەی نارد بۆ (ابوبکر)ی کوڕی (محمد)ی کوڕی (حزم) کە سەیری فەرمووودەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) یان سونەتە رابردووەکانی، یان فەرمووودەکانی (عومرە) بکە و، بینووسە چونکە لە وانەکانی زانین و ڕۆیشتنی کەسەکانی دەترسم..

هەموو ئیمامەکان (الجماعە) فەرمووودەیان لێ گێڕاوەتەوە، لە ساڵی ٩٨ی کۆچیدا وەفاتی کردووە[1]..

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە دەستکارییەوە).

# عایشەی کچی علی کوڕی محمدی کوڕی أبي الفتح

ساڵی ٧٦١ی کۆچی لە قاهیرە لە دایك بووە..

زانایەکی پایەداری خاوەن ئاین و بە تەقوا بووە، فەرموودەی گێڕاوەتەوە و ئیمامەکان لێیانەوە بیستووە، سەردانی (بیت المقدس) و (خلیل)ی کردووە و فەرموودەی گێڕاوەتەوە تێیاندا و هەندێ لە کەسە دیارەکانیان لێیان وەرگرتووە..

زۆر بە خێرایی شتی لەبەر دەکرد و زۆر زیرەك بوو، ژیاننامەی پێغەمبەری هەموو لەبەر بووە _بە جۆرێ کە باسی هەر جەنگێك بکرایە وەخت بوو هەمووی بە تەواوەتی باس بکات_ و کتێبەکانی فیقهی دەخوێندەوە و لێی تێدەگەیشت و شیعری زۆری لەبەر بووە، هەروەها بەشی زۆری (سیرەی ئیبن فرات) و، (سلوان)ی (المطاع)ی (ابن ظفر)ی لەبەر بووە و، وانەی پێ دەوتەوە..

(عائشە)ی کچی (علی) هەر لە منداڵیەوە، چاکە کار و دیندار و بەردەوام بو لەسەر نوێژ و پەرستیش و یادی خودا، هەتا لە ساڵی ٨٤٠ی کۆچی دونیای بەجێ هێشت[١].

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# شوهدەی کچی ئەحمەدی دەینەوەری

زانایەکی پایەدار و، نووسەرێکی بەرز و، ئاین پەروەر و چاکساز و، خاوەن چاکە و چاکەخوازی بووە..لە شاری بەغدا لە دایك بووە و، لە گەورە زانایانی سەردەمەکەیەوە وانەی وەرگرتووە، وەك (أبي الخطاب) (نصر)ی کوڕی (أحمد) و، (أبی بکر) (محمد)ی کوڕی (أحمد)ی (الشاشی) و، (ثابت)ی کوڕی (بندار).. (ابن الجوزی)..

(علی) کوڕی (هبه الله)ی شافعی وانەی لێ وەرگرتووە و، (عبدالرحمن)ی کوڕی (عبدالوهاب)ی حەنبەلی بەشی چوارەمی (أمالی المحاملی) لێوە ڕیوایەت کردووە، هەروەها (یونس)ی کوڕی (سعید)ی کوڕی (مافر)ی کوڕی (جمیل)ی (القطان المقري) کتێبی (محاسبه النفس)ی (إبن أبی الدنیا)ی لێوە گوێبیست بووە.

ڕیوایەتیشی لە (إبراهیم)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (الجنید الختلی)یەوە کردووە و، بەشی نۆیەمی لە (فوائد)ی (عثمان)ی کوڕی (أحمد)ی کوڕی (عبدالله الدقاق)ی گێڕاوەتەوە.

لە ڕۆژی (١٣)ی مانگی (محرم)ی ساڵی (٥٧٤)ی کۆچی شوهدە ڕەحمەتی خوای لێ بێت، لە کاتێکدا تەمەنی زیاد لە نەوەد ساڵ بوو کۆچی دوایی کرد[1].

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەییەوە).

# صەفیەی کچی ئەبوبەکری کوڕی ئەیوب

شازادەیەکی پایەدارە، لە ساڵی (٥٨٢)ی کۆچی لە قەڵای حەلەب لە دایك بووە.

کچی پادشای دادپەروەر (ئیبن أبی بکر)ی کوڕی (أیوب)ە، پاش مردنی شا (عبدالعزیز)ی کوڕی فەرمانڕەوایی شاری حەلەبی گرتە دەست، خاوەن کەسایەتی بووە و، وەك ناودارترین دەستەڵاتدار فەرمانڕەوایی دەکرد و، لە ماوەی شەش ساڵی دەستەڵاتیدا وڵاتی بە چاکترین شێوە بەڕێوەبرد و، قوتابخانەی فیردەوسی لە حەلەب دروستکرد و، وەقفێکی تایبەتی بۆ تەرخان کرد و، ژمارەیەك لە قورئان خوێن و شارەزایانی تێدا کۆ کردەوە، هەروەها مزگەوتێکیشی تێدا دروست کرد، بینایەکی زۆر گەورە و فراوان بوو، لە پێشەنگی ئەو باڵەخانە دێرینانەیە کە میوانان دەچنە سەردانی و، سەریان سوڕ دەمێنێت لە جوانی و ڕازاوەییەکەی[١]..

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە پوختی و دەستکارییەوە).

# عائیشەی کچی محمدی کوڕی عبدالهادی مەقدسی

فەرمووودەناسێکی پایەبەرز و خاوەن سەنەدێکی پتەوە، لە (أبی عباس)ی حجارەوە (صحیح)ی بوخاری بە بیستن لێی ڕیوایەت کردووە، لەم کارەشدا تاقانە بووە، (صحیح)ی موسلیمیشی گێڕاوەتەوە بۆ کۆمەڵێك هاوەڵی (أبی عباس)ی کوڕی (عبدالدائم) و زۆر لەو شتانەی کە گوێبیستیان بووە و لەبەری کردوون گێڕاویەتیەوە و، ئیمامەکان لێیان وەرگرتووە..

سانا و نەرم و نیان بووە لە گێڕانەوەکانیدا.

(الحافظ ابن حجر) فەرموودەی لێیەوە ڕیوایەتی کردووە و، ژمارەیەك کتێبی بۆ خوێندۆتەوە، وەك (صحیح)ی بوخاری، هەروەها فەرموودەکانی زنجیرە یەکەمیەکان و مەسنەدی (الدارمی)یشی پێ خوێندراوە...

مۆڵەتی داوە بە ڕیوایەتەکانی (أبي الفتح العثماني) ..(عائشە) _ڕەحمەتی خودای لێ بێت_ ساڵی (٨١٦)ی کۆچی ماڵئاوایی لە دونیا کردووە[١].

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة . (بە دەستکاریەوە).

# خناسەی کچی بەکاری مەغافری

ئافرەتێکی تێگەیشتوو و زانا و ئەدەیب بوو.. ئاینپەروەر و چاکەخواز و، کردەوە چاك و خێرخواز بوو، بە هۆشمەندی و ئاین پتەویی ناسرا بوو، لە پێڕی ئافرەتانی موسڵمانی باوەڕدار و گوێڕایەڵ بوو، کە هەموو ئەو سیفەتانەی تێدا بوو کە خوای گەورە لێخۆشبوون و پاداشتی مەزنی بۆ ئامادە کردوون، لەگەڵ هاوسەرەکەیدا (کە فەرمانڕەوای مەغریب بوو) بیروڕا و تەگبیری هەبوو، چاکترین پاڵپشتی چاکە بوو بۆی و، فەرمانی بە چاکە پێ دەکرد و هانی دەدا لەسەری و، داواکاری و پێداویستیەکانی خەڵکی دەگەیاندە لای و، کەسانێکی خاوەن پێویستی و بەشەرم سەردانیان دەکرد، دواتر (مکناس)ی بەجێ هێشت و ڕوویکردە (حجاز) و، سەردانی شاری مەدینەی کرد و، لە شاری مەککە مایەوە بۆ ئیعتیکاف، هەوڵی زۆری دا بۆ هەژاران و پارە و سامانی زۆریشی پێ بەخشین و، خانوویەکیشی لە پاڵ دەروازەی (عومرە)دا کڕی و کردیە وەقف بۆ فێرخوازان و مامۆستایەك کە (صحیح)ی بوخاری دەوتەوە، لە ساڵی (١١٥٩)ی کۆچیدا لە شاری (فاس) لە وڵاتی مەغریب کۆچی دوایی کرد[١]..

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة . (بە دەستکاریەوە).

# فاتیمەی کچی عبداللای کوڕی المتوکل علی الله المطهر الحسنی

خاتوونێکی خانەدان و بەڕێز و زرنگ و ئاینپەروەر و چاکەخواز بووە و، ئەوەندەی پێویستی پێی هەبوو لە زانست و زانیاری هەیبوو..هەندێ لە کتێبەکانی (أصول الدین) خوێند بوویەوە، هەموو ڕۆژێکیش حەوت جوزئی قورئانی پیرۆزی دەخوێندەوە..

ئیمام (متوکل علی الله) (یەحیای) کوڕی (شرف الدین) خواستی، لە (جامع الاصول)دا جیاڕا بوون و، هاوکاری دەکرد لە چارەسەری کێشەکاندا..

ساڵی (٩١٠)ی کۆچی ماڵئاوایی لە دونیا کرد و، لە مزگەوتی (الوشلی) لە شاری (صنعاء) بە خاك سپێردرا[١].

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة . (بە دەستکاریەوە).

# زەینەبی کچی ئەحمەدی کوڕی عبدالرحیم

فەرمووده ناسێكی پایه بەرزە، لە ساڵی (٦٤٦)ی كۆچی لە دایك بووە..

لە (محمد)ی كوڕی (عبدالهادی) و (أحمد)ی كوڕی (عبدالدائم) و كەسانی دیكەوە زانستی وەرگرتووە و، (الذكي المنذري) و (أبو علی البكری) و كەسانێكی تر مۆڵەت و ئیجازەیان پێ داوە..

(محمد الوانی) زانستی پێ وتووە.. هەروەها (ابن بطوطة)ی گەڕیدە گوێبیست بووە، (إبراهیم الكتانی)و، (عبدالرحمن)ی كوڕی (أحمد الذهبي)یش هەواڵیان لێیەوە گێڕاوەتەوە، نزیكەی چل كتێبی و بەشەكانی لە لا خوێندراوەتەوە[١]..

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة . (بە دەستكاریيەوە).

# سیدەی کچی عبدالغنی عەبدەری

ئافرەتێکی زانای پایە بڵند بووە و، هەموو قورئانی پیرۆزی بە جوانی لەبەر بووە..

هەنـــدێ لـــە زانـــستەکانی خوێنـــدووە و بەشـــداری کـــۆڕ و کۆبوونـــەوە زانستیەکانی کردووە و، خەتێکی جوانی هەبووە و ئافرەتانی فێر کردووە و، بە خەتی خۆی چەندین جار کتـێبی (إحیـاء علـوم الـدین)ی غـەزالی و کتێبـەکانی تری ئەدەبی و خووڕەوشتی نووسیوەتەوە..

بەردەوام بووە لەسەر فێر کردن و پەرستشەکەی هـەتا بـۆ مـاوەی سـێ سـاڵ دانیشت و لە جێگەیدا کچەکەی وانەی دەوتەوە.

(سیدە) _ڕەحمەتی خودای لێ بێت_ هەموو ئەو پارەیەی بەهۆی فێر کردن و وانـە وتنـەوەوە دەسـتی دەکـەوت دەیکـردە خێـر و بەسـەر هەژارانـدا دابەشـی دەکرد.

ساڵی (٦٤٧)ی کۆچی، لە وڵاتی (تونس) کۆچی دوایی کرد[١].

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا کحالة . (بە دەستکاریەوە).

# فاتیمەی کچی ئەسعەد لخلیل

لـە باشـترین ئافرەتـانی سـەردەمەکەی بـوو، زانایـەکی پایـەدار و، خـاوەن زیرەکی و هۆشمەندی بووە، هەموو قورئانی پیرۆزی لەبـەر بـووە و، زۆرێـك لـە کتێبـەکانی تەفـسیری خوێنـد بـووە و، وانـەکانی فیقـه و (النحـو و الـصرف) و (البلاغه) و (البیان)ی لای ناودارترین زانایـانی سـەردەمەکەی خوێنـد بـوو..بـە جۆرێ پێـشی هـەموو ئافرەتـەکانی کـاتی خـۆی کـەوت لـە زانـست و زانیـاری و تێگەیشتندا..

لەگـەڵ مێردەکـەی بـە شـێوەیەکی دادپەروەرانـە فەرمانڕەوایـەتی خـەڵکیان کـرد لـە سـوریا و، ئـەو پایەیـە لـە خۆشویـستنی کـاری چـاکە و فێرکـردن و بەخشین بە هەزاران دووری نەخستەوە..

خانەیەکی بۆ پەروەردە کردنی بێ سەر پەرشتیار (هـەتیوان) و (ڕێبـواران) دروست کرد و، لـە سـامانەکەی بەشـێکی تـەرخان کـرد بـۆ کـاتی تەنگانـەی بـێ نـەوایان، هـەتا وای لێ هـات جێگـای خـۆی لـە دڵـی خەڵکیـدا کـردەوە و بویـە خۆشەویستی دڵان[١].

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە دەستکارییەوە).

# ست الملك بنت عبدالعزيز بالله

خاتوونێكی چاكەكارە، خاوەنی هێز و دەستەڵات و ڕاو بۆچوون و، سیاسەت و ژیریی و دانایی بووە..

(حاكم بامر الله)ی برای لە خراپەكاری و ستەمكاریدا تەواو ڕۆچوو بوو، بە جۆرێ خۆی سەری لێ شێوا بوو، سەریشی لە خەڵكی شێواند بوو، بێ تاوانانی دەكوشت، ماڵی خەڵكی تاڵان دەكرد و، ئافرەتانی دەكردە كەنیزەك و.. بانگەشەی خوایەتی دەكرد و، ئەوەی عەقڵ پێی ڕازی نەبێت هێنا بوویە ناو ئاینەوە..

(ست الملك)ی خوشكی هۆشداری پێدا، بەڵام ئەو قسەی ڕەقی بەرانبەر كرد و هەڕەشەی كوشتنی لێ كرد، هەر بۆیە ئەمیش دەستی دایە بیر كردنەوە و پلان دانان بۆ كوشتنی براكەی و ڕزگار كردنی وڵات و خەڵكەكەی لە دەست ستەم و گومڕاییەكانی..

بۆ ئەم مەبەستەش لەگەڵ (سیف الدولە)ی كوڕی (دواس)دا پلانێكی تۆكمەی دارشت كە لە میسر بوو، بەو مەرجەی ئەو خاوەنی سوپا و جێبەجێكاری و گەورە بەرپرسی دەوڵەت بێت و، (علی)ی كوڕی (حاكم)ی

كوڕیشی لە شوێنی باوكی دابنرێت، كە لەو كاتەدا هێشتا منداڵ بوو، (ابن دواس) چاودێری بكات و، ئاگای لێی بێت تا گەورە دەبێت..

بە پشتیوانی خوا پلانەكە سەری گرت و، دەنگ و سەدای الله اكبر و لا اله الا الله بەرز بوویەوە و نازناوی (الظاهر لاعزاز دین الله)یان لە (علی) ناو، خەڵكی كۆمەڵ كۆمەڵ سەردانیان دەكرد و پەیمانیان پێدا..

خوای گەورە پاداشتی (ست الملك)ی كچی (عزیز) بداتەوە بە چاكترین شێوە[1].

(ست الملك) ڕەحمەتی خوای لێ بێت. ساڵی (٤٠٥)ی كۆچی ماڵئاوایی لە دونیا كرد.

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە دەستكارییەوە).

# فاتیمەی کچی محەمەدی کوڕی ئەحمەدی سەمەرقەندی

ئافرەتێکی زانا و شارەزا و فەرمووده ناس بوو، زانست و زانیاری لە کۆمەڵێك زانا و فوقەها وەرگرتبوو، زۆر کەسیش لەوەوە فێر بوون، ژمارەیەك کتێبیشی لە بواری فیقهو فەرموودەدا داناوە، ئاستێکی مەزنیشی هەبووە لە دونیا نەویستی و پارێزکاریدا.

هاوسەردەمی پادشای دادپەروەر (نورالدین الشهید) بووە، زۆر جار بۆ کاروبارە نێوخۆییەکانی ڕاوێژی پێ کردووە و..هەندێ بابەتی فیقهیشی لە (فاتیمە) وەرگرتووە، پادشای دادپەروەر بەخششی پێ دەدا و پشتیوانی لێ دەکرد..

(فاطمة) خوای گەورە بیخاتە بەر ڕەحمەتی فراوانی خۆی لە شاری حەلەب کۆچی دوایی کردووە[1].

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبديع صقر. (بە دەستکارییەوە).

# فاتیمەی کچی محمدی دەیروطی

ئافرەتێکی زانای پایەدار بووە..هەموو قورئانی پیرۆز و .. عەقیدەی غەزالی و، (اربعون النووی) و، (الشاطبَتین) و (نونیة السخاوي) و، (مختصر أبی شجاع)ی لەبەر بووە..

لە لای باوکی بە تاك و بە کۆمەڵ لەسەر قورئان مەشقی کردووە پاشان بردوویەتی بۆ قاهیرە، لەوێش بۆ (الشهاب السکندری) خوێندۆتەوە زۆر شارەزا و لێهاتوو بووە لە هەموو خوێندنەوەکانی قورئان دا لەگەڵ لەبەر کردنی (الشاطبیة)..

هەروەها تێگەیشتنێکی چاکی هەبووە ..زۆر پیاو و ئافرەتی سەردەمەکەی سوودمەند بوون لێی، لە شاری (دەیروط) نیشتەجێ بووە و هاوسەردەمی (السخاوی) بووە[1]..

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە پوختە و دەستکارییەوە).

# شازادەی بەلْخ

## نموونەی پیاوەتی و بەخشندەیی

لە گەشتەکەی (ابن بطوطة)دا هاتووە:

خەلیفەکانی عەباسی باجێکی زۆر زۆریان خستبووە سەر خەڵکی شاری (بەڵخ)، بە جۆرێ ئافرەتان لەم باجە زۆرە بێزار بوون و چوونە لای شازادە و سکاڵای خۆیان کرد و هانایان بۆ برد، ئەویش کراسێکی رازێنراوە بە گەوهەر و یاقوت کە بەهاکەی چەند قات لە بڕی باجەکە زیاتر بوو ناردی بۆ نێردراوەکەی خەلیفە کە بۆ کۆکردنەوەی سامان هاتبوو، پێی وت: ئەم کاڵایە ببە بۆ خەلیفە کە لە بری ئەو هەژار و بێ دەستەڵاتانە دەیبەخشم..

کاتێ نێردراوەکە گەیشتە لای خەلیفە بە کراسەکەوە..خەلیفە وتی: ئەگەر ئەو پیاوەتیە لە خاتوونێکەوە بێت ئەوا ئێمە لە پێشترین بۆ ئەم جۆرە مەردایەتیە و..کراسەکەی بۆ گێڕایەوە..

شازادەش وەك ڕێز و شەرمێك نەیویست ئەو کراسە لەبەربکات کە ئەمیری باوەڕداران سەرنجی داوە، هەر بۆیە هات نیوەی ئەو گەوهەرانەی پێوەی بوو فرۆشتی و مزگەوتێك و قوتابخانەیەکی پێ دروست کرد و، فەرمانی کرد ئەوەی کە ماوەتەوە لە ژێر دیواری مزگەوتەکە هەڵبگیرێت.. بۆ ئەوەی کاتێ ڕوخا سەرلەنوێ پێی نۆژەن بکەنەوە[1]..

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبديع صقر. (بە دەستکارییەوە).

# صەفیەی كچی شەیبەی كوڕی عوسمانی كوڕی ئەبو تەلحە

یەكێكە لە راویە متمانە پێكراوەكانی فەرموودە...

لە پێغەمبەر (ﷺ) و (عائشە) و (أم حبیبە) و (أم سلمە) دایكانی ئیمانداران و، لە (أسماء)ی كچی (أبوبكر)و (حبیبە)ی كچی (أبی غزوان)ەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، (منصور)ی كوڕی (عبدالرحیم)ی (الجحیمی) و، هەردوو كوڕەكەی (عبدالحمید)ی كوڕی (جبیر)ی كوڕی (شیبە) و، برازاكەی تری (مصعب)ی كوڕی (شیبە) و، (ابراهیم)ی كوڕی (مهاجر) و، (قتادە) و، كەسانی دیكە فەرموودەیان لێوە ڕیوایەت كردووە..

لە نزیك ساڵی (٩٠)ی كۆچی ماڵئاوایی لە دونیا كردووە.[١]

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە دەستكارییەوە).

# کەریمەی کچی محمدی کوڕی حاتەم

زانایەکی زمانپاراو بووە.. (صحیح)ی بوخاری لە (الکشمیهی) گێڕاوەتەوە و، ڕیوایەتەکەیشی لە ڕاستترین گێڕانەوەکانی (صحیح)ی بوخاریە، لە (زاهر السرخسی)یشەوە ڕیوایەتی کردووە و، کتێبەکانی ڕێکدەخست و پارەی لە بەرگگرتنەوەیان دەدا.

بەهۆی فراوانی تێگەیشتن و زیرەکی بێ وێنەیەوە زانا گەورەکان سەردانیان دەکرد و، لەشاری مەککە کۆڕێکی دانیشتنی هەبوو کە فێرخوازان و زانستخوازانی ناسراو تێیدا کۆ دەبوونەوەو... ئەویش هەر بوارێکی زانستیان بخواستایە بە زمانێکی پاراو و ڕوون و ئاشکراوە ماناکەی بۆ ئاشکرا دەکردن..

لە زانستی فەرموودەدا گەیشتبووە ئاستێك کەسی دیکەی پێ نەگەیشتبوو، شووی نەکردبوو، تا لە پاش بەسەربردنی سەد ساڵی تەمەن لە زانین و وانە وتنەوەدا لە شاری مەککەی پیرۆز کۆچی دوایی کرد[١].

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە دەستکاریی و کورت کردنەوەوە).

# خەیزەران
# دایکی هارونە رەشید

خاتوونێکی پایەدار و، هۆشمەند و ژیر و، شارەزا و خێرخواز بووە، هاوسەری مەهدی عەبباسییە و دایکی هەردوو کوڕەکەی: هادی و هارون رەشید بووە: زانستی فیقهی لە پێشەوا ئەوزاعیەوە فێر بووە، کاتێ مێردەکەی مرد، هادی کوڕی جێگەی گرتەوە و بە تەنها کاروبارە گەورەکانی گرتە دەست و، شوێنەواری بەرزی بەجێ هێشت.

کاتێ پاش ئەو هاروون رەشید دەستەڵاتی گرتە دەست، خەیزەران حەجی کرد و سامانێکی زۆری لە خێر و کاری چاکەدا خەرج کرد..

ئەو کاتەیشی لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کرد، هارون رەشید لەگەڵ جەنازەکەیدا بە پێ خواسی دەڕۆیشت و، پێشەوەی تابووتەکەی گرتبوو، ناوەڕاستی خۆی بە پشتێنێك بەستبوو، هەتا گەیشتە گۆڕستانی قرشییەکان، ئەمجا هەردوو پێی شۆرد و قوڕەکەی لێ کردەوە و، نوێژی لەسەر کرد و چوویە نێو گۆڕەکەی و..بە خاکی سپارد[١]..

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە دەستکارییەوە).

# فاتیمەی کچی عبدالملك کوڕی مەروان

ئافرەتێکی زمانپاراوو ئەدیب و، ئاینپەروەر و پارێزکار بوو، شووی کرد بە عومەری کوڕی عبدالعزیز بەر لەوەی ببێت بە خەلیفە، عومەر پێی وت: گەر ئامۆژگاری منت دەوێ هەر چیت پێیە لە پارە و خشڵ و گەوهەر دەیگێڕیتەوە بۆ (بیت المال)ی موسڵمانان، چونکە ئەوانە هەمووی هی ئەوانە، ئەویش هەمووی گێڕایەوە و.. هیچی لای خۆی نەهێشتەوە و..ژیانێکی پڕ تەنگانە و زبری لەگەڵدا بردە سەر لە کاتێکدا کە دەستەڵات و خەلیفایەتیەکەی لە فراوان بووندا بوو..

کاتێ مرد و، خەلافەت گوێزرایەوە بۆ یەزیدی کوڕی عبدالمليكی برای، بە فاطمەی وت: سامانەکەت بۆ دەگێڕمەوە، چونکە عومەر ستەمی لێ کردی، کە لێی سەندییەوە، ئەویش وتی: نەخێر سوێند بە خوا وەری ناگرمەوە، من وانابم کە بە زیندویەتی بە گوێی بکەم و کە مرد سەرپێچی لێ بکەم..

فاطمە لەسەر دونیا نەویستی و پەرستش و پارێزکاری خۆی مایەوە تا ئەو کاتەی بە عومەری کوڕی عبدالعزیزی هاوسەری شاد بوویەوە..

خوای گەورە ڕەحمەتی فراوانی خۆی بەسەردا بڕژێنێ و لێی ڕازی بێت[1]..

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبديع صقر. (بە دەستکارییەوە).

# قطر الندی
# هاوسەری خەلیفە المعتضد

ئەدیبێکی پایەدار و..چاکەکار و خێرخواز بوو..

ئافرەتە ئەدیب و تازە پێگەیشتووەکانی کۆ دەکردەوە و، گفتوگۆیان لەسەر بابەتی زانستی دەکرد و پرسیاری هەمە جۆریان دەکرد..

کاتێ مێردەکەی کۆچی دوایی کرد، (المقتدر)ی کوڕی خەلافەتی گرتە دەست لە کاتێکدا تەمەنی کەم بوو، ئەمیش لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا هاوکاری دەکرد و، وای لێهاتبوو بەستن و هەڵوەشاندنەوەی بەڵێننامەکانی بە دەست بوو..

نەخۆشخانەیەکی دروست کرد و بۆ پێداویستی ساڵانەی حەوت هەزار دیناری تەرخان کرد، هەموو ڕۆژانێکی هەینی بۆ پێداچوونەوەی داخوازی ستەملێکراوان و سکاڵای هاوڵاتیان دادەنیشت[1]..

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە دەستکاری و کورتکراوەیی).

# خوند تەتەری کچی محمدی کوڕی قلاوون

شازادەیەکی گۆشکراوی چاکە و خێرخوازی بوو..لە وڵاتی میسر قوتابخانەی (الحجازیە)ی دامەزراند و، وانەیەکی تێدا تەرخان کرد بۆ زانایانی شافعی و، وانەیەك بۆ زانایانی مالیکی و، بڵند گۆیەکیشی تێدا دروست کرد کە ڕۆژانی هەینی وتاری تێدا پێشکەش دەکرا و، پێش نوێژێکی بۆ دانا کە بۆ هەر پێنج نوێژەکە نوێژی پێ دەکردن و..چەند قورئان خوێنێکی دانا کە دوای یەك قورئانیان دەخوێند، لە تەنیشت مزگەوتەکەشدا خانوویەکی بۆ ژمارەیەك لە منالانی هەتیووی موسڵمان کردەوە و، مامۆستایەکی بۆ تەرخان کردن قورئانی پیرۆزیان فێر بکات و، خواردنیشی پێ دەدان و مانگانەش چەند درهەمێکی بە هەر یەکەیان دەدا تا لە زستان و هاویندا خۆیانی پێ پۆشتە بکەن..بۆ هەریەك لەوانەش چەند سەرپەرشتیارێکی چاکی دانا بوو کە پارەیان بۆ خاوەن فەرمانەکان سەرف دەکرد[1]..

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە دەستکارییەوە).

# هیندی کچی نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنساری

# ئەو ئافرەتەی حەجاجی سەقەفی سەرشۆڕ کرد

شاعیرێکی زمانپاراو و، ئەدیبێکی بەناوبانگ و، خاوەن جوانی و هەیبەت بوو..ژنی (روح)ی کوڕی (زنباع) بوو، کە پیاوێکی زۆر بە غیرە بوو، هەر بۆیە لێی جیابووەوە.

بەهۆی جوانیەکەیەوە حەجاج ویستی بیخوازێت و، پارە و سامانێکی زۆری خستە خزمەتی و بە مەرجی دانا کە لە دوای مارەیش دوو سەد هەزار درهەمی پێ بدات و... خواستی... ڕۆژێکیان حەجاج چوویە ژوورەوە بۆ لای، لە کاتێکدا کە سەیری ئاوێنەی دەکرد و دەیووت:

وما هندُ إلا مهرة عربية      سـليلة أفـراس تحـلّلها بَغلُ

فان ولدت فحلاً فـلله درُها      وإن ولدت بغلاً فجاءَ به البغلُ

"واتە: هیند تەنها جوانویەکی عەرەبیە لە ڕەچەڵەکی ئەسپەکانە و ئێسترێك جڵەوی گرتووە ئەگەر کەڵێکی بوو ئەوا لە دەرووی خواوەیە ئەگەر ئێسترێکیشی بوو ئەوا ئێستر هێناویەتی".

ئەمجا حەجاج گەڕایەوە دواوە، بە بێ ئەوەی (هیند) هەستی پێ بکات و، حەجاج هەستا (عبدالله)ی کوڕی (طاهر)ی بە دوو سەد هەزار درهەمەوە ناردە لای کەپارەی خۆی بوو تەڵاقی بدا لەجیاتی ئەم، (عبدالله) چووە لای و پێی وت: حەجاج دەڵێت: گریمان ئێستا عاقڵ و ژیر بووم و ئەوەش دوو سەد هەزار درهەمەکەتە، ئەویش وتی: بزانە ئەی کوڕی (طاهر)، ئێمە سوێند بە خوا

هـــەبووبووین و سوپاســـگوزاریمان نـــەکرد و، عاقڵیمـــان کـــرد و پەشـــیمان نەبووینەوە، ئەوەش دوو سەد هەزار درهەمەکە با مژدانە بێت بۆ تۆ بەهۆی ڕزگاربوونم لە سەگی سەقیف.

(عبدالله)ی کوڕی (مروان) ویستی بیخوازێت.. هندیش نامەی بۆ نووسی و وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران بزانە کە قاپەکە سەگ دەمی تێ ناوە...کاتێ نامەکەی خوێندەوە.. نامەیەکی بۆ نووسی و پێی وت: ئەگەر سەگ دەمی خستە ناو قاپی یەکێکتانەوە ئەوا با حەوت جار بیشوات کە جارێکیان بە خۆڵ بێت، تۆش قاپەکە بشۆ و بەکارهێنانی حەڵاڵ دەبێت..

ئەویش ڕازی بوو، نامەی بۆ نارد: ئەی ئەمیری باوەڕداران سوێند بە خوا بە مەرجێ ئەو مارەبڕینە حەڵاڵ دەکەم کە دەبێت حەجاج پەتی ولاخی ئەو کەژاوەیە بگرێت کە تێیدا دێم لە موعرەوە بەرەو ئەو شارەی کە تۆی تێدایە..دەبێت پیادە بێت و هەموو ئەو خشڵانەی هەیەتی لە خۆی بدات..دەنا ڕازی نابم..

ئەو فەرمانە بە حەجاج ڕاگەیەنرا، ئەویش ڕازی بوو سەرپێچی نەکرد و، حەجاج بە پێ لەگەڵ کاروانەکەی (هیند)دا ڕۆیشت و کەنیزەکەکانی لە دەوری بە سواری دەڕۆیشتن، کاتێ لە شارەکەی (عبدالملك) نزیك بوونەوە، هیند دینارێکی بەردایەوە بۆ سەر زەوی، پاشان وتی: ئەی ئەو کەسەی رەشۆی وشترەکە ڕادەکێشێت درهەمێکمان لێ بەربوویەوە پێمان بدەرەوە، حەجاج پێی وت: دینارێك کەوتووە، هیند بە حەجاجی وت: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە درهەمێکمان لێ کەوت و بە دینارێك قەرەبووی کردەوە بۆمان...

حەجاج شەرم دایگرت و وەڵامی نەدایەوە و بێدەنگ بوو، پاشان بردیە لای (عبدالملك)ی کوڕی (مروان) و خواستی[1]..

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە دەستکارییەوە).

# موزەینەی کچی مەروانی کوڕی محمدی ئەموی

## بەزەییتان بەگەورە هۆزێکدا بێتەوە کە لێی دەقەومێت

لە ئافرەتە باشەکانی سەردەمەکەیەتی.. مۆڵەتی لە خەیزەران خواست کە بچێتەماڵیان لە کاتێکدا دایکانی منداڵەکانی خەلیفەکان و کچەکانی (هاشم) لە لای بوون و، زەینەبی کچی (سلمان)ی کوڕی عەلیش بەهۆی گەورەیی تەمەنیەوە لە هەموویان پایەدارتر بوو، مەهدی داوای لە خەیزەران کرد بوو پەیوەست بێت بە زەینەبی کچی سلێمانەوە تا سوودمەند بێت لە ئاکار و رەوشتەکانی چونکە بەهۆی زۆری تەمەنیەوە پێشینەکانی ئەمانی بینیووە..

خەیزەرانیش مۆڵەتی دا بێتە ژوورەوە، بینیان وا ئافرەتێکی بە هەیبەت و جوانە و کاڵایەکی شڕی لە بەردایە، پێیان وت: تۆ کێیت؟ وتی: من (مُزَيَنَة)ی کچی (مەروان) کوڕی (محمد)م، زەمانە وای بەسەرهێناوم کە ئێستا لێرە دەمبینن کە ئەم جل و بەرگە شڕەم هەیە کە سوێند بە خوا روو تەڵەیە و، هاتوومەتە خزمەت ئێوە تا هەر چۆنێك بێت لەو جل و بەرگەی ئێوەمان بێت..

چاوەکانی خەیزەران پڕ بوو لە فرمێسك..

(زەینەبی کچی سلیمان) وتی: خوا کار ئاسانیت بۆ نەکات ئەی (مُزیَنَة)، ئایا لە یادتە کە من هاتمە لات و تۆ لەسەر هەمان ئەم بەڕەیە بوویت و لە بارەی تەرمی ئیبراهیمی ئیمام قسەم لەگەڵ کردی قیژاندت بەسەرمدا و فەرمانت کرد دەرم بکەن و، وتت: ئافرەتان بۆیان نیە دەست لە بیر و بۆچوونی پیاوان وەربدەن.

(مُزیَنَة) وتی: سوێند بە خوا گومان دەبەم کە ئەو حاڵەتانە گەیاندمی بەمەی کە دەیبینی، بەهۆی ئەو کارانەوەی ئەنجامم دا، ئێستاش وەك ئەوەی تۆ بە چاکی بزانیت هانی خەیزەران دەدەیت هەمان هەڵس و کەوت لەگەڵ مندا دووبارە بکاتەوە..پێویستە هانی بدەیت لەسەر کردەوەی چاك و دوور کەوتنەوە لە خراپە..

پاشان بە زەینەبی وت: ئامۆزا چۆن کاری خوات بینی لە ئێمەدا بەهۆی سەرپێچی و یاخی بوونمانەوە و، حەزت کرد شوێن پێمان هەڵبگریتەوە، پاشان بە گریانەوە ڕۆیشت..

خەیزەران یەکێك لە کەنیزەکانی نارد گەڕاندیانەوە بۆ ناو هەندێ لە کۆشکەکانی و فەرمانی کرد بارودۆخی چاك بکەن و باش بن لە گەڵیدا..

کاتێ مەهدی هاتە ژوورەوە بۆ لای زەینەب ڕۆیشتبوو، خەیزەران ئەوەی ڕویدا بوو گێڕایەوە بۆی لەگەڵ فەرمانەکەیدا، پاشان بانگی ئەو جاریەیەی کرد کە گێڕابوویەوە و لێی پرسی..چیت بیست کاتێ گەڕاندتەوە، وتی: لە کاتێکدا دەچوویە دەرەوە بە گریانەوە پێی گەیشتم ئەم ئایەتەی دەخوێند:

﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَاقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟

يَصۡنَعُونَ ﴾[1]. واتە: خوا نمونە دەهێنێتەوە بە شارێك كە ژیانیان بە هێمنی ئاسودەیی دەبردە سەر، لە هەموو لایەکەوە رزق و رۆزیی جۆراوجۆریان بۆ دەهات، بەڵام ناشوکر و قەدرنەزانی ناز و نیعمەتەکانی خوابوون، خوای گەورەش پۆشاکی نەداریی و ترسی پێ چەشتن لە سەرەنجامی ئەو ئیش و کارە کە ئەنجامیان دا.

مەهدی بە خەیزەرانی وت: سوێند بە خوا گەر ئەو فەرمانەت نەدایە قسەم لەگەڵ نەدەکردی، ئەمجا بە کوڵ گریاو...وتی: خودایا پەنا بە تۆ دەگرم لە نەمانی بەخششەکانت و...نارازیشم بە کارەکەی زەینەب..

پاشان ناردی بۆ لای (مُزَيَنَة) و پێی وت: ئامۆزا لەگەڵ خوشکەکانتدای لە کۆشکەکەمدا، چیان بۆ هەیە بۆ تۆش هەیە و چییان لەسەرە بۆ تۆش هەیە هەتا فەرمانت بۆ دێ لە لای ئەو کەسەوە کە خۆی فەرمانڕەوایە بەسەر دروستکراوەکانیدا، پاشان ئەوەی بۆ ئەوانی بڕیبوویەوە بۆ ئەویشی دانا..هەتا ڕۆژگارەکانی (ڕەشید) لە کۆشکدا مایەوە و، لە سەردەمی خەلیفایەتی ئەودا ماڵئاوایی لە دونیا کرد، لە کاتێکدا هیچ جیاوازی نەکرد لە نێوان ئەم و ئافرەتانی بەنی هاشمدا[2]..

---

[1] سوره النحل الآیه /١١٢.

[2] (أعلام النساء) عمر رضا کحالة . (بە دەستکاریەوە).

# فاتیمەی کچی محەمەدی کوڕی حسێن کوڕی قەحتەبە
# دایکی جەعفەری کوڕی یەحیا

## بەڵگەی بەهێز و جوانی دەربڕین

لەگەڵ جەعفەری کوڕی خۆیدا شیری داوە بە ڕەشید و، لە کۆشیدا بەخێوی کرد، ڕەشیدیش ئەوی خستە ئەستۆی خۆی و داینا بوو کە کەس ڕێگەی لێ نەگرێت بۆ هاتنە ژوورەوە و داوای بۆ هەر کەس کردبێت ڕەشید ڕەتی نەکردۆتەوە، دایکی جەعفەریش داینا بوو لەسەر خۆی کە بە بێ مۆڵەت نەچێتە ژوورەوە و، بۆ کەسێکیش داوا نەکات کە تاوانی ئەنجام دابێت..

کاتێك ڕەشید بە توندی بەرەنگاری جەعفەری کوڕی بوویەوە و، مێردەکەی و هەموو خێزانەکەی لە تاریکی بەندیخانەدا توند کرد پاش جەنگی بەرمەکیەکان.. داوای چوونە ژوورەوەی کرد بۆ لای بەڵام مۆڵەتی نەدرا و... هیچ فەرمانێکیشی بۆ دەرنەکرا..کاتێ کە ئەوە ماندووی کرد، روخساری خۆی ئاشکرا کرد و، پەچەکەی لابرد و پێڵاوەکانی لە پێی لابرد، هەتا گەیشتە دەرگای کۆشکی ڕەشید.. کابرای دەرگاوان چووە لای ڕەشید و پێی وت: دایکە شیریی ئەمیری بڕواداران لە دەرگادایە.. وتی: بیکەرە ژوورەوە، ئاگری جەرگ

هەڵیگرتووە و، تەنگانەیەك هەیە لابرێت و، عەورەتێکە دایپۆشیووە، ئەویش هاتە ژوورەوە..کە ڕەشید بینی پێی پەتیە..بە پێ خواسی هەستایەوە و بەرەو ڕووی چوو تا گەیشتە لای و، سەری ماچ کرد و، پاشان داینیشاند، وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران کاتێکی وامان بەسەردا هاتووە وشکی دەکەوێتە نێوانمان لە ترسی دەستە و تاقمەکانت و، بوهتانێك لە ئێمەت جیا دەکاتەوە و تووڕەت دەکات، لە کاتێکدا کە من تۆم لە باوەشی خۆمدا پەروەردە دەکرد و، بەهۆی شیر پێدانتەوە دڵنیاییم لە دوژمن و زەمانە وەرگرت..ئەویش وتی: چی بووە دایکی ڕەشید..

وتی: باوکی شیریت (یەحیا) و باوکی پاش باوکت..

پێی وت: ئەی دایکی ڕەشید: فەرمانێکە و لە پێشدا ئەنجام درا و، قەزایەکە هاتووە و، تووڕە بوونێکە لە لایەن خوداوە جێبەجێ کرا..

وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران، خودا چی بووێت دەیسڕێتەوە و دەیچەسپێنێت، و (ئومولکتاب)ی لایە..

وتی: ڕاستت وت، ئەم لەوانەیە کە خودا نەیسڕیوەتەوە، فاطمة وتی: غەیب لە پێغەمبەرانیش پەنهان بووە، ئەبێ بۆ تۆ چۆن بێت ئەی ئەمیری بڕواداران ئەی ئەم فەرمایشتەی خوا لە کوێیە کە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾[1]. واتە: ئەوانەی کە لەخۆشی و ناخۆشیدا، لە هەرزانی و گرانیدا ماڵ و سامانیان دەبەخشن، ڕق و کینەی خۆیان دەخۆنەوەو خۆ دەگرن، لە خەڵکی خۆش دەبن و چاوپۆشییان لێ دەکەن، خوای میهرەبان چاکەکار و چاکەخوازانی خۆش دەوێت.

---

[1] سورة آل عمران الآية /١٣٤.

هاروون ڕەشید هیچی پێ نەما و پاشان وتی: ڕازیم، وتی: بیدەرەوە پێم چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: هەر کەسێك شتێك لەبەر خوا واز لێ بێنێت خودا ئەو شتەی لە لا ناهێڵێت..

ڕەشید وتی: (لله الامر من قبل ومن بعد)[1].

وتی: ﴿وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾[2]. واتە: جا ئەو ڕۆژە ئیمانداران خۆشحاڵ و خۆشنوود دەبن. بە سەرکەوتنی خوا، هەرکەسێ ئەو بیەوێت، سەری دەخات، ئەو خوایە خاوەن دەسەڵاتی بێ سنورەو زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە.

ئەی ئەمیری بڕواداران لە یادتە کە چیت لەسەر خۆت دانابوو، کە داوا بۆ هەر کەس بکەم تۆ ڕەتی نەکەیتەوە.. ڕەشیدیش وتی: تۆش لە یادتە ئەی دایکی ڕەشید کە لەسەر خۆت دات نابوو داوا بۆ هیچ تاوانبارێك نەکەیت..

کاتێ بینی کە بە ئاشکرا ڕێگریکردنی ڕادەگەیەنێت، زمڕودێکی سەوزی دەرهێنا و کلیلێکی ئاڵتونی تێدا دەرکرد و، قژی نێوچەوان و ددانەکانی پێشەوەی دەرهێنا و، وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران، سکاڵام دەهێنمە لات و، پەنا بە خوا دەگرم لەسەرت، پاشان هاروون ئەوەی لێ وەرگرت و سەیری کرد و پەندی لێ وەرگرت و بە کوڵ گریا و دانیشتوانی کۆڕەکەش لە گەڵیدا گریان..
پاش ئەوەی هاتەوە هۆشی خۆی دایەوە دەستی و وتی: (إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ

---

[1] سورة الروم الآية /٤.
[2] سورة الروم الآية (٤- ٥).

ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا )[١] وتی: خوای گەورەش دەفەرموێت: (وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ )[٢] وە دەفەرموێت : ( وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمْ ).[٣]

وتی : ئەمە بۆچی ئەی دایکی ڕەشید.. وتی: سوێندت خوارد بوو کە پەردە لە ڕوومدا دانەدەیتەوە و بە سووك سەیرم نەکەیت، وتی: ئایا بە پتەوی پێم دەکرپیتەوە؟ وتی: زۆر چاکت وت.. وتی: بە چەند.. وتی: بە رازی بوونت لەو کەسەی کە تورەت ناکات، وتی: ئەی دایکی ڕەشید ئایا ئەو حەقەی بۆ تۆم داناوە بە هەمان شێوەش بێت بۆ ئەوانی تر؟ وتی...بەڵێ.. تۆ ئازیزتری لامو ئەوانیش خۆشەویستن لەلام.

ئەمجا وتی: جگەلەوان بەشتێکی دیکە نرخەکەی دیاری بکە..وتی: باشە.ئەوا پێمدایتەوە.. تۆیشم لەگەڵیدا بەخشی و، چارەسەر بوو..ئیدی هەستا لە لایو رۆیشت..

ڕەشیدیش بە لالی مایەوە و هیچی پێ نەدەوترا..سەهل دەڵێت: ڕۆیشت و نەگەڕایەوە، نەخێر سوێند بە خوا ئیتر هیچ نالە و نرکەیەکم لێ نەبیست[٤]..

---

[١] سورة النساء الآية (٥٨)

[٢] سورة النساء الآية (٥٨)

[٣] سورة النحل الآية (٩١).

[٤] (المرأة العربية في جاهليتها وإسلامها) عبدالله عفيفي (بە پوختە و دەستکارییەوە).

# عاتکەی کچی یەزیدی کوڕی معاویە

لە ئافرەتە گۆشکراوەکانی بەرزی و مەزنی بوو، لە دڵی (بەنی ئومەیەدا) جێگایەکی بڵندی هەبوو، (عبدالملك)ی کوڕی (مروان) خواستی..

زەوی (عاتکە)ی دەرەوەی دەروازەی (الجابیة) لە شاری دیمەشق بۆ ئەم دەگەڕێتەوە و لەو زەویەشدا کۆشکێکی هەبوو کە تێیدا (عبدالملك)ی کوڕی (مروان) مرد، موهاجیری ئەنصاری ڕیوایەتی لێوە کردووە و، (أبو زرعة)ی دیمەشقیش لە بارەیەوە وتوویەتی: (عاتکە)ی کچی (یزید)ش لە نێو ئەو ئافرەتانەدایە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە..

ژمارەیەك لە ڕاویەکان فەرموودەیان لێوە ڕیوایەت کردووە، (عاتکە) هێندە ژیا، کوژرانی (ولید)ی کوڕی (یزید)ی کوڕی کوڕەکەی بینی[1]..

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# عائیشەی کچی یوسفی باعونیەی دیمەشقی

ئەدیب و شاعیر و زانایەکی پایەداری چاکسازیخواز و ئاینپەروەر و ناسراو بە سۆفیگەری بوو..

ڕۆیشتووە بۆ شاری قاهیرە و لەوێ بەشێکی زۆر زانست و زانیاری بەدەست هێناوە هەتا مۆڵەتی فەتوا دان و وانە وتنەوەی پێ درا، پاشان دەستی دایە نووسین و دانانی کتێب و، لەم ڕووەشەوە کۆمەڵێك پایە بەرز کتێب و نامە و قەصیدەی نووسی، وەك کتێبی (الاشارات الخفية في المنازل العلية) کە (أرجوزەی هەڵبەستێکە) و تێیدا (منازل السائرين)ی (هروی) کورت کردۆتەوە، لەگەڵ کۆمەڵە هەڵبەستێکی دیکە کە تێیدا پوختەی کتێبی (القول البديع في الصلاة على الحبيب الشفيع)ی (سخاوي) خستۆتە ڕوو لەگەڵ ژمارەیەك دانراوی دیکەدا.

دواتر لە ساڵی (٩١٩)ی کۆچی شاری قاهیرەی بەجێ هێشت و، لە ڕێگادا نەخۆش کەوت و ساڵی (٩٢٢)ی کۆچی لە شاری دیمەشق کۆچی دوایی کرد[١]..

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبديع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# بەشی هەشتەم

# ئافرەتانی تێکۆشەر

(صفیە)ی کچی (عبدالمطلب).

(نسیبە)ی کچی (کعب)ی مازنی.

(أم سلیم)ی کچی (ملحان)ی ئەنصاری.

(خولە)ی کچی (أزور).

(أم حکیم)ی کچی (حارث)ی مەخزومی.

(أم سنان)ی ئەسلەمیە.

(لیلی)ی غیفاریە.

(نسیبە)ی کچی (حارث).

(غزالە)ی حەروریە.

(أم موسی)ی کوڕی (نصیر).

(أزدە)ی کچی (حارس)ی کوڕی (کلدە).

# صەفیەی کچی عبدالمطلب
# پوری پێغەمبەری خوا

ئافرەتێکی پایە بەرزە، زۆر زوو موسڵمان بوو، پەیمانی دایە پێغەمبەر (ﷺ) و کۆچی کرد بۆ مەدینە، نمونەیەکی ڕاستگۆی و دڵسۆزی و بوێری و کارجوانی بوو لە نێو ئەوانەدا کە زوو موسڵمان بوون.

ئەو پوری پێغەمبەری خودا (ﷺ) و دایکی زوبێری کوڕی عەوام بوو _ڕەزای خوای لەسەر بێت_ و خوشکی حەمزەی کوڕی عبدالمطلب بوو (رضي الله عنه).

صفیە _ڕەزای خوای لەسەر بێت_ بەشداری جەنگی ئوحود و ئەحزاب و خەیبەری کردووە، کاتێ موسڵمانان لە جەنگی ئوحوددا شکان، صفیە رمێکی بە دەستەوە بوو راوەستا بوو لە ڕوخساری خەڵکەکەی دەدا و دەیووت:

شکستتان بە پێغەمبەری خودا (ﷺ) هێنا، کاتێ پێغەمبەری خودا (ﷺ) چاوی پێ کەوت بە زوبێری کوڕی فەرموو: بڕۆ پێی بگە و بیگەڕێنەوە تا ئەوەی بەسەری حەمزەی برای هێنراوە نەبینێت، زوبێر گەیشتە لای و، وتی: دایە.. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانت پێ دەکات کە بگەڕێیتەوە وتی: بۆچی؟ بیستومە کە براکەم شێوێنراوە، ئەوەش لە پێناوی خوادا بووە، لەم پێناوەشدا

هیچمان پێ ناخۆش نیە، ئارام دەگرین وإنا لله وإنا الیه راجعون، دەکەین بە ویستی خوا.

کاتێ زوبێر هاتەوە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و قسەکانی صفیەی بۆ گێڕایەوە پێی فەرموو: وازی لێ بێنە، ئەویش هات و سەیری حەمزەی کرد و (وإنا لله وإنا الیه راجعون)ی وت و، داوای لێخۆشبوونی کرد، پاشان پێغەمبەری خوا فەرمانی کرد بنێژرێت.

پاش ئەوە صەفیە بەشداری غەزای ئەحزابی کرد، لەو غەزایەدا پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئافرەتان و منداڵانی لە قەڵای (بەنی حاریسە)دا کۆ کردبوەوە تا تووشی خراپە نەبن..لەو کاتەشدا (حسانی کوڕی سابت)یش لە قەڵاکەدا بوو..صفیەش لە نێو ئافرەتەکاندا بوو..لە کاتێکدا کە سەرپەرشتی قەڵاکەی دەکرد بینی وا ئەسپ سوارێکی جولەکە بە دەوری قەڵاکەدا دەسوڕێتەوە، ترسا کە هەڵکوتێتە سەریان یان شوێنەکەیانیان پێشانی دوژمنان بدات، صفیە وتی: ئەی حەسان ئەوە جولەکەیە کە بە دەوری قەڵاکەدا دەسوڕێتەوە، سوێند بە خوا من دڵنیا نیم لەوەی کە شوێنەکەمان پیشانی جولەکانی تر بدات کە لە پشتمانەوەن، ئێستاش پێغەمبەری خودا (ﷺ) و یاوەرانی سەرقاڵن و ئاگایان لە ئێمە نیە، دابەزەرە خوارێ و بیکوژە.

حەسان وتی: خوا لێت خۆش بێت کچی (عبدالمطلب)، سوێند بە خوا من بۆ ئەو کارە دەست نادەم، کاتێ لێی بێئومێد بوو، جلەکانی کۆ کردەوە و پشتێنی بەست و شیرێکی هەڵگرت و، دابەزی بۆی لە کاتێکدا ئەو چەکی پێ بوو، لە گەڵیدا جەنگا و کوشتی، بەمەش بووە یەکەمین ئافرەت کە پیاوێکی هاوبەش پەرستی کوشتبێت، پاشان وتی: ئەی حەسان دابەزەرە خوارەوە و هەڵیبواسە، لەبەر ئەوە نەبوایە پیاوە خۆم هەڵم دەواسی..حەسان وتی: ئەی کچی

(عبدالمطلب) هیچ پێویستیم بە هەڵواسینی نیە..پاش ئەوەش صفیە بەشداری جەنگی خەیبەری کردووە..

صفیە فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) و فەرمودەشیان لێوە ڕیوایەت کردووە، هەروەها شاعیرێکی زمانپاراو بووە لە نێو شاعیرە بەرزەکانی عەرەبدا لە لاواندنەوە و بابەتی دیکەدا و، لە پێش هەموو عەرەبەوە بووە لە قسە و کردەوە و ڕەچەڵەك و بنەچە و ڕێزدا.

صفیە _ڕەزای خوای لەسەر بێت_ لە سەردەمی خەلافەتی ئیمامی عومەردا ساڵی ٢٠ی کۆچی، لە تەمەنی حەفتا و سێ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و، عومەری کوڕی خطاب (ﷺ) نوێژی لەسەر کرد و لە (بەقیع) بە خاك سپێردرا..

لە گێڕانەوەیەکی دیکەشدا هاتووە کە لە سەردەمی خەلافەتی عوسمانی کوڕی عەففاندا (ﷺ) کۆچی دوایی کردووە[١]..

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).
(المرأة العربية في جاهليتها وإسلامها) عبدالله عفيفي (بە پوختە و دەستکارییەوە).
(نساء فاضلات) عبدالبديع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# نوسەیبەی کچی کەعب

## ئوم عوماره

هەموو پاڵەوانێك هەڵوێستێکی هەیە پێی دەناسرێت و، لێی دەمێنێتەوە و جێگەی سەربەرزی و ڕێزە لە ژیانیدا و، شوێنی شانازییەتی، هیچیش لەمە پڕ بەدڵتر و، دەروون گوشاد تر و، کاریگەرتر نیە لەسەر مێژوو، وەك هەڵوێستی نوسیبەی کچی کەعب (ڕەزای خوای لێ بێت).

لە ڕۆژی ئوحوددا نووسیبە لەگەڵ سوپای موسڵمانەکاندا ڕۆیشت و ئاوی دەدایە تینووەکانیان و، فریاگوزاری پێشکەش بە بریندارەکان دەکرد، هەتا ئەو کاتەی جەنگەکە لە بەرژەوەندی موسڵماناندا بوو، کاتێ موسڵمانان شکان و کشانەوە و پشتیان هەڵکرد و ڕایان کرد و تەنها دە کەس یان زیاتر مانەوە بەرگرییان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکرد و نەیان دەهێشت پێی بگەن..

ڕۆڵی نووسەیبە لێرەدا هات، شمشێرەکەی گرتە دەست و، کەوانەکەی هەڵگرت، دەستی کرد بە هاتووچۆ بە دەوری پێغەمبەری خوادا (ﷺ) و، تیری دەهاویشت و بە شمشێرەکەشی دەجەنگا، لە دەوروبەریشی پیاوانێکی بەڕێزی بەرگریکاری لێ بوو، وەك (عەلی و ئەبوبەکر و عومەر و سەعد و تەلحە و زوبێر و عەباس و، هەردوو کوڕەکەی و مێردەکەی، بەڵام ئەم لە هەموویان کاریگەرتر بوو، لە هەموویان هەڵوێستی مەزنتر بوو، هەر کە بیبینیایە

مەترسی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) نزیك دەبێتەوە بە خێرایی دەچوو تا بەرگری لێ بكات، بە جۆرێ كە پێغەمبەر (ﷺ) لە بارەیەوە دەفەرموێ: (كە بە لای ڕاست و چەپدا ئاوڕم دەدایەوە نوسەیبەم دەبینی بەرگری لێ دەكردم و دەجەنگا)..

(عمارە)ی كوڕی ئەو دیمانەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: " لەو ڕۆژەدا دەستی چەپم بریندار بوو، كابرایەك برینداری كردم و ڕۆیشت و، لەسەرم ڕانەوەستا، خوێنەكەم نەدەوەستایەوە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: برینەكەت ببەستە، دایكم هات و پارچەیەكی پشتێنەكەی دەرهێنا كە بۆ برین پێچی ئامادەی كردبوو، برینەكەی پێ بەست، پێغەمبەریش ڕاوەستا بوو سەیری دەكردم، پاشان دایكم وتی: كوڕم هەستە، لە دژیان بجەنگە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئینجا دایكی عەممارە، كێ ئەوەی پێ دەكرێ كە بە تۆ دەكرێت؟

دایكم وتی: ئەو پیاوە هات كە كوڕەكەمی بریندار كرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئەوە بریندار كاری كوڕەكەتە، دەڵێت: منیش ڕێم پێ گرت، دام لە قاچی و، كەوت، نوسەیبە دەڵێت: پێغەمبەری خودام (ﷺ) بینی زەردەخەنە گرتی هەتا ددانەكانی دەركەوتن و، فەرمووی: تۆڵەت كردەوە. ئەی دایكی عەممارە، پاشان بە شمشێرەكانمان لێیان دا[1] هەتاكو كوشتمان، پێغەمبەر فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی سەری خستی و، چاوەكانتی بەرانبەر دوژمنەكەت ئارام كردەوە و، تۆڵە سەندنەوەكەی بە چاوی خۆت نیشان دایت.

لەو ڕۆژەدا نووسەیبە سیازدە برینی پێوە بوو، یەكێكیان بەر ملی كەوتبوو خوێنی لێ دەڕۆشت، لەگەڵ ئەوەشدا وەك هەورە بروسكە وەها بوو، ئەیدا لە ملی دوژمن و دەچووە نێو ڕیزەكانیانەوە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی:

---

[1] نعله: واتە بەردەوام لێمان دەدا.

دایکت، دایکت، برینەکەی ببێچە، شوێنی دایکت ئەی عەممارە وەك شوێنی فلآن و فلآن وایە بۆت، کاتێ دایکی گوێی لەمە بوو وتی: داوا لە خودا بکە کە لە بەهەشتدا ئێمە لە گەڵتدا بین، پێغەمبەر فەرمووی: خودایا ئەمانە بکە بە هاوڕێم لە بەهەشتدا، نووسەیبە وتی: گوێ بەوە نادەم کە لە دونیادا تووشم هاتووە.

دایکی عەممارە بەشداری (بيعة الرضوان) و، جەنگی دژی موسەیلەمەی درۆزنی لە یەمامە کردووە، کاتێ خالیدی کوڕی وەلید خۆی بۆ یەمامە ئامادە کرد، نوسەیبە هاتە خزمەت ئەبوبەکر و داوای مۆڵەتی بەشداریکردنی لێ کرد، ئەبوبەکر فەرمووی: ئێمە ئەزمونی تۆمان لە جەنگدا بینیووە بە ناوی خوداوە بچۆ و...خالیدیشی ڕاسپارد کە ئاگای لێی بێت، لە جەنگی یەمامەدا بە توندترین شێوە جیهادی کرد، کاتێ جەنگەکە کۆتایی هات و، گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، خالیدی کوڕی وەلید داوای لە عەرەبەکان کرد کە بە زەیتی قرچاو چارەسەری بکەن چونکە لە برینێك زیاتری پێوە بوو.

خالیدیش (ﷺ) ئاگاداری بوو، بە جوانی سەردانی دەکرد و مافەکانی لەبەرچاو بوو، ڕاسپاردەکەی پێغەمبەری (ﷺ) لە بارەوە ڕەچاو دەکرد.

کاتێ گەیشتەوە شاری مەدینە، ئەبوبەکر کە ئەو کاتە خەلیفە بوو سەردانی دەکرد و هەواڵی دەپرسی.

دایکی عەممارە فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاوەتەوە و، (عوبادی کوڕی تەمیمی کوڕی زەید) کوڕەزای و، (حارث)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (كعب) و (ابن عباس) و کەسانی دیکە فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە...(ترمذي) و (نسائی) و (ابن ماجه)[1] ش ڕیوایەتەکانیان هێناوە.

---

[1] (المرأة العربية في جاهليتها وإسلامها) عبدالله عفيفي (بە پوختە و دەستکارییەوە).
(نساء فاضلات) عبدالبديع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# ئوم سولەیمی کچی مەلحانی کوڕی خالیدی ئەنساری

## مارەییەکەی موسڵمانبوونی ئەبو تەڵحە بوو

تێکۆشەرێکی چەلەنگ و، هۆشمەند و خاوەن بیروڕا بوو، لە دەستەی پێشینەکاندا بەرەو ئیسلام هات و، بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خودا (ﷺ) و، موسڵمان بوونەکەشی بووە مایەی بێزاری مالیك کوڕی النضر)، ئەنەسی کوڕیشی لەو کاتەدا منداڵێکی شیرە خۆر بوو، ئوم سولەیم پێی دەوت: (لا إله الا الله) بڵێ (أشهد ان محمداً رسول الله).. ئەویش دەیگوتەوە و ئەوەش بووە یەکەم گوتەی، ئەمەش مایەی توڕەبوونی مالیکی مێردی بوو پێی دەوت: کوڕەکەم لێ خراپ مەکە، پاشان لێی بێ ئومێد بوو، بەجێی هێشت و بەرەو شام ڕۆیشت و، لەوێ کوژرا، کاتێ کە زانی کوژراوە، وتی: ئەنەس لەشیر نابڕمەوە هەتا خۆی مەمك بەر نەدات و، شووش ناکەمەوە تاوەکو ئەو لەناو مەجلیسی پیاواندا دەبینم دابنیشێت، ئەوە بوو کە ئەنەس گەورە بوو (أبو طلحة زیدی کوڕی سهل) هاتە داخوازی، کە ئەو کاتە بێ باوەڕ بوو، ئەم پێی ڕازی نەبوو، پێی گوت: ئەی ئەبا طلحە، ئایا نازانیت کە ئەو خوداوەندەی تۆ دەیپەرستی بەردێکە و هیچ سوود و زیانێکی نیە، یان دارێکە و لای دارتاش بۆتی دروست دەکەن، ئایا زیانت پێ دەگەیەنێت؟! یا سوودت هەیە بۆت؟ شەرم لە پەرستنی ئەوانە ناکەیت؟ ئەگەر موسڵمان ببیت جگە لەوە هیچ مارەییم لێت ناوێت، ئیسلام چووە دڵی ئەبو طلحە و شایەتمانی هێنا و، ئومم سولەیمیش شووی پێ

کرد و، مارەییەکەی موسڵمان بوونی ئەبو طلحە بوو..

ئومم سولەیم (١٤) فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاوەتەوە کە چواریان لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتوون و، یەکێکیشیان (متفق علیە)، هەریەك لە بوخاری و موسلیمیش بەجیا یەکی فەرموودەیەکیان هێناوە، ئەنەسی کوڕی مالیك و عبداللەی کوڕی عباس و عەمری کوڕی عاصی ئەنصاری و ئەبو سەلەمە (عبدالرحمن کوڕی عەوف) و زەیدی کوڕی (ثابت) فەرموودەیان لێوە ڕیوایەت کردووە..

بەشداری جەنگی ئوحودی کردووە و، ئاوی گەیاندووە بە تینووەکان و بریندارەکانی چارەسەر کردووە، پاشتریش بەشداری جەنگی (حنین)ی کردووە لە کاتێکدا کە سکی پڕ بووە، ئەبو طلحە بینیوویەتی خەنجەرێکی گەورەی هەلگرتووە، لای پێغەمبەری خوا شکاتی لێ کرد، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەڵمگرتبوو، هەتا ئەگەر یەکێك لە بێباوەڕەکان نزیك بوونەوە سکی بدڕم، شەرکەرەکانیان دەکوژم، لە ملیان دەدەم هەتا تێکبشکێن و ڕابکەن. پێغەمبەری خوداش (ﷺ) پێی فەرموو: ئەی ئوم سولەیم خودا بە چاکی کۆتایی پێ هێنا.

ئومم سولەیم (خودا لێی ڕازی بێت) لە ڕێز و ئارامگری و ئیمان پتەویدا بە نمونە دەهێنرێتەوە، بە جۆرێ کردوویەتیە پێشەنگێك، ئافرەتانی ئیماندار شوێن پێی هەڵبگرن..با لێرەدا لێگەڕێین هاوەڵی پایەدار (ئەنەسی کوڕی مالیك)ی کوڕی (رضي الله عنه) باسی هەڵوێستێکی جوامێرانەیمان بۆ بکات.

ئەنەس دەڵێت: "برایەکم کە لە ئەبو طلحە بوو بە (ئەباعەمیر) بانگ دەکرا نەخۆش کەوت، لە کاتێکدا کە ئەبو طلحە لە مزگەوت بوو منداڵەکە مرد..

ئومم سولەیم کاروباری ساز کرد و، وتی: هەواڵی مردنی منداڵەکەی مەدەن بە ئەبو طلحە کاتێ لە مزگەوت گەڕایەوە، ئەم خۆی بۆ ڕازاندەوە، ئەبو طلحە وتی: کوڕەکەم چی دەکات؟ وتی: ئێستا لە هەموو کاتێ ئارام ترە..ئەمجا نانی بۆ ئەو و میوانەکانی هێنا، دواتر بە جوانترین شێوەی ژیانی هاوسەرانە شەویان بەسەربرد..

لە کۆتایی شەودا ئومم سولەیم وتی: ئەی ئەبا طلحە ، سەیری ماڵی فلاَن کەس ناکەیت، شتێکیان بە ئەمانەت بردوە و کاری خۆیان پێ جێبەجێ کردووە، کاتێ داوایان لێ بکەینەوە، بە لایانەوە ناخۆش و سەخت بێت؟ ئەویش وتی: بێ ویژدانی دەکەن، وتی: دەی فلاَنی کوڕیشت ئەمانەتی خودا بوو لە لامان و ئێستا بردیەوە، إنا لله وإنا الیه راجعون و سوپاسی خوا کرد و، وتی: سوێند بە خوا لێناگەڕێم لە من ئارامگرتر بیت، کاتێ کە رۆژ بوویەوە چووە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ)، کاتێ چاوی پێکەوت، پێغەمبەر پێی فەرموو: خوا ئەمشەوتان لێ پیرۆز بکات، جا لەو شەوەدا (عبدالله ی کوڕی أبو طلحە)ی تێدا دروست بوو..

جا ئەو عبداللە یە نەمرد هەتا خودای گەورە دە کوڕی پێ بەخشی و هەموویان قورئانیان لەبەر کردبوو، لە ڕێگەی خوادا تێکۆشان، خوای گەورە بەرەکەتی خستە نەوەکانیانەوە بەهۆی نزاکەی پێغەمبەری خودا و (ﷺ) ئەو ئیمان و ئارامگری و چاکە مەندییەی ئومم سولەیم هەیبوو..

خوای گەورە ڕەحم بە ئومم سولەیم بکات و لێی ڕازی بێت.. موسڵمانێکی ڕاستگۆ و، ئیمانداریکی ئارامگر و، تێکۆشەرێکی نەبەرد بوو[1].

---

[1] لە (أعلام النساء) عمر رضا کحالە و (المرأة العربیة في جاهلیتها وإسلامها) عبدالله عفیفي و (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر.(وەرگیراوە بە دەستکاریەوە).

# خەولەی کچی ئەزوەر

## سوارچاکی پەخشان رەش پۆشراو

لە مێژووی تێکۆشانی ئیسلامدا، چەندەها نموونەی پڕشنگداری ئافرەتانی موسڵمان هەن کە هاوشانی پیاوان دەچوون بۆ شەڕ، لە دوای سوپاوە ڕێگایان دەبڕی و، ئاویان دەدایە تینوەکان و، فریاگوزاریان پێشکەشی نەخۆشەکان دەکرد و، لەسەر خۆڕاگری هانیان دەدا..

خەولەی کچی ئەزوەری کەندی یەکێکە لەو نمونە جوانانەی ئافرەتانی موسڵمان، کە مێژوو لە تۆماری پاڵەوانە بە جەرگەکاندا ناوی بە نەمری تۆمار کردووە..

چونکە ژیانی ئەو پڕ لە سوارچاکی بوو، لەگەڵ ئافرەتان و پیاوانی موسڵماندا بەشداری تێکۆشانی لە ڕێگەی خوادا دەکرد، لە وڵاتی شامیش تووشی چەندین تاقیکردنەوە بوو، ئەو کاتەی سوپای موسڵمانان لە سەردەمی خەلافەتی ئەبوبەکری صدیق دا (ﷺ) شامیان ڕزگار کرد و، لەوێ مایەوە تا سەردەمی خەلافەتی عوسمانی کوڕی عەففان (ﷺ)، لەو ماوەیەشدا بەشداری چەندین ڕوودا و جەنگی کردووە و، ئازایەتی و نەبەردی بە جۆرێ بوو، کە بوو بووە مایەی سەرسوڕمان و سەرسامبون لە کاتی هەوڵدان بۆ ڕزگار کردنی (ضرار کوڕی ئەزوەر)ی برای لە دیلێتی ڕۆمەکان.

کاتێ خالیدی کوڕی وەلید (ﷺ) لە پێشەوەی سەربازەکانیدا بوو بۆ دەرباز

کردنـی لـە دیلـێتی و، شـەڕ لـە نێـوان موسـڵمانەکان و ڕۆمەکانـدا گـەرم بـوو، ڕۆمەکان لەناکاو ڕووبەڕووی سوار چاکێکی عەرەبی ڕوخسار داپۆشراو بوونەوە کە تـەنها گلێنـەی چاوی دەبینـرا و، نـاو قـەدی بـە عەمامەیـەکی سـەوز پێـچا بووەوە لـە پـشتەوە هێنـا بوویـەوە بـۆ سـەر سـنگی.. بـە ئازایـەتێکی بوێرانـە هێرشـی دەبـرد و، دەهـات و دەچـوو لـە جەنگەکـەدا و شمـشێری دەوەشـاند و دەهاویشت بێ دوو دڵی و ئاوڕدانەوە..

خالید و هەندێ لە سەرکردەکانی پرسیان؟!

ئەم سوارچاکە داپۆشراوە کێیە؟ ناوی چیە؟ ئەو پشتی تێدەکردن..

بەڵام خالید داوای لێکرد کە ڕوخسارە داپۆشراوەکەی لابدات..

لێرەدا خەولە خۆی ئاشکرا کرد و، وتی:

"ئەی سەرکردە.. من پـشتم لـە تـۆ نـەکرد، بـەڵکو لەبـەر شـەرمم بـوو لێـت چونکە من لە پەچەدارەکانم و، ئەوەی پاڵی پێوەنام بۆ ئـەم کارەی کـە دەیـبنی ئەوەیە کە لە خەفەتان جەرگم زۆر دەسوتێ.. من خەولەی کچی ئەزوەرم و لـە نێـو هەنـدێ لـە ئافرەتـانی هۆزەکەمـدا بـووم، یـەکێ هـات و هـەواڵی پێـدام کـە (ضرار)ی برام بـەدیل گـیراوە و منـیش سـواری ئەسـپ بـووم و ئـەوەی دەیبـینی ئـەنجامم دا، خالیـدیش سوێندی خـوارد کـە (ضـرار) لـە دیلـێتی ڕزگـار دەکات، موسڵمانان دەسـتیان بـە جـەنگ کـردەوە و هەڵمـەتێکیان بـرد و، بـە تێکـشکانی دوژمن و سەرکەوتنی موسڵمانەکان شەڕی (أجنادين) کۆتایی هات و (ضرار)یش لە دیلێتی ڕزگاری بوو.

دووبارە جەنگ لە نێوان موسڵمانەکان و ڕۆمەکان لـە شـەڕی (مـرج دابـق)دا دەسـتی پێکـردەوە، خەولـە جـارێکی دیکـە براکـەی لـە دەسـت دەدات و بـەدیل دەگیرێت، دیسان زۆر دڵگران بوو، کۆسـتەکەی گـەورەتر بـوو، هـانی جـەنگاوەرە موسڵمانەکانی دەدا تۆڵە لە ڕۆمەکان بکەنەوە و براکەی ڕزگار بکـەن، لەمەشـدا

هەندێ لە ئافرەتان کۆبوونەوە و هانی جەنگاوەرە موسڵمانەکانیان دەدا، کاتێ شەڕ گەیشتە ئەوپەڕی تینی و، سەربازانی خودا لە باکووری شامەوە شالاویان برد و گەمارۆی (أنطاكية)یان دا، گیراوەکانیان ڕزگار کرد، کە (ضرار)یشیان لە نێودا بوو.

بەڵام قەدەری خودای دانا وا بوو، خەولە لەگەڵ چەند ئافرەتێکدا لە لایەن ڕۆمەکانەوە بەدیل گیران، لە کاتێکدا کە (ضرار) دەربازی بوو، ڕۆمەکانیش بەهۆی دۆڕانیانەوە دڵیان پڕ لە قین و بوغز بووە و تۆڵەیان دەویێت، بەڵام خەولە خۆی بە دەستەوە نادات و هێمن نابێت و نەرمی نانووێنێت، بەڵکو هەڵدەستێت وتار بۆ ئافرەتەکانی هاوڕێی دەدات: ئەی کچانی حمیر و، نەوەکانی تبع ، ئایا رازین پیاو خراپانی ڕۆم بەسەرتاندا زاڵ ببن و منداڵەکانتان ببنە بەندەی ئەوان؟! من وای دەبینم کوژران لەم دیلێتیە سەرشۆڕانەیە باشتر بێت..

پاشان فەرمانی پێکردن کە کۆڵەکەی چادرەکان و مێخەکان هەڵبگرن و پەلاماری دوژمنە زۆردارەکەیان بدەن..

جا ژنەکان کۆڵەکە و مێخەکانیان هەڵگرت و، بە یەك دەنگ هاواریان کرد و، خەولە شالاوی برد و ئافرەتەکانی تر بە شوێنیدا هاتن و شەڕێکی سەختیان ئەنجامدا، تا ئافرەتەکان ڕزگاریان بوو لە دیلێتی ڕۆمەکان..

بە ڕاستی خەولەی کچی ئەزوەر، نمونەیەکی بالای ئەمەکداری خوشك بەرانبەر براکەی بوو، لە هەمان کاتدا نمونەیەکی تێکۆشانی ئافرەتانی موسڵمان بوو لە پێناو ئایین و بیروباوەڕ و غیرەتدار بەرانبەر شەرم و شکۆی ئافرەتانی موسڵمان بوو[١]..

---

[١] (كرائم النساء) أحمد محمد جمال
(نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# ئوم حەکیمی کچی حارسی مەخزومی

تێکۆشـەرێکی پایـەدارە، لەگـەڵ عەکریمـەی کـوڕی ئەبوجـەهلی، هاوسـەریدا بەشداری شەڕی ئوحودی کردووە و بەر لە ڕزگار کردنی مەککە موسڵمان بـووە و، داوای پەنادانی بـۆ عەکریمـەی مێـردی کـردووە و، پێغەمبـەری خـوداش(ﷺ) ئەمانی پێ بەخشی.. ئەمجا بە شوێنیدا ڕۆیشت کە ڕای کردبوو بۆ یەمەن و لە یەکێك لە کەنارەکانی (تهامە) لە کاتێکدا سواری کەشـتی بـوو بـوو بـڕوات پێـی گەیـشت و، پێـی وت: ئـامۆزا.. لـە لایـەن باشـترین کـەس و، چاکـترین خـەڵك و، خزمترین کەسەوە هاتووم بۆ لات، تۆش خۆت گیرۆدەی سـەختی مەکـە، چـونکە ئـەمانم لـەو وەرگرتـووە بـۆت، ئـەمجا لەگەڵیـدا گەڕایـەوە کـە گەیـشتە دەرگـای پێغەمبەری خودا (ﷺ) ژنـەکەیشی لەگەڵیدا بوو، پێـشی کـەوت مۆڵـەتی چـوونە لای پێغەمبـەری بـۆ وەرگـرت و، چـوویە ژووریَ و، عومـەر هـەواڵی گەیـشتنی عەکریمەی گەیاندە پێغەمبەری خودا (ﷺ)، ئەویش موسڵمان بوو.

ئـومم حـەکیم بەشـداری شـەڕی یـەرمووکی کـردووە و، تووشـی چـەندین ناڕەحـەتی بـوو، تێیـدا بـە سـەختی جـەنگا و، لـە شـەڕی (مـرج الـصفر)یـشدا کۆڵەکەیەکی ئاسنینی هێنا و حەوت ڕۆمی کوشت[1]..

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# ئوم سینان ئەسلەمیە

تێکۆشەرێکی پایەدارە، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دەیویست بۆ خەیبەر بەڕێ بکەوێت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەمەوێت لەم دەرچوونەدا بەشدار بم، ئاوەکان پڕ دەکەمەوە و بریندار و نەخۆشەکان چارەسەر دەکەم..گەر بریندار هەبوو..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو لەسەر بەرەکەتی خوا وەرە، چەند هاوەڵێکیشت هەیە لە هۆزەکەی خۆت و کەسانی تر کە مۆڵەتم داوە پێیان بێن، لەگەڵ هۆزەکەت پێت خۆش بوو ئەوا لەگەڵیان بە، لەگەڵ ئێمەشت ویست ئەوا دەتوانی لەگەڵ ئێمە بێیت، ئومم سینان وتی: لەگەڵ تۆ دێم.. پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو لەگەڵ (ئوم سەلەمەی) خێزانمدا دەبیت، جا لەگەڵ ئەودا بەشداری ڕزگار کردنی خەیبەری کرد، لەگەڵ پێغەمبەریشدا (ﷺ) دەچوو بۆ نوێژی هەینی و هەردوو جەژنەکە، (ثبیتةی کچی حنظلةی ئەسلەمیە)ی کچی فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە[1]..

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# لەیلای غیفاری

جەنگاوەرێکی تێکۆشەر بوو، لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بۆ جەنگەکان دەردەچوو، چارەسەری بریندار و نەخۆشەکانی دەکرد..

کاتێ عەلی کوڕی ئەبو تالب بەرەو بەصرە ڕۆیشت لەگەڵیا چوو، ڕۆیشت بۆ لای عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) و پێی وت: ئایا گوێت لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) چی لە بارەی عەلیەوە دەفەرموو؟ وتی بەڵێ، عەلی هاتە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) منیش لە لای بووم، کراسێکی قەدیفەی کۆنی لەبەردا بوو، لە نێوان من و پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دانیشت، منیش پێم وت: جێگەیەکی لەمە فراوانترت بۆ خۆت نەدۆزیەوە؟

پێغەمبەر فەرمووی: ئەی عائیشە..لە براکەم گەڕێ بۆم..چونکە ئەو لە یەکەمین ئەو کەسانەیە بڕوایان پێ هێنام و کۆتا کەسیشە کە پێم دەگاتەوە یەکەمین کەسیشە لە ڕۆژی قیامەتدا پێم دەگاتەوە.

لەیلای غیفاری (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ڕیوایەت کردووە و محمدی کوڕی قاسمی تائی فەرموودەی لێ گێڕاوەتەوە[١].

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبديع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# نەسیبەی کچی حارس

لە هاوەڵە پایەدارەکانە.. لەگەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەشداری غەزاکانی دەکرد و بریندار و نەخۆشەکانی چارەسەر دەکرد..

بەشداری شۆردنی کوڕەکەی پێغەمبەر (ﷺ)ی کردووە، لە شاری بەسرە ژمارەیەك لە زانایانی تابعین چۆنیەتی شۆردنی مردوویان لێوەردەگرت.

لە پێغەمبەر (ﷺ) و عومەرەوە چل فەرموودەی گێڕاوەتەوە و، ئەنەسی کوڕی مالیك و محمدی کوڕی سیرین فەرموودەیان لێ ڕیوایەت کردووە[1].

---

[1] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# غەزالی حەروریە

تێکۆشەرێکی ئازا بوو.. خێزانی سەرکردەی قارەمان: شەبیبی کوڕی زەید بوو کە یەکێك بوو لەو سەرکردانەی سوپاکان لێیان تۆقیبوون و دڵەکانیان پڕ لە ترس کردبوو، زمانەکان! باسیان دەکردن و زەویشیان بۆنخۆش دەکرد.

دەگێڕنەوە کە حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی بە خۆی و سەربازەکانیەوە، کە پڕ چەك و ئامادەباش بوون هاتن، غەزالە بە چل کەسەوە ڕێگەی پێگرتن، لە کاتێکدا ئەوان چل هەزار کەس بوون، لە ترساندا دڵی کەوت و ڕایان کرد..

چاونەترسیەکەی گەیشتبووە ڕادەیەك سوێندی خوارد بوو کە دەبێت دوو ڕکات نوێژ بکات لە مزگەوتەکەی کوفەدا، لە یەکەمیاندا سوڕەتی بەقەرە بخوێنێت. لە ڕکاتی دووەمیشدا آل عمران، شاری کوفەش لەو کاتەدا پێگەی حەجاج و هێزەکەی بوو..

سوێندەکەی خۆی بەجێ گەیاند و، خۆی و مێردەکەی دوو ڕکات نوێژیان لە مزگەوتەکەدا کرد و حەجاجیش لە ترساندا خۆی لە کۆشکەکەیدا شارد بۆوە.

حەجاج پێنج سوپای بۆ نارد، یەك بە یەك لەناوی دەبردن، تا وای لێهات لە هەموو عێراقدا لە ناوەکەی دەترسان..

دواتر غەزالە بە فێڵ کوژرا، لە ڕووداوی کوفەدا بە جۆرێ دەستەیەك لە سەربازانی حەجاج لە دواوە لێیان دا، لە کاتێکدا ئەو لە پێشەوەی سەربازەکانی دەجەنگا[1]..

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# ئوم موسای کچی نوصەیر

لە ئافرەتە هۆشمەند و دانا و.. ئازا و بەجەرگەکان بوو.. لەگەڵ مێردەکەیدا بەشداری شەڕی یەرمووکی کردووە.. لە کاتێکدا کە لە نێو کۆمەڵێك ئافرەتدا بوو.. ئەو دەمەی پیاوەکان خولێکیان لە جەنگەکە دەست پێکرد، بینی بۆ باوەڕێك پیاوێکی موسڵمانی ڕادەکێشا، ئاسنێکی هەلگرت و، لێی نزیك بوویەوە و، دای بەسەریدا و کوشتیی و، تالآنی کرد[١]..

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# ئەزدەی کچی حارسی کوڕی کلدە

تێکۆشەرێکی هۆشمەند و خاوەن بیروڕا بوو..کاتەکانی ناخۆشی و شەڕی بە هەموو هێز و توانا و چاونەترسیەوە بەڕێ دەکرد و، سەرکەوتنی گەورەی بەسەر دوژمنەکانیدا بەدەست هێنا..

مێژوونووسەکان دەگێڕنەوە کە ئەزدە خەڵکی موسڵمانی (میسان)ی کۆ کردەوە و لە (مرغاب) گەیشتە (موغیرەی کوڕی شعبە)، کە دوژمن هێشتا لە پشت دیجلەوە بوو، ئەزدە وتی: پیاوەکانمان ڕووبەڕووی دوژمنن و ئێمەش لە دواوەیانین، ترسی ئەوە هەیە کە بۆمان بێن هیچ بەربەستێکمان نیە و دەترسم دوژمنان زۆر بن و موسڵمانەکان بشکێنن.. جا گەر ئێمە بڕۆینە دەرەوە ئاسودە دەبین لەوەی کە لێی دەترسین کە دوژمن بێت بۆمان و، دوژمنیش وا دەزانن کە ئێمە ئامادە و هاوکارین و، بۆ موسڵمانەکان هاتووین، ئەوەش دەیانشکێنێ، ئەمەش پلان و فێڵە..

بە قسەیان کرد و، ئەزدە سەرپۆشەکەی کردە ئالا و، ئافرەتەکانیش بە هەمان شێوەیان کرد و، بەرەو پێشەوە ڕۆیشتن، هەتا گەیشتنە لایان کە بێ بڕواکان لەگەڵیاندا دەجەنگان، کاتێ بێ باوەڕەکان ئەو ئالایانەیان بینی بەرەو لایان دەهاتن وایان زانی کۆمەڵێك بۆ موسڵمانەکان هات، ڕایانکرد و موسڵمانەکان شوێنیان کەوتن و زۆریان لێ کوشتن[1].

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# بەشی نۆیەم

# ئافرەتانێکی خواپەرست و دونیانەویست

معاذەی کچی عەبدوڵلای عەدەویە.

حەفصەی کچی سیرین.

زەجلەی خواپەرستی دونیا نەویست.

رابیعەی کچی سولەیمانی شامی.

غفیرەی خواپەرست.

ئامینەی رەملیە.

شعوانە.

رابیعەی قەیسیە.

حسنەی خواپەرست.

میمونەی خوشکی ئیبراهیمی خەواص.

دایکی هاونی خوراسانیی.

مضغەی خوشکی بشری کوڕی حارس.

خەنسائی کچی رخدام.

مخەی خوشكی بشری كوڕی حارس.

عائیشەی كچی عیمران كوڕی سولەیمان.

دایكی غەسانی ئەعرابی.

منیفەی كچی ئەبی تارق.

منفوسەی كچی زەیدی فەوارس.

عجردەی عەمیە.

تایفە.

فاتمەی نیسابوری.

عائیشەی كچی عوسمانی كوڕی سەعیدی نیسابووری.

# معازەی کچی عبداللەی عەدەویە

ئافرەتێکی خواپەرستی دونیا نەویستو، زانایەکی تێگەیشتوو بوو، کاتێ ڕۆژ دەبوویەوە دەیووت: ئەمە ئەو ڕۆژەمە کە تێیدا دەمرم، لەبەر ئەوە نەدەنووست.

تاکاتێ شەو دادەهات ئەمجا دەیووت: ئەمە ئەو شەوەیە کەتێیدا دەمرم، ئیدی نەدەنووست تا ڕۆژ دەبوویەوە.

ئەو کاتانەشی سەرما بووایە جلێکی ئاسایی لەبەر دەکرد تاسەرمای ببێتو خەوی لێنەکەوێتو شەوەکەی بەشەو نوێژکردن زیندوو ڕادەگرت، خۆ گەر خەویش زۆری بۆ بهێنایە هەڵدەستایەوەو بەنێو ماڵەکەیدا دەهاتو دەچوو دەیووت: ئەی نەفسەکەم ئەمڕۆت لەبەردەمدایە ئەگەر مەرگ بێت ئەوا بەحەسرەتەوە دەچیتە نێو گۆڕ..پاشان تا ڕۆژ دەبوویەوە دەهاتو دەچوو دەنرسا مردن بەلەناکاویو کاتێ خەوتووە بێت..ئەو لەشەوو ڕۆژێکدا شەش سەد ڕکات نوێژی دەکردو دەیووت: سەرم سوڕماوە لەو چاوەی دەخەوێت لەکاتێکدا دەزانێت ماوەی ڕاکشان لەنێو تاریکایی گۆڕدا چەندە درێژە.

لە ئافرەتێکیشەوە کە مەعازە شیری پێداوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: مەعازە پێی وتم:

کچۆڵەکەم وریاو بە تکایە لە گەیشتنەوە بەپەروەردگار، چونکە من بینیوەمە تکاکار بەچاك خۆسازدان خۆشبەخت بووە ئەو رۆژی پێیدەگاتەوە، بینیویشمە ترساو لەخوا بە ئومێدە لە گەیشتنە ئەو کاتەی خەڵکی بە پەروەردگاری جیهانیان دەگەنەوە، پاشان گریا.

کاتێ مێردەکەی مرد، سەرجێگای نەبینی، تا ئەویش مرد. دەیووت: سوێند بەخوا حەز بەمانەوە ناکەم تەنها بۆ ئەوە نەبێت کەبەهۆی هۆکارەکانەوە لەپەروەردگارم نزیك ببمەوە..

مەعازە دەیووت: حەفتا ساڵ من ژیام هەرگیز چاو رووناککەرەوەیەکم تێدا نەبینی..

مەعازە لەعائیشەی دایکی بڕواداران‌و، دایکی عەمری کچی عەبدوڵای کوڕی زوبەیرو هیشامی کوڕی عامرەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

ئەبو قەلابەو قەتادەو یەزیدی رەشك‌و کەسانی تر فەرموودەیان لێگێڕاوەتەوەو جەماعە فەرموودەیان تۆمار کردووە، ئیبن حەیانیش لە (الثقات) باسیکردووە.

مەعازە خوا لێی خۆش ببێت ساڵی ١٠١ی کۆچی کۆچی دوایی کرد.[١]

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کراوی و دەستکاریەوە).

# حەفسەی کچی سیرین

خاتونێکی پایـەدارە، لـە ئافرەتـە تابیعیەکانـە، بەخوداپەرسـتی و خوێنـدنی قورئان و فەرموودە بەناوبانگ بووە، هەر لە تەمەنی دوانزدە ساڵیەوە قورئانی خوێندوە و، ئیبن سیرین ئەگەر شتێکی لە قورئانـدا لیّ تێکـەڵاو بوایـە دەیـووت: بڕۆن بۆ لای حفصە و لێی بپرسن چۆن دەخوێندرێتەوە..

خوداپەرسـتێك بـوو زۆر خـۆی مانـدوو دەکـرد لـە پەرسـتـشدا و، دەچـووە مزگەوتەکەیەوە و نوێژی نیوەڕۆ و عەسـر و شێوان و عیـشا و بـەیانی دەکـرد، بەردەوام تێدا بوو هەتا ڕۆژ بەرز دەبوویەوە و ئینجا ڕوکوعی دەبـرد و دەهاتـە دەرەوە کە تەنها ئەو کاتەی هەبوو بۆ دەسـت نوێـژ گـرتن و خـەوتن، کـە کاتـیّ نوێژ دەهاتەوە دەگەڕایەوە مزگەوتەکەی و بە هـەمان شـێوەی ڕابـردوو. نیـوەی قورئانی هەموو شەوێك دەخوێنـد و، هەمیـشە بـەڕۆژوو بـوو تـەنها جەژنـەکان نەبێت..

کفنێکی هەبوو، کاتیّ حـەجی دەکـرد و ئیحرامـی دەبەسـت لەبـەری دەکـرد، کاتیّ دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان دەهات شـەوان شـەو نوێـژی دەکـرد و کفنەکـەی لەبەر دەکرد..لە وتـەکانی : ئـەی کۆمـەڵی لاوان لـە نەفسی خۆتـان بگرنـەوە و ماندووی بکەن لەکاتێکدا کە لاون، من بینیومە کار لە لاوێتی دا دەکرێت..

حفصە لە یەحیای برای و ئەنەسی کوڕی مالیك و دایکی عطیةی ئەنـصاری و کەسانی تریشەوە ڕیوایەتی کردووە[1]..

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# زەجلەی خوداپەرست و دنیازویت

فەرمووده ناسێکی خاوەن چاکە و خودا پەرست.. بە ڕۆژ بەڕۆژوو و بە شەو شەونوێژکار بووە..

یەکێك لە قورئان خوێنەکان کە بینی زۆر خۆی ماندوو دەکات لە پەرستیش دا پێی وت: بەزەییت بە خۆت دابێتەوە، لە وەڵامدا وتی: نەرمی بەکارهێنان لەگەڵ خۆم و بەزەیم بۆچیە، ژیان چەند ڕۆژێکە و دەگوزەرێت، هەر کەس ئەمڕۆ شتێکی لە دەست بچێت، سبەینێ ناتوانێ دەستی بخاتەوە..سوێند بە خوا نوێژ بۆ خودا دەکەم هەتا چوار پەلم لەکار دەکەون و، هەموو ڕۆژەکانی ژیانم بۆ خودا بەڕۆژوو دەبم و، دەگریم بۆی و ئازاری چاوەکانم بەرگە دەگرم..پاشان وتی: کام لە ئێوە فەرمانێك بکات بە کۆیلەکەی (بەندەکەی) و حەز دەکات بەندەکە کەمتەرخەمی تێدا بکات؟

ابو عتبەی خواص دەڵێت: چووینە سەردانی زجلەی خوداپەرست، بینیمان ئەوەندە ڕۆژووی گرتبوو ڕەش داگیرسا بوو، ئەوەندە گریا بوو چاوەکانی کوێر بوو بوون و، ئەوەندەی نوێژ کرد بوو هەتا لەجوڵە کەوتبوو.

زەجلە چاوەکانی بۆ ئاسمان بەرز نەدەکردەوە و، هەروەها دەچووە کەناری (دەریا) و جل و بەرگی ئەو موجاهیدانەی دەشوشت کەلەپێناوی خوادا دەجەنگان[1].

---

[1] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# رابیعەی کچی سولەیمانی شامی

خوداپەرستێکە لە خودا پەرستەکانی شام، لە وتەکانی : (ئەگەر بەندە هەستا بە گوێڕایەڵیی خودا، خودای بالاّ دەست کارە ناشیرینەکانی نیشان دەدات و سەرقاڵ دەبێت بە چاککردنەوەیان ....) لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە و لە شوێنەکەی خۆیدا نزیك قوتابخانەی (قیمریە) لە دیمەشق بە خاك سپێردراوە، لە ڕیوایەتێکیش دا هاتووە کە لە (قدس) نێژدراوە[١]..

[١] (أعلام النساء) عمر رضا کحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# غوفەیرە خوداپەرست

خوداپەرستێکی خەڵکی بەسرەیە و، شەوان نەدەنوست..

نوحی کوڕس سەلەمەی وەراق پێی وت: بیستوومە کە تۆ ناخەویت..

غوفیرە گریا و وتی: لەوانەیە حەزم لە خەوتن بوو بێت بەڵام نەم توانیوە کە بخەوم، چۆن دەخەوێت یان توانای خەوتنی دەبێت کەسێك کە هەردوو پاسەوانەکەی (حفیظ و رقیب) بە شەو و ڕۆژ ناخەون..

نوح وتی: سوێند بە خوا گریاندمی و لە دڵی خۆمدا وتم: تۆ لە شتێکدا دەبینم و خۆم لە شتێکی تردا..

دەربارەی ولایەت و ناساندنی پرسیاریان لێ کرد..! وتی: کاتەکانی وەلیایەتی ئەو کاتانەیە کە سەرقاڵە و ناییەرژێتە سەر دونیا، وەلی هیچ کاتێکی نیە لە دنیادا کە خۆی پێوە سەرقاڵ بکات جگە لە کاری خودا، هەر کەسێکیش وتی کەوا ئەولیایەك سەرقاڵە بە کارێکەوە جگە لە خودای باڵا دەست ئەوە درۆزنە[1].

---

[1] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# ئامینەی ڕەمیلە

خــودا پەرســتێكە لــە خــودا پەرســتەكانی ســەدەی ســێیەمی كۆچــی، خوداپەرســتان و زاهیــدەكانی زەمــانی خــۆی دەهاتنــە ســەردانی، هەنــدێ لــە خوداپەرستان هاتنــە لای و داوایان لێ كـرد كـە نزایـان بۆیـان بكـات، پێـی وتـن: (ئەگەر داواكاران بێدەنگ بونایە، پیرەكەتان لەبەر لالّی قسەی نەدەكرد، بـەلاّم پاڕانەوە و نزا بۆ كردن سوننەتە.. پاشان وتی: خودا بەهەشت بكاتـە ئارامگـا و شـوێنتان و، یـادی مـردن لـە لای مـن و ئێـوە هەمیـشە لـە مێـشكماندا بێـت و، ئیمانمان پارێزراو بكات كە خۆی بە بەزەیترین بەزەیدارانە..

(بـشری كـوڕی حـارث) نـەخۆش كـەوت و، ئامینــە لــە ڕەملــەوە چــوو بـۆ سەردانی..

لە كاتێكدا كە ئامینـەی لـە لا بـوو ئیمـامی ئەحمـەدی كـوڕی حەنبـەل هاتـە ژوورەوە بۆ لای تا سەردانی بكات.. كاتێك ئیمامی ئەحمەد زانی ئامینە لەوێیە داوای لـە بـشری كـوڕی حـارث كـرد كـە داوای لێ بكـات كـە بۆیـان بپاڕێتــەوە.. ئامینە وتی: خودایە بشری كوڕی حارث و ئەحمەدی كوڕی حەنبەل پەنات پێ دەگرن لە ئاگر پەنایان بدە[1].

---

[1] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە كردن و دەستكاریەوە).

# شەعوانە

خوداپەرستێکی دونیا نەویستیی چاو بە گریان بوو.. شەو و ڕۆژ دەگریا و ترسان کە کوێر ببێت بەهۆی گریانی زۆریەوە، لەم بارەیەوە قسەیان لەگەڵدا کرد، وتی: سوێند بە خودا لە دنیادا لەبەر گریان کوێر ببم، پێم خۆشترە لەوەی لە ڕۆژی دواییدا لەبەر ئاگر کوێر ببم..

فضیلی کوڕی عیاض داوای لێ کرد کە لە لای خودا و دوعا و نزای بۆ بکات، شەعوانە پێی وت: ئەی فضیل یان لە نێوان خۆت و خودای خۆت دا نهێنی و پەنهانت نیە کە ئەگەر داوای لێ بکەیت وەڵامت دەداتەوە.. فضیل قوڵپە گریانێك قورگی گرت (دەنگێك لە قورگیەوە دەهات) و بورایەوە. شەعوانە کاتێك لە لای مالیکی کوڕی دینار بوو گوێی لە یەکێك بوو دەیووت: موتتەقی ناگاتە ڕاستێتی تەقوا، هەتا خۆشەویسترین شت لە لای گەڕانەوە نەبێت بۆ لای خودا.. شەعوانەش کە چووە دەرەوە هیچ هۆشی لە لای خۆی نەما بوو..

دەیووت: هەر کەسێك لە ئێوە دەتوانێت بگری با بگری، ئەگەر نا بەزەیی بەو کەسەدا بێتەوە کە دەگری، چونکە ئەو کەسەی دەگری گریانەکەی لەبەر ئەوەیە دەزانێت دەروونی چی بەسەردا هاتووە[1].

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# رابیعەی قەیسیە

خوداپەرستێکی دنیا نەویستی ژیان زبر (ژیانی هەژارانە) بوو..خاوەن زمان پاراوی و ڕوونی قسە کردن بوو، هاوڕێیی رابیعەی عەدەویە بووە..

پێی وترا: ئایا قەت کارێکت کردووە کە وای لێ ڕابینیت قبوڵ بووە؟ وتی: ئەگەر شتێکیش بووبێ ئەترسم بدرێتەوە بەسەرمدا..

هەروەها پێی وترا: ئەگەر مۆڵەتمان بدەی، تا هۆزەکەمان پارەی خزمەتکارێکت بۆ کۆ بکەنەوە و بۆت بکڕن تا کاسبیت بۆ بکات و ئیش و کارت بۆ بکات و تۆش خۆت یەکلا بکەیتەوە بۆ خوداپەرستی، وتی: سوێند بە خوا من شەرم دەکەم کە داوای دنیا لە یەکێك بکەم کە خۆی خاوەنی دنیایە، ئیتر چۆن داوای دنیا لە کەسانێك دەکەم کە خاوەنی نین[1].

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# حسنەی خوداپەرست

خودا پەرستێکە لە خودا پەرستەکانی بەسرە..خۆشیەکانی دنیای پشت گوێ خست و سەری کردە خوداپەرستی و بە ڕۆژ بە ڕۆژو و بە شەویش شەو نوێژی دەکرد و، ماڵەکەی هیچی تێدا نەبوو..

ژنێك پێی وت: شوو بکە، حسنە وتی: پیاوێکی وام پێ بۆ بێنە کە هیچم لە کاروباری دنیادا داوا لێ نەکات، پێم وایە کە ناتوانیت ئەوە بکەیت، سوێند بە خوا لە دەروونم دا نیە کە دنیا بپەرستم و، خۆشی لە پیاوانی دنیا وەربگرم.. ئەگەر پیاوێکت دۆزیەوە بگری و بمگرێنێ و بەڕۆژوو بێت و فەرمانی چاکەم پێ بکات و، خێر بکات، ئەوا زۆر چاکە.. ئەگینا پیاوان خوا حافیزیان بێت[1].

[1] (أعلام النساء) عمر رضا کحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# مەیمونەی خوشکی ئیبراهیم کوڕی ئەحمەدی خەوواس

خوداپەرستێکی دنیا نەویست بوو، هەمان ڕێچکەی براکەی لە وەرع و پشت بە خودا بەستن و، دنیا نەویستی و زبری ژیاندا گرتبووە بەر..ڕۆژێکیان براکەی چووە لای پێی وت: ئەمڕۆ زۆر دڵم تەنگە، پێی وت: هەر کەس دڵی لێی تەنگ بوو دنیاشی لە لا تەنگ دەبێتەوە بە هەموو ئەو شتانەیشی کە تێدایە، ئایا نابینی خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾[١]. واتە: هەروەها تەوبەی ئەو سێ کەسەشی وەرگرت، کە دواکەوتن دوای ئەوەی کە سەر زەوی چەندە فراوانە لێیان تەنگ بۆوە، خۆیشیان لەخۆیان بێزار بوون، دڵنیاش بوون کە هیچ پەنایەك نیە جگە لەوەی خۆیان بدەنە پەنای ئەو زاتە، لەوەودوا ئیتر تەوبەی لێ وەرگرتن، تا تەوبە بکەن، بەڕاستی هەر خوا تەوبە وەرگرەو میهرەبانە.

لەسەر زەوی وا فراوانیان هەبوو شتیان زۆر لەبەر دەستدا بوو، بەڵام کاتێك دەروونی خۆیانیان لە لا تەنگ بوو زەویش بەو فراوانیەیەوە لە لایان تەنگ بوویەوە".

یەکێك لە دەرگای ماڵی براکەیدا و، ئەویش لە ماڵ نەبوو، کابرا لێی پرسی کەی دەگەڕێتەوە، پێی وت: (کەسێك گیانی بە دەستی کەسێکی تر بێت کێ دەزانێت کەی دەگەڕێتەوە[٢]..

---

[١] سورة التوبة آية _١١٨.

[٢] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# ئوم هارونی خورسانی

خوداپەرست و، دنیا نەویست و، ژیانێکی زبری هەبوو..خاوەن چاکە و تەقوا و زۆرێك لە قوتابی وانەیان لە لا وەرگرتووە، وەك زاهیدی گەورە (ئەبو سولەیمانی درانی)..

ڕۆژێکیان ئەبوسولەیمان لێی پرسی: چی دەڵێیت دەربارەی کابرایەك کە حەز بکات بگاتەوە (حەز بە مردن بکات) بە دیداری خودا؟ وتی: .. هاوار بۆ خۆت.. ئەو پیاوە گوێڕایەڵی و خوداپەرستی بەلاوە گران بووە و حەزی بە حەوانەوە هەیە لێی.. پێی وت: ئەی ئەگەر حەزی کرد هەر لە دنیا بمێنێتەوە، وتی: هاوار بۆ تۆ .. ئەو کابرایە حەزی بە گوێڕایەڵیەو حەزدەکات هەر بۆ ئەوە بژی و خوداپەرستیەکەی بۆ بمێنێ..

ئەبو سولەیمان بە ئومم هارونی وت: حەز دەکەیت بمریت..وتی: نەخێر، وتی: بۆچی ڕقت لە دیداری خودای بالآدەستە؟ ئومم هارون گریا و پاشان وتی: ئەبا سولەیمان ئەگەر سەرپێچی ئادەمیزادێك بکەیت حەز ناکەیت بیبینیت، ئیتر چۆن حەز بە دیداری خودا بکەم کە من سەرپێچم کردووە.. ئەبو سولەیمان بوورایەوە و کەوتە سەرزەوی.

ئومم هارون تەنها نانی وشکی دەخوارد و، دەیووت: ئەمڕۆ وەدەست دێنم و بە هەل وەری دەگرم تا شەو دێت، ئەگەر شەو هات لەسەرەتاکەیدا هەڵدەستم شەونوێژ دەکەم و، ئەگەر پار شێو هات ڕۆحم لە دڵم نزیك دەبێتەوە..

ئومم هارون هەموو مانگێك جارێك لە دیمەشقەوە دەهات بۆ (بيت المقدس) بە پێ (پیادەیی)[1].

---

[1] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# موضغەی خوشکی بیشری کوڕی حارسی حافی

خوداپەرستێکی بە تەقوا و پارێزکار بوو، خوشکی گەورەی (بشر)ە و، لە خۆی گەورەترە و، لە پێش (بشر)یشدا مرد، بشر زۆر بۆی دلگران بوو، گریانێکی زۆر بە کوڵ بۆی گریا، کاتێك پرسیاری لێ کرا لەم بارەیەوە، وتی: لە هەندێ لە کتێبەکاندا خوێندوومەتەوە کە بەندە ئەگەر کەمتەرخەمی کرد لە خزمەت پەروەردگاریدا هاوەدەمێکی لێ دەستێنێتەوە، مضغەی خوشکەیشم هاودەمی من بوو لە دنیادا[1]..

---

[1] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# خەنسای کچی رەخدام

خوداپەرستێکە لە خودا پەرستەکانی یەمەن و، زۆر بەڕۆژوو دەبوو..

چل ڕۆژ بەڕۆژو بوو هەتا پێستەکەی بە ئێسکەکانیەوە نوسا بوو.. ئەوەندەش گریا بوو هەردوو چاوەکانی کوێر بوو بون و، هێندەش هەستا بۆ شەو نوێژ کردن هەتا قاچەکانی لەکار کەوتن..کاتێ شەو دائەهات و، چاوەکان ئارامیان دەگرت، بە دەنگێکی پڕ سۆزەوە کە هەیبوو دەیووت: (ئەی خۆشەویستی گوێڕایەڵان هەتا کەی ڕەگی گوێڕایەڵان لەناو خۆڵدا بەند دەکەیت، زیندویان بکەرەوە تا ژووانە ڕاستەکەت هەڵبژێرن.. تاووسی کوڕی وەهەبی کوڕی منبە کە ساڵی ١١٠ ك مردووە زۆر ڕێزی خەنسائی گرتووە[١].

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# موخەی خوشکی بیشری کوڕی حارسی حافی

لە گۆشەکراوانی پەرستش و وەرعە و..مۆڵەتی لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وەرگرت و وتی: _لە پشتی پەردەوە بوو- : ئەی ئەبا عبدالله..من ئافرەتێکم شەوان لەبەر چرا شت دەچنم، لەوانەیە کە چراکەم لێ بکوژێتەوە لەبەر ڕۆشنایی مانگ دا شت دەچنم، ئایا پێویستە ئەوەی کە لەبەر ڕۆشنایی مانگدا دەیچنم جیای بکەمەوە بۆ کڕیار لەوەی لەبەر چرا چنیومە (واتە مەبەستی ئەوەیە کە لەوانەیە ئەو پارچەیەی کە چنیویەتی لەبەر ڕۆشنایی مانگدا بە شێوەی جوانی ئەو چنینە نەبێت کە لەبەر چرای چنیووە).

ئیمامی احمد پێی وت: ئەگەر پێت وایە جیاوازیان هەیە ئەوا پێویستە لەسەرت کە ڕوونی بکەیتەوە. پاشان پرسی: ئەی ئەبا عبدالله : ئایا ناڵە و نکەنکی نەخۆش سکاڵا کردنە ؟ ئیمامی ئەحمەد وتی: تکام وایە کە وا نەبیت، بەڵام سکاڵایە بۆ لای خودای باڵا دەست..عبدالله دەڵێت: خودا حافیزم لێ کرد و چووە دەرەوە، ئیمام وتی: کوڕم هیچ مرۆڤێکم نەبینیوە کە ئەم جۆرە پرسیارانە بکات.. ئەم ئافرەتە کێ بوو؟ وتی: ئەوە خوشکی بشری حافی یە.

ئیمامی ئەحمەد وتی: مەحاڵە ئەمە هەر تەنها ئەبێ خوشکی بیشر بێت[1].

---

[1] (نساء زاهدات) محمد خير يوسف (بە دەستکاریەوە).

# عائیشەی کچی عیمرانی کوڕی سولەیمانی مەنوب

لە پەروەردەکراوانی دنیا نەویستی و ژیان زبری بوو..لەباوەشی باوکیدا گەشەی کرد و زۆر گرنگی دا بە پەروەردە کردنی و، فێری قورئانی کرد و، بە جوانی لەبەری کرد و پاشان سەری کردە دنیا نەویستی و چاکەخوازی و..بەدەستی خۆی ڕستن و چنینی دەکرد و لێیەوە دەستمایەی ژیانی خۆی بەدەست دەهێنا..

زۆر خێرکەر بوو بەرانبەر هەژاران و نەداران و، پێویستی ئەو کەسانەی پڕی دەکردە نەدار بوون و هیچی لەو کاسبیەی خۆی گل نەدەدایەوە و هەڵنەدەگرت..

دەگێڕنەوە لێی کە دەیووت، ئەگەر شەوێك ڕۆژم بکردایەتەوە و یەك درهەم لە گیرفانیدا بوایە و نەی کردایە بە خێر دەیووت: (خوداپەرستی ئەم شەوم کەم و کورت بوو)[1]..

---

[1] (نساء زاهدات) محمد خير يوسف (بە دەستکارییەوە).

# ئوم غەسانی ئەعرابی

خوداپەرستێکی دنیا نەویستە، چاوی تێر بوو، لەبەری رەنجی خۆی خواردنی پەیدا دەکرد، خوری دەچنی و دەیووت: سوپاس بۆ خودا لەسەر ئەوەی قەزای لەسەریەتی و پێی ڕازییە، ئەوەی کە خودا ڕەزامەندی لەسەرە بۆ من منیش پێی ڕازیم، پشت بە خودا دەبەستم بۆ ماڵێکی تەنگ و تیاچوو، کەم مانەوە و تێڕامان، پشت بە خودا دەبەستم بۆ هەموو ئەو لایەنانەی کە خۆی پێی شارەزایە[١].

[١] (نساء زاهدات) محمد خير يوسف (بە دەستکارییەوە).

# مەنیفەی کچی ئەبو تاریق

یەکێکە لە خودا پەرستەکانی بەحرەین. خۆشی و شادی لە شەونوێژدا وەدەست دەهێنا، کاتێ شەو دادەهات دەیووت: بەه بەه ئەی نەفس ئەوە شادی ئیمانداران هات، جلی لەبەر دەکرد و دەچووە ناو میحرابەکەیەوە، پاشان کە نوێژی عەسری دەکرد پاڵی دەدایەوە تا خۆرئاوا بوون و، ئەمەش کاری بوو..پاشان پێی وترا، ئەگەر ئەم خەوەت بخەیتە شەو ئارامتر و باشترە بۆ جەستەت، وتی: نەخێر سوێند بە خوا لە تاریکی شەودا ناخەوم هەتا لە دنیادا مابم، لەسەر ئەم شێوەیە بەردەوام بوو هەتا چل ساڵ..

عامری کوڕی مەلیکی بەحرانی لە دایکیەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: شەوێکیان لە لای مەنیفەی کچی ئەبی تاریق مامەوە، کە لە سەرەتای شەوەوە هەتا کۆتایی شەو لەم ئایەتە زیاتری نەوت و دووبارەی دەکردەوە و دەگریا: ﴿وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[1]. واتە: جا ئێوە چۆن کافر دەبن لە کاتێکدا کە ئایەتەکانی خواتان بەسەردان دەخوێنرێتەوە، پێغەمبەرەکەی لەناوتانایە، جا ئەوەی پشت بەخوا ببەستێت و پەیڕەوی لە بەرنامەکەی بکات، ئەوە بۆ ڕێگەو ڕێبازێکی ڕاست و دروست هیدایەت دراوە.

---

[1] سورة ال عمران آية ١٠١.

# مەنفوسەی کچی زەیدی فەوارس

خوداپەرستێکی دونیا نەویست بوو، زۆر دەگریا لە ترسی خودا و، ئارامگر بوو، قەت لە گریان نەدەپچڕا، کاتێك لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵ دەکرا دەیووت: سوێند بە خوا پێم خۆشە، کە بگریامایە تا فرمێسکم کۆتایی دەهات، پاشان دەگریام و خوێنم دەوەراند هەتا یەك پەل لە لاشەمدا نەدەما خوێنی تێدا بمایە، هەروەها دەیووت: هەر کەسێك نەیتوانی بگری، با بەزەیی بەو کەسانەدا بێتەوە کە دەگرین، چونکە ئەو کەسەی دەگری لەبەر گومانێکە کە لە دەروونی خۆیدایە و، بۆ ئەوەی بەسەریدا هاتووە و ئەوەی بەڕێوەیە توشی بێت دەگری .. دەگریا و دەیووت: خودای من خۆت دەزانیت کە تینووی خۆشەویستی تۆ قەت تێر ئاو نابێت.. مەنفوسە کوڕەکەی دەمرێت.. ئافرەتانیش لە دەوریدا دەنوزێنەوەو (شینی بۆ دەکەن)، لە کاتێکدا کە لە کۆشی خۆیدایە و دەیوت: (سوێند بە خوا ڕۆشتنت بەر لەمن خۆشترە لام لەوەی دوا بکەویت بۆ دوای من، ئارام گرتنم لەسەرت باشترە لە بێئومێدیم لەسەرت (لە ترسی ئەوەی تیا بچێت)، ئایا بەشی چ بەڵایەك جێگەی لەناوچوونی تۆ ئەگرێت، چ موسیبەتێکیش هەڵوەشێنترە لە مردنت، هەرچەندە دوورکەوتنەوەت ئاخە، ئومێدی پاداشت وەرگرتنم خێرترە.

فضیل ی کوڕی عیاض سەردانی دەکرد و چەند جار دەچووە ماڵی و داوای دوعای خێری لێ دەکرد[1].

---

[1] لە (نساء زاهدات) محمد خير يوسف (بە دەستکاریی و کورت کردنەوە) / (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# عەجردەی عەمیە

خوداپەرستێکە لە خودا پەرستەکانی بەسرە..لە سەرەتای شەوەوە هەڵدەستا هەتا پار شێوە و بە دەنگێکی غەمگینانە هاواری دەکرد:

(بۆ لای تۆ خوداپەرستەکان تاریکی شەوانیان بڕیوە بە الله اکبر کردن.

هەتا کۆتاییەکەی .. بەردەوام دەگریا و، لە سوجدەدا دەپاڕایەوە هەتا خۆر هەڵدەهات، ئەمە کاری بوو بە درێژایی سیساڵ.

ئامینەی کچی یەعلی کوڕی سهیل دەڵێت: (عەجردەی عەمیە سەردانی دەکردین، ڕۆژێك یان دوان لە لامان دەمایەوە، کاتێ شەو دادەهات جلەکانی لەبەر دەکرد و لەچکی دەکرد (پەچەکەی)، پاشان هەڵدەستا بۆ سەر بەرماڵ و بەردەوام نوێژی دەکرد هەتا پارشێو، پاشان دادەنیشت دەپاڕایەوە هەتا خۆر هەڵدەهات[١].

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# طایفە

خوداپەرستێکە لە خوداپەرستەکانی (بیت المقدس)، لەوێش خوداپەرستی دەکرد، وەهەبی کوڕی منبە پێی دەووت: ئەی طایفە قورسترین کار چییە لەسەر شانت، ئەویش دەیووت: هیچ شتێك لە لام قورستر نیە لە درێژی تێڕامان و بیر کردنەوە، وتی: ئەوە چۆنە؟ وتی: من کاتێ بیر لە گەورەیی خودا و کاروباری قیامەت دەکەمەوە عەقڵم لە لا نامێنێت و چاوەکانم تاریك دەبن و، جومگەکانم خاو دەبنەوە، وەهەبی کوڕی منبەیش پێی وت: ئەگەر تۆ ئەمەت تووش بویەوە ئەوا پەنا ببە بەر قورئان خوێندن[١].

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریيەوە).

# فاتیمەی نەیسابوری

خوداپەرستێكی پایەدارە و، بیروڕای خۆی لەبارەی تێگەیشتنەكانی قورئان دەخستە روو، یەك بوو لە ئەولیاكانی خودا..

لە وتەكانی: هەر كەس خودای بالآدەستی لە یاد و مێشكدا نەبوو ئاگاداری نەبوو ئەوا لە هەموو بوارێكدا هەنگاو دەنێت و بە هەموو زمانێك قسە دەكات (واتە دو زمانی)، هەر كەسیش خودای لە یاد و مێشكدا بوو، ئەوا لالی دەكات لە هەموو شتێك تەنها ڕاستی نەبێت و، شەرم و دڵسۆزی بۆ خودا پێ دەبەخشێ.. هەروەها دەڵێت: ڕاستگۆ و ئەو كەسەی خۆی لە خودا نزیك دەكاتەوە لە دەریایەكدان شەپۆلەكان بەسەریاندا دێت و لە خودا دەپاڕێنەوە وەك ئەو كەسەی كە خەریكە بخنكێت، داوا لە خودا دەكات ڕزگاری ببێت و دەربچێت... هەروەها دەڵێت: (هەر كەس كاری كرد بۆ ئەوەی خودا ببینێ ئەوە دڵسۆزە). ذو نونی میسری پێی وت: (كاتێك كە لە بیت المقدس بە یەك گەیشتن) ئامۆژگاریم بكە..وتی: دەست بە ڕاستیەوە بگرە و دەروونی خۆت لە كارەكانتدا ماندوو بكە..لە مەككە لە ساڵی ٣٢٣ك دا كاتێك كە بۆ (عومرە) كردن چوو بوو وەفاتی كرد و ماڵئاوایی لە دنیا كرد[١].

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە كردن و دەستكاریەوە).

# عایشەی کچی عوسمانی کوڕی سەعیدی نەیسابوری

خوداپەرستێکی دنیانەویست، زۆر زاهید و گەورە بوو لە پاریزکاریدا ..بە کچەکەی خۆی وت: دڵخۆش مەبە بە شتێك کە تیادەچێت و دەبڕێتەوە و، خەم مەخۆ بۆ شتێك کە دەڕوات و، بە خودای باڵادەست دڵخۆش بە..

هەروەها پێی وت: لە ناوەوە و دەرەوەدا پەیڕەوی ئەدەب بکە، هیچ کەس نەبووە کە بە ئاشکرا ئاکاری ناشرین نەکات ئیلا بە ئاشکرا سزا دەدرێت و، هیچ کەس ئاکاری ناشرینی لە ناوەڕۆك دا نانوێنێت ئیلا سزای ناوەکی خۆی وەردەگرێت، هەروەها وتویەتی: هەر کەس لە تەنیایی خۆی بێ تاقەت و بێزار بوو ئەوە بەهۆی کەمی هاودەمیەتی خوداپەرستیەتی بۆ پەروەردگاری..

دەڵێت: هەر کەس بۆ بەندەکان خراپ و خیانەتکار بوو، ئەوە بەهۆی کەمی ناسینێتی بۆ گەورەکەیان، چونکە هەر کەس دروستکەرێکی خۆشویست ئەوەی کە دروستی کردووە ئەویشی خۆش دەوێت[1]..

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# بەشی دەیەم

# ئافرەتانی زمان پاراو و ڕەوانبێژ

ئــەروای کــچی حــارثی کــوڕی عبدالمطلب.
ئومم ڕەعلەی قشیریەیە.
ژنێك کە تـەنها بـە قورئـان قـسە دەکات.
سەفانەی کچی حاتەمی طائي.
حازیمە.
ئومم مەعبەدی خوزاعیەیە.
قیلەی کچی مەخرمە.
ژنی یەزیدی کوڕی سفیان.
ئومم هیثمی منقریە.
صدوق کچی حولەیسی عوذرية.
زرقائی کچی عودەی کوفی.
ئومم لبەنینی کچی عبـدالعزیزی کوڕی مروان.
ئومم خەیری کچی حەریش.
ڕەبــابی کــچی علقمــەی کــوڕی حفصەی طائي.
بەکارەی هیلالی.
ســودەی کــچی عمــارەی کــوڕی ئەشتەر.
جەروەی کچی غالبی تەمیمی.
ملك حەفنی ناصف.

# ئەروای کچی حارسی کوڕی عبدالمطلب

لە پەروەردەکراوانی زمان پاڕاوی و ڕەوانبیژییە.. کاتێك کە ببووە پیرەژنێکی بە تەمەن چووە لای معاویە، کە معاویە چاوی پێ کەوت، وتی: بەخێر بێیت پورێ، وتی: تۆ چۆنی ئەی برازام، لە دوامەوە نیعمەتەکانت چاوپۆشی کرد (پشت گوێت خست و) هاوڕێیەتیەکی خراپت بۆ ئامۆزاکانت هەبوو، ناوێکی تری جگە لە ناوی خۆتت لە خۆت نا و، جگە لە حەقی خۆتت برد.

معاویە وتی: پورێ.. ئەوەی دەتەوێ و مەبەستە بیڵێ و واز لە چیرۆك و ئەفسانەی ژنان بێنە.

وتی: فەرمان بکە بە (هەزار دینار و، هەزار دینار و، هەزار دیناری تریش).

وتی : چی دەکەیت بە هەزار دیناری یەکەم؟

ووتی: کانی (خوارە) لە زەوی (خوارە)دا پێ دەکڕم، تا بۆ هەژارانی بەنی حارثي کوڕی عبدالمطلب بێت.

وتی: بەوە ڕازیم، ئەی هەزار دینارەکەی تر؟

وتی: ژنی بۆ هەژارانی بەنی حارثي کوڕی عبدالمطلب پێ دەهێنم.

وتی: بەمەش ڕازیم، ئەی بە هەزار دینارەکەی تر؟

وتی: هەڵی دەگرم بۆ ناخۆشیەکانی زەمانە و، سەردان کردنی ماڵی خودا.

معاویە وتی: ئەوە فەرمانم کرد، کە پێت بدرێت.

پاشان پێ‌ی وت: بەڵام سوێند بە خوا ئەگەر عەلی زیندوو بوایە فەرمانی نەدەکرد بۆت کە ئەمەت پێ بدرێت.

وتی: ئەوە باسی عەلی دەکەیت.. پاشان دەستی کرد بە شیعر وتن پێیدا.

معاویەش گریا.. دوای ئەوە هەستا و ڕۆیشت[١].

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

(أخبار الوافدات من النساء علی معاویة) عەبباسی کوڕی بەکاری صەبی، پێداچوونەوەی سکینەی شەهابی، (بە کورت کردنەوە و دەستکاریەوە).

# ئوم رەعلەی قشیریە

خاتوونێکە لە پەروەردەکراوانی زمان پاراوی و ڕەوانبێژی، هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: سەلام‌و ڕەحمەت و بەرەکەتی خودات لەسەر بێ ئەی پێغەمبەری خودا ... من لە ئافرەتانی خاوەن سەرپۆشم و، جێگەی چاندنی مێردەکان و، بەخێوکاری منداڵەکانیان و. ڕازێنەری ماڵەکانیان (ئامادە کردنی ماڵەکان و چاك کردنی)، ئێمە هیچ بە شێکمان نیە لە سوپای مەزن دا، شتێکمان فێر بکە کە لە خودای باڵا دەست نزیکمان بکاتەوە..

پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: (پێویستە لەسەرتان یادی خودا بکەن بە شەو و هەندێکیش لە ڕۆژ، چاو لە نامەحرەم بپارێزن و، دەنگتان نزم بکەنەوە..

لە دوای مردنی پێغەمبەر (ﷺ) و لە ڕۆژگاری هەڵگەڕاوەکاندا، هاتە مەدینە و غەمێکی زۆر گەورە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایگرت و، حەسەن و حوسەینی هەڵگرت و بە کۆڵانەکانی مەدینەدا دەیسوڕاننەوە و گریانێکی بە کوڵ دەگریا، هەموو مەدینە بۆ تازیەباریەکەی خرۆشا و یەك ماڵ نەما لە ماڵەکانی ئەنصار کە هەموو ئەندامەکانی لەگەڵیدا نەگرین.[١]

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# ژنێك تەنها بە قورئان قسە دەکات

تێکۆشەری خواپەرست (عبداللەی کوڕی موبارەك) دەڵێت:

بۆ حەجکردن چووم بۆ ماڵی خودا و سەردانی گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ)، لە کاتێکدا کە لە ڕێگەدا بووم بۆ گەڕانەوە، ڕەشاییەکم بینی لەبەردەممدا، کە لێی نزیك بوومەوە زانیم کە پیرەژنێکە، پێم وت: سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خودات لەسەر بێت .

وتی: ﴿ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴾[1]. واتە: لەگەڵ سڵاودا لە پەروەردگارێکی میهرەبانەوە.

پێم وت: ڕەحمەتی خودات لێ بێ چی دەکەیت لەم شوێنەدا؟

وتی: ﴿ مَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُۥ ﴾.[2] واتە: ئەوەی خوا گومڕای بکا، کەس ناتوانێت ببێتە هۆی هیدایەت دانی.

ئیتر زانیم کە ڕێگەی لێ تێك چووە.

وتم پێی : دەتەوێ بۆ کوێ بچیت؟

ووتـــــی: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ﴾[3] واتە: پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەی کە شەوڕەویی کرد بە بەندەی خۆی، لە مزگەوتی حەرام بۆ مزگەوتی ئەقسا.

بۆم دەرکەوت کە دەیەوێت بۆ (بیت المقدس) بچێت.

---

[1] سورة يس اية ٥٨.

[2] سورة الاعراف اية ١٨٦.

[3] سورة الاسراء اية١.

پێم وت: ئەی لە کوێوە دێیت؟

وتی: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾[١]. واتە: خوای گەورە لەسەر خەڵکی بڕیار داوە حەج و سەردانی کەعبە بکەن، بەتایبەت ئەوانەی کە توانایان هەیە.

تێگەیشتم کە لە حەج گەڕاوەتەوە.

پێم وت: چەند ڕۆژە لێرە دای؟

وتی: ﴿ثَلَـٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا﴾.[٢] واتە: سێ شەوی تەواو.

وتم: هیچ خواردنت پێ نابینم کە بیخۆیت.

وتی: ﴿هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ﴾ [٣] واتە: ئەوە کە خۆراك و خواردنەوەم پێ دەبەخشێ.

پێم وت: ئەی بە چی دەستنوێژ دەگریت؟

وتی: ﴿فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ [٤] واتە: ئاوتان دەست نەدەکەوت، ئەوا تەیەموم بکەن بە خاکێکی پاك.

وتم: من خواردنم پێیە ئەگەر نان ئەخۆیت؟

وتی: ﴿ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ﴾ [٥] واتە: لەوەو دوا ڕۆژوەکەتان ببەنە سەر تا شەو دادێت.

وتم: خودا شکاندنی ڕۆژووی ڕێگە داوە بۆمان لە سەفەردا.

---

[١] سورة ال عمران آية ٩٧

[٢] سورة مريم اية ١٠.

[٣] سورة الشعراء اية ٧٩.

[٤] سورة النساء ٤٣.

[٥] سورة البقرة ١٨٧.

وتـــی: ﴿وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ [١] واتـــه: بێگومـــان ئەگـــەر بەرۆژوو بن چاکترەو پاداشتی زۆرترە ئەگەر بزانن.

پێم وت: ئەی بۆ وەك چۆن مـن قـسەت لەگەڵدا دەکـەم، تـۆش ئاوەها قـسە ناکەیت؟

وتـــی: ﴿مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ [٢]. واتـــه: هـــەر قـــسەیەکی لـــەدەم دەرچێت خێرا چاودێرێکی ئامادە تۆماری دەکات.

وتم: تۆ لە چ هۆزێکیت؟

وتـــی: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَٰئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا﴾ [٣]. واتە: لە شتێك مەدوێ کە زانست و زانیاریت دەربارەی نیە، چونکە بەراستی دەسگاکانی بیـستن و بیـنین و تێگەیـشتن هـەر هـەمووی بەرپرسیارە لەبەرانبەریەوە.

پێم وت: هەڵەم کرد، داوای لێ بوردنت لێ دەکەم.

وتـــی: ﴿قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكُمْ﴾ [٤]. واتـــه: وتـــی ئـــەمڕۆ هیچ سەرزەنشتێکتان لەسەر نیە، خوا لێتان خۆش بێ.

وتم: ئایا دەتەوێت بتخەمە سەر حوشترەکە و بگەیتەوە بە کاروانەکەت؟

وتـــی: ﴿وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ اللَّهُ﴾ [٥]. واتـــه: هـــەر خێـــر و چـــاکەیەك ئەنجام بدەن خوا پێی دەزانێت و ئاگادارە لێی.

---

[١] سورة البقرة آية ١٨٤.
[٢] سورة ق آية ١٨.
[٣] سورة الاسراء آية ٣٦.
[٤] سورة يوسف آية ٩٢.
[٥] سورة البقرة آية ١٩٧.

وتم: منیش ئەم حوشترەمم بۆ دانیشاند..

وتی: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ﴾[١]. واتە: بە ئیماندارانی پیاو بڵێ کە چاویان بپارێزن.

منیش چاوم پاراست لێی و، پێم وت سوار بە، کە ویستی سەرکەوێت، حوشترەکەم ڕای کرد و ڕانەوەستا، جلەکانی دڕا.

وتی: ﴿وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ﴾[٢]. واتە: هەر بەڵاو نەهامەتیەکتان بەسەر دێت، دەرەنجامی کاروکردەوەی خۆتانە.

پێم ووت: ئارام بگرە، تا عاقڵی دەکەم.

وتی: ﴿فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ﴾[٣]. واتە: کێشەکانمان لە سولەیمان گەیاند.

حوشترەکەم هێمن کردەوە و، پێم وت: سوار بە.

وتی: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ (١٣) وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾[٤]. واتە: ستایش و بەرزی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە ئەمەی بۆ ڕەخساندووین، هەرگیز ئێمە نەماندەتوانی ڕامیان بێنین. بێگومان هەر بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە.

عبدالله وتی: جڵەوی حوشترەکەم گرت و، بە خێرایی دەڕۆیشتم و هاوارم دەکرد.

وتی: ﴿وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ﴾[٥]. واتە: لەڕۆیشتندا

---

[١] سورة النور آية ٣٠.
[٢] سورة الشورى آية ٣٠.
[٣] سورة الانبياء آية ٧٩.
[٤] سورة الزخرف آية ١٣.
[٥] سورة لقمان آية ١٩.

مامناوەندیانە بڕۆ، بەرەو ئامانجێکی چاك هەنگاو بنێ، بەدەنگی هێواش و لەبار گفتوگۆ بکەو بدوێ.

ئیتر منیش هێواش هێواش دەڕۆیشتم و، بە دەنگی نزم شیعرم دەگوت.

وتی: ﴿فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ﴾[1]. واتە: چەندتان توانیوەو چۆنتان بۆ لوا قورئان بخوێنن و دەوری بکەنەوە.

پێم وت: تۆ خێرێکی باشت پێ دراوە.

وتی: ﴿وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُوا الْأَلْبَابِ﴾[2]. واتە: بێجگە لە ژیر و هۆشمەندەکان کەسانی تر لەو بەهرەیە تێناگەن و قەدری نازانن.

کاتێك کەمێك بردم..

پێم وت: ئایا مێردت هەیە؟

ووتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ ﴾[3]. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پرسیار مەکەن لە هەندێك شت، کە ئەگەر روون بکرێتەوەو فەرز بکرێت لەسەرتان سەغڵەتتان دەکات.

بێ دەنگ بووم و ئیتر هیچ قسەم نەکرد هەتا گەیاندمەوە بە کاروانەکەی.

پێم وت ئەوە کاروانەکەیە و، تۆ کێت هەیە تێیدا؟

ووتی: ﴿الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾[4]. واتە: ماڵ و سامان و نەوە، زینەت و جوانین بۆ ژیانی دنیا.

زانیم کە چەند منداڵێکی هەیە.

پێم وت: چەند کوڕت هەیە؟

---

[1] سورة المزمل آية ٢٠.

[2] سورة البقرة آية ٢٦٩.

[3] سورة المائدة آية ١٠١.

[4] سورة الكهف آية ٤٦.

وتی: ﴿ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٌ ﴾[١]. واتە: دەڵێن: سیانن.

وتم: ئێوە ئیشتان چی بوو لە حەج دا؟

ووتی: ﴿ وَعَلَٰمَٰتٍ وَبِٱلنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ﴾[٢]. واتە: هەروەها نیشانەی زۆرو زەبەندی لە زەویدا دابینکردوە، بەهۆی ئەستێرەکانەوە خەڵکی ڕێڕەوی خۆیان بدۆزنەوە.

تێگەیشتم کە چاوساغی ڕێبوارەکان و، گەیاندمە گومەز و کۆشکەکان.

وتم: ئەمە گومەزەکانە، کێت هەیە لێرەدا؟

وتی: ﴿وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴾[٣]. واتە: خوا ئیبراهیمی کردۆتە خۆشەویست و ڕێزداری خۆی.

﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴾[٤]. واتە: خوای گەورە خۆی لەگەڵ موسادا گفتوگۆی یەکسەری ئەنجامداوە.

﴿يَٰيَحْيَىٰ خُذِ ٱلْكِتَٰبَ بِقُوَّةٍ﴾[٥]. واتە: ئەی یەحیا، کتێبی (تەورات) بەتوندی بگرەو پابەندی بە.

بانگی کرد: ئەی ئیبراهیم.. موسی.. یەحیا !.

چەند لاوێك وەك مانگ هاتن بۆ لای و، دەستیان ماچ کرد و دوایی ئەوەی کە لە دانیشتن تێر بووم لە لای.

وتی: ﴿فَٱبْعَثُوٓا۟ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا

---

[١] سورة الكهف آية ٢٢.
[٢] سورة النحل آية ١٦.
[٣] سورة النساء آية ١٢٥.
[٤] سورة النساء آية ١٦٤.
[٥] سورة مريم آية ١٢.

﴿فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ﴾[1]. واتە: یەکێکتان بنێرن با ئەم پارە زیوەتان ببات بۆ شار و سەرنج بدات، بزانێ کێ خۆراکی خاوێنی هەیە، با هەندێکتان بۆ بکڕێ و بۆتان بێنێ.

یەکێکیان چوو، خواردنی کڕی و خستیانە بەردەمی من.

وتی: ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ﴾[2]. واتە: بخۆن و بخۆنەوە نۆشتان بێت، بەهۆی دەستپێشکەریتان لە رۆژگاری رابردوودا.

خۆی تیکەیەکی (پارویەکی) خستە دەمیەوە..

وتی: ﴿وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ﴾[3]. واتە: مردن و ئازارەکانی یەخەت پێ دەگرێت، ئەمە بەسەرهات و روداوێکە خۆتت لێ لادەداو پەنات لێدەگرت.

دوایی ئەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزەی وت: کەوتە گیاندان و مرد.

عبداللەی کوڕی موبارەك وتی: پاشان لە خەومدا بینیم، لێم پرسی ئێستا حاڵت چۆنە؟

وتی: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ﴾[4]. واتە: پارێزگاران و خواناسان لەناو باخ و روبار و تاڤگەکاندا ژیانی پڕ بەختیاری و کامەرانیی هەمیشەیی دەبەنە سەر.. لە خزمەت پادشای بەدەسەڵات و، کۆبونەوەی خۆشیان بۆ ساز دەکات، تا تیایدا زیاتر و زۆرتر شادمان و خۆشنوود ببن.

---

[1] سورة الكهف آية ١٩.
[2] سورة الحاقة آية ٢٤.
[3] سورة ق آية ١٨.
[4] سورة القمر آية ٥٤_٥٥.

# سەفانەی کچی حاتەمی طائی

لە گۆشەکراوانی زمان پاراوی و ڕەوانبێژی و، سەخاوەتی و بەخشین بوو، باوکی لە حوشترەکانی خۆی بەشی دەدا و ئەویش دەیبەخشی بە خەڵك، باوکی پێی وت: کچم ئەگەر دوو بەخشندە لەسەر سامانێك کۆ ببنەوە تێیدا دەبەن، یان من دەبەخشم و تۆ دەستت بگرەوە، یان من دەستم دەگرم و تۆ ببەخشە، وتی: سوێند بە خودا من قەت ناتوانم دەستم بگرمەوە و، باوکیشی وتی: منیش دەستم قەت پێ ناگیرێتەوە..

لەبەر ئەوە باوکیماڵەکەی لەگەڵدا دابەش کرد و جیایان کردەوە.

سەفانە لە نێو دیلەکانی طەی دا بوو، هێنرایە لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: ئەی محمد..من کچم سەرداری هۆزەکەم، باوکم دیلی بەردەدا و، هەموو شتێکی دەپاراست و، ڕێزی میوانی دەگرت و دەیحەواندەوە و، برسی تێر دەکرد و، دەرووی لە بێ دەرەتانان دەکردەوە، خواردنی دەبەخشی و سەلامی دەکرد..قەت دەستی نەناوە بە ڕووی داواکاری پێویستیەکەیەوە..من کچی حاتەمی طائیم.. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەی کیژ ئەمە سیفەتی ئیماندارنە، ئەگەر باوکت موسڵمان بوایە بەزەییمان دەبوو بۆی، وازی لێ بێنن و ..پاشان سەفانە خۆی موسڵمان بووەو بە جوانی ئیسلامەتیەکەی بردە سەر[1]..

---

[1] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# حاتەمە

لە خاوەن زمان پاراوی و ڕەوانبێژیەكانە.. كاتێك كە دەست بەسەر كرا بە پێغەمبەری خودای وت: ئەی پێغەمبەری خودا.. باوكم تێدا چوو، مێردیش دیار نەما (ڕۆیشت)، تۆش لەو بەشەی خودا ڕشتویەتی بەسەرتدا بەسەرماندا بڕێژە.

پێی فەرموو: مێردەكەت كێیە؟

ووتی: عودەی كوڕی حاتم.

فەرمووی: ڕا یكردووە لە خودا و پێغەمبەرەكەی..

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووی: باشە، بەڵام پەلە مەكە لە ڕۆیشتن دا هەتا كەسێك لە هۆزەكەی خۆت دەدۆزیتەوە و متمانەی پێدەكەیت تا بتگەیەنێتەوە ولاتەكەت.

پێغەمبەری خودا جل و بەرگی دایە و بەڕێی كرد و خەرجیشی پێدا.

ڕۆیشت تا گەیشتە شام، كە گەیشت عودەی كوڕی حاتەم دەستی كرد بە قسە كردن و وتی: ئەی بێ ڕەحمی ستەمكار، بۆچی ئەوەت بەسەر كەس و كارت و مندالەكانت هێنا و ئەوەی باوكت بەجێ هێشت كە دەبوو بیپارێزیت..

عدی وتی: ئێ كچێ باشە نەبێت مەیلێ.

پاشان چووە لای و لە لای مایەوە.

عدی پێی وت: چی دەبینیت لە کاری ئەم پیاوەدا؟

حازیمە وتی: سوێند بە خوا وا دەبینم کە هەتا زووە خۆتی پێ بگەیەنیت، ئەگەر کابرا پێغەمبەر بێت، ئەوا تا زوو پێی بگەیت فەزڵت زیاترە، ئەگەر پادشاش بێت، ئەوا سوکت ناکات لەسەربەرزێتی یەمەن دا کە تۆ ئەوەیت..

عدی پێی وت: سوێند بە خوا بیرو ڕایەکی جوانە.

گەڕایەوە تا گەیشتەوە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و موسڵمان بوو[١].

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# ئوم مەعبەدی خوزاعیە

خاتوونێکی زمان پاراوی و ڕەوانبێژی بوو..وەسفی پێغەمبەری (ﷺ) کردووە و دەڵێت: پیاوێکی سیما گەشی بینی، روخسار رۆشنی ئاکار پەسەند بوو، تەمەن کاری تێ نەکرد بوو، هەنگاوەکانی سست نەبوو، لێو بەخەندەو، گلێنەی چاوی ڕەش و گەورە بوو، برژۆڵەکانی زۆر پڕ بوون، لە دەنگیدا زبریەك هەبوو، ملی زۆر بەرز بوو، ڕیشی پڕ بوو، چاوەکانی سپێنەکەی زۆر سپی و گلێنەکەی زۆر ڕەش بوو، بڕۆکانی درێژ بوون و، تێکەڵاو بوو بوون (سەرنجی هەموو لایەکی لە یەك کاتدا دەدا).. ئەگەر بێ دەنگ بوایە ویقار و ڕێزێکی زۆری هەبوو، کە قسەی دەکرد بەرز دەبویەوە و سیما جوانتر دەبوو ژیری دەردەکەوت، جوانترین کەسیش بوو لە نزیکەوە، زمانی شیرین بوو، روونی دەکردەوە بە بێ پەلە کردن و کەم تەرخەمی، سەرچاوە و قسە کردنی وەك دێڕەکانی هۆنراوە بوو، لەبەر درێژی مافی خۆی پێ دەدا و ناشیرین نەدەبوون، بە چاوی کەم سەیری نەدەکرا لەبەر کەمی، لقێك بوو لە نێوان دوو لقدا و، خۆی لە هەموویان دیمەنەکەی جوانتر بوو و، بە توانا تر بوو، چەند هاوەڵێکی هەبوو لە دەوری بوون، ئەگەر قسەی کرد بێ دەنگ دەبن بۆ ووتەکانی و، ئەگەر فەرمانیش بکات هەڵدەستن بەجێبەجێ کردنی فەرمانەکەی و، خزمەت دەکرا و خۆی بە گەورە نەدەزانی بە سەریان دا و، مۆن و گرژ و دەستەوسان نەبوو[١].

---

[١] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# قەیلەی کچی مەخرەمیە

لە ئافرەتە زمان پاراو و ڕەوانبێژو قسە ڕوونەکان بوو.. هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ ژنان دا چووە مزگەوتەکەی، دەڵێت: کاتێك نوێژمان کرد چاوم بەرز دەکردەوە و سەرم هەڵدەبڕی هەتا پێغەمبەر ببینم (ﷺ)کابرایەك لێی نزیك بوویەوە و وتی: سەلامت لەسەر بێ ئەی پێغەمبەری خودا، کە دانیشتبوو هەردوو ڕانی نوساند بوو بە سنگیەوە.. فەرمووی: سەلام و ڕەحمەتی خودا لەسەر تۆش، کە پێغەمبەری خودام (ﷺ) بینی ترس و گوێڕایەڵی لە مەجلیسەکەیدا بوو، موچڕکە بەلەشمدا دەهات، کابرای کە لە لای دانیشتبوو پێی وت: ئەی پێغەمبەری خودا ئەو بەستەزمانە موچڕکە گرتی (دەلەرزێ)، بە دەستی وتی: ئەی بەستەزمان ئارامی و هێمنیت لەسەر بێ..ئیتر ئەو ترسەی کە هەم بوو نەما و..پاشان هاوڕێکەم چووە پێشەوە و بەیعەتی پێدا لەسەر ئیسلام و هۆزەکەی‌و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، بۆمان بنوسە کە با (دەهناء) کەسی لە تمیم پێدا نەڕوات تەنها بە ڕێبواری یان دراوسێیەتی نەبێت (واتە شتی لێ نەوەرێنن).. فەرمووی: ئەی غولام (دەهناء)ی بۆ بنووسە..

قەیلە وتی: کە ئەوەم بینی سەرنجی ڕاکێشام چونکە شوێن و نیشتمانی خۆم بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوە یەکسانی نەگرتۆتە بەر لەو

کارەیدا، ئەو (دەهناء)ە، شوێنی بەستنەوەی حوشتر و لەوەڕاندنی مەڕەکانە و، ئافرەتانی تەمیم و منداڵەکانی لە پشتی ئەمەوەن..

فەرمووی: ڕاستت کرد و، غولام ڕاوەستە، موسڵمان برای موسڵمانە و ئاو و داریان بۆ یەکتر فراوانە و، پاشان پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمانی کرد کە بنوسن بۆمن لەسەر پارچەیەك لە پێستی سور بۆ قەیلەو ئافرەتانی قەیلە هیچ ستەم لە مافیاندا نەکرێت و زۆریان لێ نەکرێت لە شوو کردن دا و، هەموو ئیماندارێکی موسڵمان بۆیان پشتیوانە و، ئەمانیش باش بن و چاکە بکەن[1].

---

[1] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# خێزانی یەزیدی کوڕی سینان

شاعیرێکە لە شاعیرەکانی عەرەب.

عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان تیپێکی نارد بۆ یەمەن کە چەند ساڵێك لەوێ بوون..شەوێکیان کە لە دیمەشق بوو، ویستی گوێ لە خەڵك بگرێت دەربارەی ئەوانەی کە پیاوەکانی نارد بوون بۆ یەمەن..

لە کاتێکدا کە لە هەندێ لە کۆڵانەکاندا دەسوڕایەوە ژنێکی بینی نوێژی دەکرد، کە گەڕایەوە ناو جێگەکەی ژنەکە وتی: ئەی خودایە کە پەردەکانت ئەستورە (عەیبی خەڵك دادەپۆشی)، ئەی نێردەری کتێبەکان و ئەی بەخشەری ویستەکان و ئەی دابینکاری غەریبان (بێ کەسان) داوات لێ دەکەم کە دادوەری لە نێوان من و عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان دا بکە، پاشان دەستیکرد بە شیعر وتن و وتی:

﴿شەو درێژەی کێشا و چاوم فرمێسك ئەڕێژێ
غەمەکانم خەویان زڕاندووم و دڵم ئێشی دێ
﴿شەوانە ئازار ئەچێژم  چاودێری ئەستێرەکان دەکەم
دڵێشم  لەم تاریکیەدا تەنگەو بە خێرایی لێ دەدات

﴿کاتێ بیر لەوەی لە نێوانماندا بوو دەکەمەوە
دڵم بۆ ئـــــارەزووەکـــــان لـــــەت لەت دەبێ
﴿هەموو خۆشەویستێك کە یادی خۆشەویستەکەی دەکاتەوە
خوازیـــارە گشـت ڕۆژێـك بە دیـــــداری شاد بێ
ئەی خاوەن عەرش دەرووم لێ بکەرەوە لەم گەنجیەمدا
تەنها تۆ چاودێری کارەکانم دەکەیت و گوێ بیستم دەبی

عەبدولەلیك بە پاسەوانەکەی گوت: ئەم ماڵە هی کێیە و ئەو ژنە کێیە کە تێدایە؟

وتی: ئەوە ماڵی یەزیدی کوڕی سینانە و، ئەو ئافرەتەش ژنەکەیەتی.

کە ڕۆژ بوویەوە پرسیاری کرد کە ژن چەند ئارام دەگرێت لەسەر سەفەر کردنی مێردەکەی؟

وتیان: شەش مانگ..

عەبداولەلیك فەرمانی کرد کە هیچ سەربازێك لە شەش مانگ زیاتر نەمێنێتەوە.[1]

---

[1] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# ئوم هەیسەمی منقرییە

لە خاتوونە ڕەوانبێژ و زمان پاراوەکانە.. کاتێك (ئەحنەفی کوڕی قیس) لە کوفە کۆچی دوایی کرد.. وتی: خودا بتپارێزێ کاتێك لەنێو گێژاوەکاندا سەرت لێ دەشێوێت و، لەناو کفن دادەنرێیت، داوا لە خودا دەکەین کە بەدابڕان لە رووی تۆ تووشی کارەساتی کردین و، بە جیاکردنەوە و بردنەوەی تۆ تاقی کردینەوە، داوا لەخوا دەکەین کە ڕێگەی چاکە بکاتە ڕێگەت و، چاکترین ڕێنمایی کار ڕێنماییت بکات، گۆڕەکەت بۆ فراوان بکاتەوە و لە ڕۆژی حەشر کردنتدا لێت خۆش بێت، سوێند بەخوا لە ناو کۆڕ و کۆمەڵدا شەرەف مەند بوویت و، زۆر بە سۆزبووی بەرانبەر بێوەژنان و، لە گەڕەك دا ڕێزدار و سەردار بوویت و، بۆ لای خەلیفەیش دەم سپی و نێردراو بوویت و، ئەوانیش بۆ قسەکانت گوێ بیست بوون و شوێنی ڕایەکانت دەکەوتن.

عومەری کوڕی خالیدی عوسمانی گێڕایەوە، وتی: ئومم هەیثەم نەخۆش کەوت، من و ئەبو عبیدە چووین بۆ سەردانی.

وتمان: ئەی ئومم هەیثەم ئێستا چۆنیت؟

وتی: پێشتر بێزوم دەکرد بە (دوکە)وە. بانگ کرام بۆ خوانێك، پارچەیەکم خوارد لە مەنجەڵێکی گەورەوە، لەرزینێکم بەسەردا هات.

وتمان ئومم هەیثەم ئەوە چی دەڵێیت؟

وتی: ئایا خەڵك دوو قسە کردنی هەیە، سوێند بە خودا تەنها بە عەرەبی پاراو قسەم لەگەڵ کردوون[1].

---

[1] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# صەدوفی کچی حولەیس عوزریە

لە گۆشـکراوانی زمانپـاراوی و ڕەوانبێـژی بـوو، سـەجعی بـەکاردەهێنا لـە کۆتـایی قـسەکانیدا.. زۆر کـەس داخوازیـان دەکـرد، بـەڵام ڕەدی دەکردنـەوە و، دەیووت: شوو ناکەم تەنها بەو کەسە نەبێت کە پرسیارەکانم وەڵام بداتەوە..

کاتێك کۆتایی خوازبێنیەکان هاتـە سـەر (حُمـران)، حـومران هـەر بـە پێـوە ڕاوەسـتا و دانەنیـشت کـە پێـشتر هەرچـداخوازیکارێك دەهـات پـێش مۆڵـەت لێ وەرگرتن دائەنیشتن.

صەدوف وتی: لەبەرچی دانانیشیت؟ ، وتی: هەتا مۆڵەتم پێ بـدرێت، ئـەمجا صـدوف وتـی: جـا تـۆ ئـەمیرت لەسـەرە تـا مۆڵـەتت بـدات؟ وتـی: خـاوەن مـاڵ ڕەواترە بە حەوشەی خۆی و، خاوەن ئاو ڕەواترە بە پێدانی ئاوەکە و، هەموو ئەوەی کە لە قاپەکەدایە هی خۆیەتی.

صەدوف وتی: دانیشە.. دانیشت، پێی وت: چیت دەویست؟ وتی: پێویستیەك کە بۆ پێویستیش نەهاتووم..صەدوف وتی: پەنهانی دەیهێڵێتـەوە یـان ئاشکرای دەکەیت؟

وتی: بە نهێنی و بە ئاشکرا ، صـەدوف وتـی: پێویـستیەکەت چـی یـە؟ وتـی: جێبەجێ کردنی ئاسانە و کارەکەی ڕوون و ئاشکرایە و خۆت پێی شـارەزاتری، صەدوف وتی: دە پێم بڵێ: وتـی: مـن دەرم بـڕی ئەگـەر بتـەوێت خـۆت ڕوونـی دەکەیتەوە..

صەدوف وتی: تۆ کێی؟ وتی : من مرۆڤێکم بە بچووکی لە دایك بـووم و بـە گەورەیی گەشەم کردووە و دنیام زۆر بینیوە..

صەدوف وتی: ناوت چی یە؟ وتی: هەر کەس بیەوێت ناوێك بۆ خۆی پەیدا دەکات و ستەم و ناڕەوا دەڵێت و ناوەکەی هەر بە هەمیشەیی پێوەی نامێنێتەوە، صەدوف وتی: باوکت کێیە؟ وتی: باوکم ئەو کەسەیە کە منی لێ بووە و باپیریشم ئەوی بووە و دوای منیش نەژیاوە. صەدوف وتی: ئەی ماڵ و سامانت چی یە؟ وتی: هەندێکم بە میرات بۆ ماوەتەوە و زۆربەیشی خۆم پەیدام کردووە.

صەدوف وتی: ئەی تۆ کێیت؟ وتی: لەو مرۆڤە زۆرەی کە ئەو هەموو وەچە ناسراوەی هەیە و کە کەمیان ناودار و دەرکەوتوو دەبن مەرگ دەیبڕێنێتەوە.

صەدوف وتی: باوکت چی بۆ بەجێ هێشتوویت؟ وتی: هیمەت بەرزی.

صەدوف وتی: لە کوێ دادەنیشیت؟ وتی: لەسەر بەڕەیەکی فراوان و لە شارێکی تەسکی دووردا، نزیکەکانی دوورە و دوورەکانی نزیکە.

صەدوف وتی: ئەی هۆزەکەت کێیە؟ وتی: ئەوانەی کە دەچمەوە سەریان و، تێیاندا بووم و لەناویان لە دایك بووم، صەدوف وتی: ئایا ژنت هەیە؟ وتی: ئەگەر بم بوایە کەسێکی دیم داوا نەدەکرد و خێرەکەیم بە فیڕۆ نەدەدا.

صەدوف وتی: دەڵێی هیچ داواکاریەکت نی یە؟

وتی: ئەگەر هیچ داواکاریەکم نەبوایە پاڵم نە ئەدا بە دەرگاکەتەوە و، خۆم نەدەخستە بەر وەڵام دانەوەی پرسیارەکانت و هۆکارەکانتم بۆ شی نەدەکردیتەوە..

صەدوف وتی: تۆ (حومرانی کوڕی ئەقرەعی حەمدی)یت.

ووتی: وا دەوترێت..

ئیتر شووی پێ کرد[1].

---

[1] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# زەرقائی کچی عودەی کوفی

لە خاتوونە زمانپاراو و ڕەوانبێژ و وتە ڕوون و، هۆشمەند و خاوەن ڕا و بۆچوونەکانە..لە ڕۆژی (صفین)دا لەگەڵ ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیبدا (ﷺ) ئامادە بوو، کاتێك کار بۆ معاویە یەکلا بوویەوە ناردی بە شوێنیدا تا بچێت بۆ لای، کاتێك کە چووە لای، معاویە پێی وت: ئایا دەزانیت بۆچی ناردوومە بە شوێنتدا؟

وتی: پاك و بێ گەردی بۆ خودا، چۆن شتێك نەزانم و پێم نەوترابێت دەیزانم، ئایا کەس شتی ناو هەموو دڵەکان دەزانێت جگە لە خودا..

معاویە وتی: تۆ نەبوویت، سواری حوشترێکی سوور بوو بوویت لە ڕۆژی (صفین)دا و تۆ لە نێوان هەردوو ڕیزەکەدا ئاگری شەڕت خۆش دەکرد و هانت دەدان لە سەری؟ وتی: بەڵێ من بووم.

معاویە وتی: چی وای لێ کردی ئەمە بکەیت؟

وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، سەرەکە کوژرا و (مرد)، تاوان بڕایەوە، ئەوەی کە ڕۆیی نەماوە، زەمانە ئێستا یەکێکی ترە و، هەر کەس بیری کردەوە و تێڕاما بەرچاوی خۆی دەبینێ و ڕووداو بە دوایدا ڕووداوی تر دێنێت.

معاویە وتی: ڕاستت کرد، ئایا قسەکانی خۆتت لەبەرە؟

وتی: سوێند بە خوا لەبەرم نیە.

معاویە وتی: گوێم لێ بوو دەتووت:

(ئەی خەڵکینە، ئێوە ئێستا لە ناو ئاژاوەیەکدان کە ڕووپۆش و پۆشاکی ستەم دای پۆشیوون و، لە ناوەڕاستی ڕێگە لای داون، ئای کە ئاژاوەیەکی کوێرانەیە، کەڕو لاڵە، گوێ بۆ سەرپێچیکردن ڕاناگرێت و، مل بۆ سەرکردەکەی کەچ ناکات: چرا لە کاتی خۆرهەڵهاتندا داناگیرسێت و، ئەستێرەکان لەگەڵ مانگدا درەوشاوەییان دەرناکەوێت و، هیچ شتێك ئاسن نابڕێت تەنها ئاسن نەبێت، هەر کەس داوای ڕێ نیشاندانمان لێ دەکات ڕێی نیشان دەدەین و، هەر کەس پرسیارمان لێ دەکات هەواڵی پێ دەدەین..

ئەی خەڵکینە..حەق داوای ئەوەی دەکرد کە لە دەستی چوو بوو ئەوا دۆزیەوە، ئارام بگرن ئەی کۆمەڵی کۆچ کار و ئەنصارەکان لەسەر ناخۆشیەکان، وا دەڵێی برینەکانی ئەو کۆمەڵە پارچە پارچانە سارێژ دەبنەوە، وشەی دادپەروەری یەك دەگرێتەوە، حەق نارەوای پوچەڵ کردەوە و سڕیەوە، با ئیتر کەس خۆی گێل نەکات و نەڵێت: دادپەروەرکاری چۆنە و لە کوێیە، خودا ئەو کارەی کە دەیەوێت دەیکات و، ئای کە ڕازانەوەی ژنان خەنە و، ڕازانەوەی پیاوانیش خوێنە، بۆ ئەمڕۆ و نەوەی دوا تریش.

پاشان معاویە بە زەرقائی وت: سوێند بە خوا زەرقاء تۆ لە هەموو خوێن ڕشتێکدا بەشداریت لەگەڵ عەلی دا کرد. زرقاو وتی: خودا مژدەکەت بە باش بگێڕێت و، بەردەوام سەلامەتت کات و، وێنەی مژدەی خۆشی دا و دانیشتوانەکەت (ئەو کەسەی کە لە لاتە) شادومانت کرد.

معاویە وتی: ئایا ئەوە شادمانت دەکات؟ وتی: بەڵێ سوێند بە خوا زۆر بە هەواڵەکەت شادم و ئەو کارە بە ڕاست و چاك دا دەنێم..

معاویە وتی: سوێند بە خودا ئەمەکداریتان بۆی لە دوایی مردنی (بۆ عەلی) زۆر سەرسوڕهێنەرترە لە لام لە خۆشەویستیتان بۆی کە لە ژیان دا بوو.

داواکاریەکت هەیە داوای بکە .

وتی: ئەی ئەمیری ئیماندااران، دام ناوە لەسەر خۆم کە قەت لە سەرکردەیەك داوا نەکەم کە توشم هاتبێت (دژایەتیم کردبێت)، دەی تۆش ببەخشە بەبێ داوا کردن و، سەخاوەتی بکە بە بێ خواستن. وتی: ڕاست دەکەیت، فەرمانی کرد کە جل و بەرگ و دیاری بە خۆی و ئەوانەی کە لەگەڵیدایە بدرێت[1]..

١ (العقد الفريد) ؛ ی ابن عبد ربه (دەگەڵ کورت کردنەوەدا).

# ئوموله‌بنین کچی عبدالعزیزی کوڕی مەروان

لـە خاتوونـە خـاوەن ڕەوانبێـژی و زمـان پـاراوی‌و بـەهێزی بەڵگـە و جوانی ڕوون کردنـەوەكان بوو، قسەكانی حەجاجی لاڵ كرد كاتێـك كـە حـەجاج چووە لای وەلیدی كوڕی عەبدولمەلیك ، لە كاتێكدا كە وەلید لە ماڵەكەی خۆیـدا بـوو، مۆڵـەتی دا بـە (غلالـە) كـە بێتـە ژوورەوە، هـەروەك چۆن مۆڵـەتی حـەجاجی دا..لە كاتێكدا كە دانیشتبوون، غلالە هەستا و چپەیەكی بۆ وەلیـد كـرد، پاشـان ڕۆیــشت و ئینجـا گەڕایــەوە و دیــسان چــپەیەكی تــری بــۆ كــرد و ئینجـا ڕۆیشت..وەلید بە حەجاجی وت: ئایا دەزانیـت چی وت؟ وتـی: نـەخێر، ولیـد وتـی: ئەوە ئومم بەنینی ئـامۆزام ناردویەتیـە لام دەڵێـت: بۆدانیـشتویت لەگـەڵ ئەو دەشتیەكیە عەرەبەی كە چەكی بـە خۆیـەوە كـردووە ، منـیش وەڵامـم بـۆ ناردەوە كە حەجاجە، ئەمەش دڵەڕاوكێی بـۆ دروسـت كـرد، وتوویـەتی: سـوێند بە خوا حەز ناكەم بە تەنها لەگەڵتدا دابنیشێت كە چەندەها كەسـی كوشـتووە. حەجاج وتی: ئـەی ئـەمیری ئیمانـداران، واز لـە قـسەی خۆشـی ژنـان بهێنـە كـە دەیرازێننـەوە، ئـافرەت وەك ڕێحانـە وایـە و خـۆ (قەهرەمانـە) نـی یـە نهـێنی خـۆتی پـێ بڵێـی، تــەماحیان مەخــەرە بــەردەم تــەنها لــە خۆیانــدا نــەبێت و، سەرقاڵیان مەكە زیاتر بە خۆڕازاندنەوەی خۆیان نەبێت، ئاگـادار بـە لـە ڕاوێـژ

پێ کردنیان چونکە بۆچوونەکانیان زۆر هونەریانەیە (فێڵبازانە) و عەزم و خۆڕاگرتنیشیان لە لاوازی دایە.

پاشان وەلید چووە لای ئوومم لبەنین و وتەکانی حەجاجی بۆ گێڕایەوە..وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، حەز دەکەم سبەینێ فەرمانی پێبکەی کە بێتە ئێرە، وەلیدیش ئەو فەرمانەی پێ کرد و، حەجاجیش چوو بۆ لای ئوم لبەنین و ماوەیەکی زۆر ڕای گرت پاشان مۆڵەتی دا بچێتە ژوورەوە، بە پێوە ڕای گرت و مۆڵەتی نەدا دابنیشێت، پاشان وتی: ئەی حەجاج ...سوێند بە خودا ئەگەر خوا نەیکردتیایە بە سوکترین دروست کراوی خۆی تاقی نەدەکردیتەوە بە بەردباران (لێدانی) کەعبە و کوشتنی کوڕی خاوەن هەردوو پشتێن کە یەکەم لە دایك بووی ئیسلام بوو لە دوای کۆچ کردن..

خودا ئەو شاعیرە بکوژێ، کە تەماشات دەکات و سینانی کوڕی غزالەی مەروریەش لە نێوان شانت دابوو دەیووت:

﴿شێرە لەسەرمن و، لە شەریشدا نەعامەیە

فیك شکاوێکیت لە فیکەی فیکەچی یەك دەتۆقیت

﴿ئەی بۆ نەچویتە بەرانبەر غزالە لە شەڕدا

بەڵکو دڵت لەسەر باڵی باڵندە فڕی بوون

غزالە دڵی بەرز بوویەوە بە ئازایەتیەکانی و

دیمەنەکانی وەك دوێنیی ڕۆیشتوو بەجێ هێشت

پاشان پێی وت: بڕۆ دەرەوە لە لای من.. یەکسەر چوو بۆ لای وەلید و، وەلید پێی وت: لە چیدا بووی، وتی: سوێند بە خوا ئەی ئەمیری ئیمانداران بێ دەنگ نەبوو تا ناو سکی زەویم پێ خۆشتر بوو لەسەری (حەزم دەکرد زەوی قووتم بدات).

لە قسەکانی ئومم لبەنین: ئۆف لە ڕژدی ئەگەر کراس بوایە قەت لەبەرم نەدەکرد و ئەگەر ڕێگە بوایە قەت پێیدا نەدەڕۆیشتم.

ئومم لبەنین دەیناردە لای ژنەکان و لە لای کۆ دەبوونەوە و دەیووت: حەزم لە قسەکانتانە، بەڵام ئەگەر هەستام بۆ نوێژ کردن ئەوا ئێوەم لە بیر دەچێتەوە و لە یادتان دەکەم..

جل و بەرگی جوانی پێ دەدان و پارەیشی پێ دەدان، دەیووت: هەموو کەسێك ئاوات و ویستی خۆی خستۆتە شتێکەوە منیش خۆشی و ئاواتم لە هەوڵ و بەخشین دایە..

سوێند بە خودا پەیوەندی و سەردانی کردن لە لام زۆر خۆشترە لە خواردنی خۆش لە کاتی برسێتیدا و، لە ئاوی سارد لە کاتی تینوێتیدا.[1]

---

[1] (نساء فاضلات) عبدالبديع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# ئومموڵخەیری کچی حەریش

لە گۆشکراوانی زمان پاراوی و ڕەوانبێژییە، هاتە لای معاویەی کوڕی ئەبو سفیان، دوایی ئەوەی کە معاویە نامەی بۆ والیەکەی لەسەر کوفە نارد کە ئومم لخەریری کچی حەریشی بۆ بنێرێ و بزانە کە من مۆڵەتی دەدەم دەربارەی تۆ چاکە بە چاکەکانت بڵێ و خراپەکانیش بە خراپە بڵێت..

کە نامەکە گەیشت بە والی، سواری ئەسپ بوو، ڕۆیشت بۆ لای و بۆی خوێندەوە، ئومم لخەیر وتی: بەڵام من لە گوێڕایەڵی خوادا گەرد گیراو نیم و تووشی دەردی درۆ نەبووم، حەزم دەکرد بگەم بە دیداری خەلیفە لەبەر چەند شتێك کە لە دڵمدا پەنگی خواردۆتەوە، کە وەك هەناسەیەك لەناو مەنجەڵی پەستراودا دەیکولێنێت، کە لە ژێریدا پەلکە وشکەکانی ڕەگە وشکەکانی خورما بسووتێنرێت لە هاویندا، کاتێك کە هەڵی گرت و ویستی ئیتر لێی جیا بێتەوە والی وتی: ئەی ئومم لخەیر ئەمیری ئیمانداران وای بۆ داناوم کە تۆ دانی خێرم پێدا بنێیت ئەویش بە خێر و چاکە و، ئەگەر تۆش بە خراپە باسم بکەیت بە خراپە لەگەڵمدا بکات..من چۆنم لە لای تۆ؟ وتی: ئەی کابرا وا تەماح نەکەیت کە باش بوونت لەگەڵ مندا وام لێ دەکات کە ناحەق بڵێم و زاڵی بکەم، ناسیاریت بۆ من دڵنیات نەکاتەوە کە جگە لە حەق و ڕەوا هیچی تر بڵێم..باشترین ڕۆیشتن ڕۆیشتن.

کاتێك کە چووە لای معاویە وتی : (سەلامی خودات لەسەر بێ ئەی ئەمیری ئیماندارا‌ن کە دەستە و تاقمەکەی لە لای دانیشتبوون _معاویە_ وتی: سەلامیش لەسەر تۆ، سوێند بە خوا بە بێ ویستی خۆت بە ئەمیری ئیمانداران بانگت کردم، وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەوە چی یە، بینینی دەستەڵاتدار ئەوەی کە دەیزانی لای دەبات، معاویە وتی: ڕاست دەکەی، چۆن بوو هاتنەکەت؟ وتی: هەر لە لەش ساغی و سەلامەتیدا بووم هەتا سوارەکان (کاروانچیەکان) گەیاندمیانە ئێرە و، من لە ژیان و مولکی خودایەکی بە دەستەڵات. معاویە وتی: نیەتم باشە سوێند بە خوا وا بزانم ماندوومان کردیت و (هەڵمان بژاردی)و بووین بە ئەرك بۆتان، وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، پەنا بە خودا دەگرم بۆت لە قسەی خراپ و ڕەق و ئەوەی کەسەرئەنجامی دەبێت. معاویە وتی: بۆ ئەمە نەمانویستی..

وتی: من لە گۆڕەپانەکەتدا دەڕۆم ئەگەر شتێکت دەوێت لەسەری دەڕۆم..پاشان وتی: ئەوەی کە دەتەوێت بیلێی بلێ.. معاویە وتی: پێم بلێ قسەکانت چۆن بوون ئەو ڕۆژەی کە عەماری کوڕی یاسر کوژرا، وتی: پێشتر نەمگێرابوویەوە و، دواتریش لێکۆڵینەوە و دیراسەم نەکردووە، چەند ووشەیەك بوو زمانم لە کاتی کتوپڕی دا دەری بڕین..معاویە ئاوڕی دایەوە بۆ لای هاوەڵەکانی و وتی: کامتان قسەکانیتان لەبەرە؟ یەکێکیان وتی[1]: (﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ﴾ : واتە: ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسن و خۆتان لە خەشمی بپارێزن، چونکە بەڕاستی زەوی لەرزەی قیامەت کارەساتێکی زۆر گەورەیەو شتێکی سامناکە). خودا حەق دەرخست و ناحەقیشی ڕوون کردەوە و، ڕێگای ڕۆشن کردەوە و ئاڵا و بەیداخی

---

[1] سورة الحج آية ١.

بەرز کردەوە، ئیتر نەیهێشتەوە لە کوێرانە و لێ تێکەڵاو بوون دا و، نە بێ سەر و بەریەك کە ڕابکێشرێ و قوت بدرێ، ئیتر ئەتانەوێ بۆ کوێ بچن، ئایا لە ئەمیری ئیمانداران ڕا دەکەن و؟ لەو هێزەی سوپاکە هاتووە؟ یان لە ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە؟ یان لە حەق پاشگەز دەبنەوە؟ ئایا ئەم ئایەتەی دەفەرمووێت (وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَا أَخْبَارَكُمْ: ئێمە دەتانخەینە بەر تاقیکردنەوە، تا تێکۆشەر و خۆڕاگرتنتان دەرکەوێت و ئاشکرا ببێت و، هەواڵی چالاکی ئێوەمان بێتە دەست)[1]. پاشان سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و وتی: خودایە ئارام گرتن کەم بۆتەوە و، یەقین لاواز بووە و، ویست و ئارەزووەکان بلاوەیان کردووە خودایە کێشەکانی دڵ بە دەستی تۆیە، دڵەکان لەسەر ووشەی تەقوا کۆ بکەرەوە و، دڵەکان لەسەر ڕێنمایی و هودا یەك پێ بگرەوە و حەق بگەڕێنەرەوە بۆ خاوەنەکانی.

پاشان وتی: سوێند بە خوا ئەوەی کە لە حەق لای داوە، کەوتۆتە ناو ناڕەواوە و هەر کەس ئارامگای بەهەشت نەبێت ئارامگای ئاگرە، ئەی خەڵکینە عاقڵ و هۆشمەندەکان تەمەنی دنیایان کورت کردۆتەوە و ڕەدیان کردۆتەوە، ماوەی ڕۆژی دواییان بە دوور و درێژ گرتووە و هەوڵ و کۆششیان لە پێناودا داوە، بەماڵێك کڕیویانە کە نیعمەتەکانی بەردەوام نابن و، خەفەتەکانیشی نابڕێتەوە..

ئەی خەڵکینە.. ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت حەق بە ناحەق بەتاڵ بکرێتەوە و، سنورەکان لە کار بکەون و، ستەمکاران دەربکەون و، وشەی شەیتان بەهێز بێت، ئەوا ئێمەش مردنمان هەڵئەدەبژارد بەسەر نەرمی ژیان و خۆشیەکانیدا..

---

[1] سورة محمد آية ٣١.

معاویە وتی: سوێند بە خودا بەم قسانەت هیچ ویستێکت نەبوو تەنها کوشتنی من نەبێت، خۆ ئەگەر من تۆ بکوژم هیچ نەنگیەکی بۆ من تێدا نیە..

ئوم لخەیر وتی: سوێند بە خودا زۆر شادمانم بەوەی کە خودا لەسەر دەستی یەکێکدا بمکوژێت کە حەز دەکەم خودا بەدبەختی بکات.

پاشان داوای لە معاویە کرد کە بە لەسەرخۆیی خۆی ڕێگەی بدات و لە زۆر پرسیار کردن وازی لێ بهێنێت، معاویە وتی: بەڵێ لەبەرچاو ئارامیت (لەبەر نەرمی)، وازم لێ هێنایت..

پاشان فەرمانی کرد کە دیاری و خوف (نەعل لە پێستە دروست کراو بێت) پێ بدرێت و بەڕێزەوە بەڕێی کردەوە[1]..

---

[1] (أخبار الوافدات من النساء علی معاویة) عەبباسی کوڕی بەکاری صەبی، پێداچوونەوەی سکینەی شەهابی، (بە کورت کردنەوە و دەستکاریەوە).

# ڕەبابی کچی عەلقەمەی کوڕی حەفسەی طائی

لە ئافرەتە زمان پاراو و ڕەوانبێژەکان بوو..حارثي کوڕی سەلیلی ئەسەدی هاتە لای باوکی بۆ داخوازی کردنی، لە کاتێکدا کە پیر بوو، سەرداری هۆزەکەی خۆشیی بوو..

دایکی پێی وت: ئەی کیژم..چ جۆرە پیاوێك بەلاتەوە باشە، پیرێکی مەزنی ڕێزداری دەمڕاست، یان لاوێکی جوانکیلە و سپی و شاناز کەر و لووت بەرز.

ڕەباب وتی: شانازی چی و لوت بەرزی چی..

دایکی وتی: کوڕ دڵت لێ پیس دەکات و غیرەت لێ دەکات، بەڵام پیر خۆی ڕێك دەخات لەگەڵت و شتتان بۆ پەیدا دەکات، پیری ڕێزداری خاوەن شەرەفی زۆر وەك گەنجی کەم تەمەن و منەت کەر نی یە.

وتی: دایکە.. کیژۆڵە حەزی لە گەنجە وەك چۆن شوانەکان حەز لە لەوەڕگایەك دەکەن گیای زۆر و جوانی لێ بێ..

دایکی وتی: کچم.. کوڕ ئەرکی قورسە و بۆڵە و لۆمەی زۆرە، بەڵام پیر نەرم و نیانە و کەم دەقیژێنێ.

وتی: دایکە ئەترسم پیرەکە جلەکانم پیس بکاتو گەنجیەکەم بەبابداتو قسەی هاوشانەکانم بێنێتە سەر.

دایکی بەردەوام لەگەڵی وت هەتا زاڵ بوو بەسەر بۆچوونەکەیدا و..دای بە حارث، ڕۆژێکیان دانیشتبوون و ڕەبابیش لە تەنیشتیدا بوو، چەند گەنجێك هاتن زۆرانبازیان دەکرد، هەناسەیەکی هەڵکێشا و، پاشان فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە، حارث پێی وت: سنگت بۆ بکوتم ئەوە چی دەتگرێنێ؟

وتی: من چیم بوو لەو پیرانەی کە وەك بەچکە باڵندە بەرز دەبنەوە و تەمەنیان ڕۆیشتووە..

وتی: دایکت سنگت بۆ بکوتێ، ژنی ئازاد برسیش بێت ولە مەمکەکانی ناخوات، ئەمەش بوو بە پەند لێیانەوە[1]..

---

[1] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# بەکارەی هیلالیە

شاعیرێکە لە شاعیرەکانی عەرەب و، زمان پاراو و خاوەن ڕوون و ئاشکرا بوو..خوشکی دایکی مەیمونەی خێزانی پێغەمبەرە (ﷺ) ..

چووە لای معاویە لە کاتێکدا کە پیر بوو، چاوەکانیشی کز بوو بوون، لە نێوان دوو خزمەتکاردا دەلەرزی، سەلامی کرد و پاشان دانیشت، معاویە وتی: پورێ چۆنی، وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران باشم..معاویە وتی: زەمانە گۆڕیووتی، وتی: بەڵێ وایە، ئەو خاوەن گۆڕانکاریە، هەر کەس ژیا پیر دەبێت و، هەر کەس مردیش لە گۆڕ دەنرێت.

لە کاتێکدا معاویە دەستە و تاقمەکەی لە لای دانیشتبوون، هەندێ لەو شیعرانەی کە لە ڕۆژی صفین دا وتبووی هێنایانەوە یادی معاویە و..پاشان بێ دەنگ بوون..

بەکارە وتی: .. ئەی معاویە قسەکانت چاوەکانیان کز کردم و، بەڵگەکەمی کەم کردەوە سوێند بە خوا ئەوانەی دەیڵێن من وتومە و، لەوە زیاتر شاراوەم نی یە و، ئەوانەش بە درۆ خستنەوە لەسەر خۆم لانابەم، معاویە پێ کەنی و وتی:

(ئەو شتانەت وامان لێ ناکات کە چاک نەبین لەگەڵتدا، چیت دەوێ داوای بکە..وتی: ئێستا من هیچ داواکاریەکم نی یە[1].

---

[1] (العقد الفرید) : ی ابن عبد ربە (دەگەڵ کورت کردنەوەدا).

# سەودەی کچی عەمارەی کوڕی ئەشتەر

خاوەن ڕەوانبێژی و زمان پاراوییە و، شاعیرێکە لە شاعیرەکانی عەرەب. هاتە لای معاویە، معاویە پێی وت: ئەوە تۆی کە بە براکەت دەڵێی:

"خێرا کە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەی کە باوکت کردی ئەی کوڕی عمارە

لە ڕۆژی لێدانی دوژمنو بەیەکگەیشتنی جۆگەی خوێندا

ئیمام برای پێغەمبەر محمدە بەیداخی ڕێنمایی و ڕۆشنایی ئیمان

تێبگە لە مردنی سەر جێگا. و لە پێش ئاڵاکەیەوە (بەیداخەکەیەوە) بڕۆ

بە پێی سپی و خۆڕاگر و (شمشێری تیژ) و نوکی ڕمەوە"

وتی: بەڵێ ئەی ئەمیری ئیمانداران، کەسی وەك من پشت لە حەق ناکات و بە درۆیش بەهانە ناهێنێتەوە.

معاویە وتی: چی وای لێ کردی ئەمە بکەیت؟

وتی: شوێن کەوتنی حەق و، خۆشەویستی عەلی.

معاویە وتی: سوێند بە خودا هیچ شوێنەواری عەلی لەسەرت نابینم.

وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران سەر کوژراو، پاشماوەکەیشی وەچاخ کوێر بوو، واز بێنە لە باس کردنی ئەوەی لە بیرکراو گێڕانەوەی ئەوەی کە ڕۆیشت، سوێندت بە خودا دەدەم کە وازم لێ بێنی لەو شتەی کە وازم لێ هێنراوە لێی.

معاویە وتی: ئەوە وام کرد، چ داواکاریەکت هەیە؟

وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران.. تۆ ئێستا بوویت بە سەرداری خەڵك و کاروباریانت گرتۆتە دەست و، خوداش لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکات دەربارەی ماڤی ئێمە لەسەرت، هێشتا ئەوانەی کە بە پشتی تۆ و بە هۆی دەستەڵاتی تۆوە ستەممان لێ دەکەن و بە وێنەی گوڵەگەنم دروێنەمان دەکەن و، وەك شێلانی مانگا دەمانکەنە ژێر پێوە و، خراپەکار ئازارمان دەدات و، پایەدارەکانمان تالآن دەکەن و..ئەم (مسری کوڕی ئەرتەئە) لە لایەن تۆوە هاتووە بۆ لامان، پیاوەکانمی کوشت و سامانەکەمی تالآن کرد، ئەگەر مەسەلەکە گوێڕایەڵی نەبێت ئێمەش سەربەرزی و بەرگریمان تێدایە، ئەگەر لای دەبەیت لەسەرمان ئەوا سوپاست دەکەین و ئەگەر نا ئەوا نیشانت دەدەین..پاشان دەستی کرد بە گریان و ئەم شیعرەی بۆ وت:

(خودا سڵاو لەسەر جەستەیەك بکات کە

گۆڕ لە خۆی گرتووە و دادپەروەریشی پێوە بە خاك سپێردراوە)

(دەستی لە ملی حەق کرد بوو جگە لەوی وەرنەدەگرت

بۆیە بە حەق و ئیمانەوە بەسترابویەوە)

معاویە وتی: ئەوە کێیە؟

وتی: (عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب)ە.

معاویە وتی: چی بۆ کردوویت هەتا لە لات وای لێ هاتووە؟

وتی: چوومە خزمەتی بەهۆی ئەوەی کابرایەکی کردبووە وەلیمان تا سکاڵا لە دەستی کارەکانی بکەم، سەیرم کرد بە پێوە نوێژ دەکات، کە تەماشای کردم، لێی پرسیم چ داواکاریەکت هەیە؟ منیش هەواڵەکەم پێ گەیاند.. فەرمووی: خودایە تۆ بە شایەت بە لەسەرم و لەسەر ئەوان کە من نەمکردوون بە دەستەڵاتدارایان تا ستەم لە بەندەکانت بکەن و حەقەکانت واز لێ بێنن، پاشان

پارچەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا لە شێوە وەڵامدا و لێی نووسی: (بە ناوی خودای گەورە و میهرەبان)

﴿قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ﴾[1]. واتە: بەڵگەو نیشانەتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، لە کێشان و پێواندا مافی خۆی بدەنێ.

﴿وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ﴾[2].

واتە: با پێوان و کێشانتان تێرو تەواو بێت و دادپەروەرانە ئەنجامی بدەن، شتی خەڵکی کەم نرخ مەکەن و، خراپەکاری بڵاو مەکەنەوە لەناو زەویدا.. ئەوەی خوای گەورە بۆتان دەیهێڵێتەوە کە قازانج و حەڵاڵی کردوە بۆتان، ئەوە چاکترە لە زۆری حەرام، ئەگەر ئێوە ئیماندار بن، من لێپرساراو نیم بەرانبەر ئێوە.

.. ئەگەر ئەم نووسراوەی ئێمەت خوێندەوە ئەوا دەست بگرە بەوەی لە کاری ئێمە بە دەستەوەیە هەتا یەکێك دەگاتە لات و لێت وەردەگرێتەوە..لێی وەرگرتەوە و سوێند بە خودا بە قوڕ نەی نوساند پێوەی و بە پشتێن پێوەی نەبەستەوە.

معاویە وتی: بە ویژدان و دادپەوەرانە ئەو نامەیەی بۆ بنوسن[3].

---

[1] سورة الاعراف آية ٨٥.

[2] سورة هود آية ٨٥،٨٦.

[3] (أعلام النساء) عمر رضا كحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

# جەروەری کچی غالبی تەمیمی

لـە گۆشـکراوانی ڕەوانبێـژی و زمـان پاراوییـە..معاویـە لـە مەککـە نـەخۆش کەوت، کە شەو هات زۆر بێ تاقەت بوو، ناردی بە شوێن (جەروە)دا، کاتێك کـە هاتە لای معاویە، معاویە پێی وت: بێزارمان کردی.

وتی: سوێند بە خودا وایە..لە کاتێکدا لە دەرگاتان دا کە باڵندە لە هێلانـەی خۆی نادات، دڵم ترسا و، منداڵـەکانم شـێوان (تـرسـان) و، هۆزەکـەیـشم تـۆقین و کە بەجێم هیشتن لە ناویەکدا وەك شەپۆل بە یەکدا دەهاتن لە ترسی تۆ و لـە سۆز و بەزەییان بۆ من، معاویە وتـی: بـا ترسـەکەت ئارام بێتـەوە و، دەروونـت ئاسوودە بێت..کارەکە بە پێچەوانەی ئەوەوەیە کە تۆ گومانی بۆ دەبەیت..

ناردومـە بـە شـوێنتدا تـا دەربـارەی قەومەکـەت هـەواڵم پـێ بـدەیت، بـەنی تەمیم..

وتـی: ئـەوان زۆرتـرین خـەڵکن لـە ژمـارەدا و، فراوانترینیـانن لـە وڵاتـدا و، دوورترینیـان لـە بنەچـە و ڕەچـەڵەك داو، ئـەوان ئـاڵتونی سـوورن و بنەچـەی شانازی کارن و، ژمارە زۆرن.

وتی: ڕاست دەکەیت، هەموو کەس لە شوێنی خۆیدا دابنێ[١].

---

[١] دەیەوێ هەموو هۆزێك لە شوێنی خۆیدا دابنێ.

وتی: پاشان بەنی سەعدی کوڕی زەیدی مەناتیش، لە ژمارەدا زۆرترن و، لە بنەماڵەدا چاکترن و، لە کاتی تورەیدا ئارام گرن و، کاتێك داواکران ئامادە دەبن و، خاوەن شمشێر و قەڵغانن و[1]، زۆرانبازی و بەرەو پێش چوون لە کاتی شەڕدا و[2]بەڵام تواناکانیان لە خۆیاندایە و، شمشێریان لەسەر خۆیانە..

وە (حنظلة).. دەیوەخانێکی بەرز و، بنەماڵەیەکی جوان و، سەربەرزیەکی بەرگریکار و، هەڵوەشێنەرەوە و بەرێزیشن بەرانبەر دراوسێ و، داواکاری تۆڵە و خوێنن و، تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە.

معاویە وتی: (حنظلة)ە درەختێکە لق و پۆپی زۆر لێ دەبێتەوە، بۆم باس بکە..

وتی: بەڵام (بەراجم) چەند پەنجەیەکی یەکگرتوون و، مەچەکی توند و تۆڵ و بەرگری کارن، (بنو طهیة)، هۆزێکی زۆر ئازان (ئازایەتی خراپ) و، شاخدارێکی هاوڕێ عیناد و زۆر سوورن لەسەر شت، (ربیعە)، بەردێکی پتەون و، مارێکی سپی و ڕەشن.[3] خۆیان هەڵدەنێن بەسەر ژیانەوە و، شانازی دەکەن بە هۆزەکەیانەوە.

(بەنو یربوع)، سوارچاکی ڕمن وەشێن و، شێری دەمەوبەیانین و شاخ لەسەرن، پاڵەوانان و سوارچاکان دەکوژن، (بەنو مالیك)،کۆمەڵێکن کە تێك ناشکێنرێن و، عیززەتێکیان هەیە کە پیانەوە لکێندراوە و هەر خۆیان بە ڕەسەنێتی هەیانبووە[4]، شێری بە نەڕەن و، ئەسپی چاك و مەشق پێ کراون.

---

[1] جحف : کۆی جحفە و بە مانای قەڵغان.

[2] (أعلام النساء) عمر رضا کحالة _ (بە پوختە کردن و دەستکاریەوە).

[3] دلف/بەرەو پێش چوون.

[4] مخول: مەبەستی ئەوەیە عیزەتیان هەر ڕەسەنە و بە خۆیانەوە نەیانلکاندووە بە درۆ وەك شاعیر دەیداتە پاڵی کەسێکی دی جگە لە خاوەنی.

(بەنو دارم)، بەخشندەیەكی بێ وێنە و، عیززەتێك كە هاوشانی نیە و، ڕێز و شەرەفێك كە بە كەم ناگیرێت.

معاویە دەڵێت: تۆ زاناترین كەسیت بە (تەمیم)، ئەی زانیاریت چۆنە بۆ (قەیس)؟

وتی: هەروەكو چۆن خۆم دەناسم.

وتی: دە بۆم باس بكە..

وتی: (غطفان)، سەرداریان زۆرە و، سەركردەكانیان بەرگریكارە، فەزارەش، دیوەخانیان بەناوبانگە و بنەچەیان دیارە..

(ذبیان): وتار خوێنی شیعرن و، بە عیززەت و بەهێزن..وە (عەبس) پشكۆیەكی نەكوژاوەن و كۆسپێكن كەس بەسەریاندا سەركەوتوو نابێ و، مارێكن بەهەر كەسەوە بدەن چارەسەر ناكرێت[١].

(هوازن): خەوێكی دیار و، عیززەتێكی بە دەستەڵات و..(بەنوسولەیم) سوارچاكی داستانەكان و، شێری ناو بێشەڵانن، وە (بەنی نمەیر)یش دڕكێكی ژەهراوین و، دەردێكی بەردەوامن و، ئایەتێكی دیار و ئاشكران، بەڵام (هیلال) ناوێكی گەورە و عیززەتێكی زل..

بەنو كیلاب: ژمارەیەكی زۆر و، دەریایەكی پڕ ئازوقە و، شانازیەكی[٢] بۆماوە لە پشتاو و پشتەوە، لەسەرخۆییەكی زۆر.

معاویە وتی: ئەی چی دەڵێیت دەربارەی (قەرین)؟..

وتی: گەورەی هۆزو سەردارن و[٣]، بەڕێزی هەموانن و، بنەچەو ژمارەیان زۆرە[١].

---

[١] واتە نوشتە كردن تێدا سوودی نییە.

[٢].واتە سەرداری هۆز و پشتاوپشت پێیان گەیشتۆتەوە.

[٣] واتە سەرداری هۆز و سەركردەكانی.

وتی: ئەی چی دەڵێیت دەربارەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب؟

وتی: سوێند بە خودا گەیشتیە شەرەف و ڕێز و ئامانجێك کە پێناسە و باس ناکرێت و، معاویە فەرمانی کرد کە پارچەیەك زەوی بە بەهای پێ بدەن کە نرخەکەی هەزاران درهەم بوو.

بەڕێزەوە گەڕاندیەوە بۆ لای کەس و کارەکەی.[2]

---

[1] القمقام: ژمارەیەکی زۆر.

[2] (أخبار الوافدات من النساء على معاوية) عەبباسی کوڕی بەکاری صەبی، پێداچوونەوەی سکینەی شەهابی، (بە کورت کردنەوە و دەستکاریەوە).

(المرأة العربية في جاهليتها وإسلامها) عبدالله عفيفی (بە پوختە و دەستکارییەوە).

# مەلەك حەفنای ناصیف

شاعیر و نووسەرێکی کۆمەڵایەتی گەورەیە و، باوکی یەکێکە لە بەناوبانگەکانی ئەدەب دۆستی لە میسردا..هەموو ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ بەرگری کردن لە ڕا و بۆچوونەکانی لە پێش خستنی ئافرەتی موسڵمان دا، زۆر دیندار و چاکە کار بوو. زۆر یارمەتی پێشکەشی بە ئافرەتانی هەژار کردەوە لە سامانی تایبەتی خۆی بە بێ منەت کردن و ئاشکرا کردنی و گرنگی داوە بە ڕێنمایی کردنیان بۆ پاك و خاوێنی و فێر بوون.

لە کارەکانی .. دامەزراندنی قوتابخانەیەك لە ماڵەکەی خۆیدا بۆ فێر کردنی برین پێچی بەهۆی جەنگی جیهانی یەکەمەوە، بەدەستی خۆی سەد بەدلەی تەواوی چنیوە بۆ مانگی سووری میسری و، هیچ لەم کارانە وای لێ نەدەکرد کە مافی مێردەکەی لەسەری و کەس و کاری و ئەوانەی کە بەرچاوی دەکەوتن لەوانەی هەژاری شەکەتی کردبوون پێویستی ماندووی کردبوون، باشترین باسیشی بۆ باوکی ئەوە بوو کە ئازاری دەچەشت بۆ ئازار چەشتنی باوکی.

لە قسەکانی: (چاکی کیژ هەمیشە ڕادەوەستێ لەسەر پەروەردەکردنی یەکەمی، لە شیعرەکانی لە (شەرم)دا دەڵێت:

(کیژ وەك باخچەیەك وایە و شەرمەکەی بۆی
وەك ئاوە و بەو هۆیەوە دەمێنێتەوە
بەهۆی جۆگەلەکانیەوە ژیانی دەڕوات و خشڵی
وا بە خۆیەوە دەکات کە سەیرکەرانی بە بینینی شاد دەبن
ئیمانی بە پەروەردگاری جوانترین خشڵە تێیدا
ئەگەر فەوتا، ئەوا جوانی و هەیبەتی دەفەوتێت
هیچ چاکە لە جوانی کیژ و زانینی دا نی یە ئەگەر لە جگە لە چاکە و، ڕەزامەندی ئەو(خودا) بەکاری بهێنێت
جوانیەکەی وەقفە بۆ خۆی وە ئەوەی
بۆ خەڵکە دینداری و ئەمەکداریەکەیەتی.

کاتێك بینی هۆزەکەی پێویستییان بە چاکسازی هەیە، هاوارێك هاواری کرد، کە تا ئێستا دەنگ دەداتەوە و دەستی کرد بە نووسین و وتاردان بە مەبەستی چاکسازی، کە ئەو تاکە ئافرەتی موسڵمان بوو _ لە چاخی خۆیدا _ کە بەم ئازایەتی و لێ هاتویەوە کاری کردووە، کە ڕەخنەی ڕەخنەگران و بیر و بۆچوونی مێشك وشکەکان هیچ کاریان تێ نەکردووە، بەڵکو زۆر ئازاری دەچەشت لە کاتێکدا نیشانەکانی دواکەوتن و ڕووخانی تیایدا دەبینی و هەموو ئەو سۆزەی لە خۆشەویستی و عیززەت و ئازارەی کردبووە ناو کتێبەکانی و وتارەکانی و پەیامەکانی و وتارەکانی، وەك ناڵە ناڵێکی بەردەوام کاتی ئازاری بە نەڕە و هاوار هەڵدەگەڕاندەوە..هەروەها خاوەن عەقڵ و دڵە گەورەکانی دەهەژاند وەك ئەوەی ئازار بۆ یەك ئوممەت سەرتاسەری بچێژێت..

مەلەکی لێکۆڵەر و شارەزا ساڵی ١٩١٨ی زایینی کۆچی دوایی کردووە[١].

---

[١] (نساء فاضلات) عبدالبدیع صقر. (بە کورتکراوەیی و دەستکارییەوە).

# هەندێ پێناسەو زاراوە

**متفق عليه:** واتە بوخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە.

**رواه الشيخان:** واتە بخاری و مسلم .

**رواه الثلاثة:** واتە بخاری و مسلم و ئەبو داود.

**رواه الاربعة:** واتە بخاری و مسلم و ئەبو داود و ترمذي گێڕاویانەتەوە.

**رواه الخمسة:** واتە بخاری و مسلم و ئەبو داود و ترمذي نەسائی گێڕاویانەتەوە.

**رواه الجماعة:** واتە پێنج کەسەکەو ئیبن ماجە ریوایەتیان کردووە.

**رواه اصحاب السنن:** واتە ابو داود و ترمذي نەسائی و ئیبن ماجە.

**راوي الحديث:** واتە ئەو هاوەڵەی کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموودەی بیستووە.

**مخرج الحديث:** ئەو کەسەی کە بە زنجیرەی ڕاویەکانەوە لە کتێبەکەیدا دەریهێناوە.

**الحديث الصحيح:** ئەو فەرموودە کە زنجیرەیەکە زنجیرەی ڕاویەکانی لە دادپەوەرێکی مێشك زیرەکەوە بۆ دادپەروەرێکی مێشك زیرەك (تەواو لەبەری کردبێت) هەتا لە کۆتاییدا دەگاتەوە سەر پێغەمبەر (ﷺ) یان هاوەڵێك یان کەسێکی تر، وە ناوازەی نەبێت و نەخۆش

نــەبێت واتــە شــتێکی وای لێ دەرنەکــەوتبێت کــە دروســتیەکەی بشێوێنێت.

**الحديث الحسن الصحيح**: ئەمەش لە لای ترمذي ـ لە (حەسەن) بەرزترە و لە خوار پلەی (صحیح)ەوەیە.

**الحديث الحسن**: ئەو فەرموودەیە کە زنجیرەی ڕاویەکانی دەگەنەوە بە یەك لە دادپەروەرێکی کەمتر مێشك زیرەك و سەلامەتە لە ناوازەیی و نەخۆشی واتە نابێ ڕاویەکەی تاوانبار بێت بە درۆ و بە شێوەیەکی تر بیگێڕێتەوە و بەم شێوەیە و نابێ ناوازە و هەڵەی زۆر تێدا بێت بەڵکو تەنها لە مێشکیدا کەمێك لە صحیح خوارترە.

**الحديث الضعيف**: واتە ئەو فەرموودەیە کە نە سیفەتەکانی صحیح و نە سیفەتەکانی (حسن)ی تێدا کۆنەبووبێتەوە، وەك ئەوەی لە زنجیرەی ڕاویەکانیدا هاوەڵەکە (صحابی)یەکە پەڕی بێت ئەوا (مرسل)ە، یان پیاوێك لە زنجیرەکەیدا دیار نەبێت یان کابرایەکی نەناسراوی تێدایە کە (منقطع)ە یان دوو ڕاوی لەسەریەك پچڕاون، یان لەوانەیە ئەو کەسەی کە دەڵێت لێم بیستووە لە زەمانی ئەو دانەبوو بێت کە نازناوی (مدلس)ی هەیە، یان دەردرێکی لێ دەرکەوتووە کە دروستیەکەی دەشێوێنێت، ئەگەر چی لە ڕووکەش دا سەلامەت دیار بێت لە دەرد.

**الحديث الغريب**: تەنها یەك کەس گێڕاویەتیەوە و حوکمی (صحیح) یان (حسن) یان (ضعیف)ی بۆ دادەنرێت بە گوێرەی حاڵ و باری ڕاویەکە.

# پوختەیەك دەربارەی پێشەوایانی ناودار

ئەوانەی کە ناویان هاتووە لە دەرهێنانی فەرموودە یان لە بە چاك زانین و لابردنی خراپەکان لە پیاوانی ڕاوی حەوتن:

**ئەحمەدی کوڕی حەنبەل:** یەکێکە لە چوار پێشەواکەی کە شوێن کەوتەیان هەیە، ئەبو عەبدوڵای ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی حەنبەلی شەیبانی، لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ١٦٤ك لە دایك بووە و لە ١٢ی ڕەبیعی یەکەمدا و، لە ڕۆژی هەینی ساڵی ٢٤١ك کۆچی دوایی کردووە، لە مەزنترین پێشەواکانە کە زۆر تووشی بەلا هاتووە لەسەر ئایین و خۆڕاگر بووە. هەزار هەزار فەرموودەی پێغەمبەری لەبەر بووە، دەڵێن گوایە، ڕۆژی مردنی بیست هەزار کەس لە دیان و جولەکە و ئاگر پەرست موسڵمان بوون.

**بوخاری_ محمدی کوڕی ئیسماعیل:** ئەمیری ئیماندارانە لە فەرموودەدا، ئەبو عەبدوڵا محەمەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موغیرەی کوڕی بردزبە (بردِزبة) جەعەفی یە، سەرکردەکەیان وەلائی ئیسلامە، بوخاری لە شەوالی ساڵی ١٩٤ك دا لە دایك بووە و شەوی جەژنی ڕەمەزانی ساڵی ٢٥٦ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە، نیشانەیەك بووە بۆ ناسینەوەی فەرموودە و، کتێبەکەی (الجامع الصحيح) ڕاسترین کتێبە لە دوایی قورئان، لە باشیدا لە باس کردن نایەت.

**موسلیمی کوڕی حەجاج:** یەکێکە لە پێشەوا ناودارەکان، موسلیمی کوڕی حەجاجی قشیری نیسابۆری ساڵی ٢٠٤ك لە دایك بووە و لە ڕەجەبی ساڵی ٢٦١ ك دا دنیای بەجێ هێشتووە، کتێبەکەیشی ڕاسترین کتێبی فەرموودەیە لە دوای (صحيح البخاری)، لە بوخاری و جگە لەویشەوە لە پێشەوایانی ترەوە فەرموودەی بیستووە.

**ئەبو داود سولەیمانی کوڕی ئەشعەث:** یەکێکە لە ناودارەکانی فەرموودە ئەبو سولەیمانی کوڕی ئەشعەثي کوڕی ئیسحاقی ئەزدی سەجستانی _سَجِستاني_ خاوەنی

(السنن)ەوە ساڵی ٢٠٢ ك لە دایك بووە و، لە ڕۆژی هەینی ناوەڕاستی شەوالی ساڵی ٢٧٥ك کۆچی دوایی کردووە. زۆر لێ هاتوو بووە لە ناسینەوەی فەرموودەدا، هەتا ڕادەیەك دەربارەی وتراوە: فەرموودە بۆ ئەبو داود نەرم بووە هەر چۆن ئاسن بۆ داود پێغەمبەر نەرم بوو بوو، دەڵێت: (پێنجسەد هەزار فەرموودەم لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاوەتەوە کە تەنها ئەوانەی کە لە (السنن)ەکەیدا هاتووە هەڵم بژاردوون.

**ترمذي _ ئەبو عیسی محەمەدی کوڕی عیسی:** ترمذي _ترْمذِي_ کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گوندە (شوێن) کۆنەی لە لای کەناری ڕۆژهەڵاتی ڕوباری جیحون (امودریا) _ئەبو عیسی ی محەمەدی کوڕی عیسی کوڕی سورەتی تورمذیـیـة،خاوەنی (الجامع)ەو لە ساڵی ٢٠٩ك لە دایك بووە و، لە ١٣ای ڕەجەبی ساڵی ٢٧٩ك دا مردووە، دەربارەی (الجامع)ەکەی دەڵێت: (هەر کەس لە ماڵی هەبوو وەك ئەوە وایە پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵەکەیدا بێت و قسە بکات)، قوتابی بوخاری بووە و لە دەرچووی بەردەستی خۆی بووە، لە کاتێکدا کە بوخاری مرد لەخوراسان قوتابی وێنەی ئەبی عیسی لە زانین و لەبەر کردن و وەرع و دنیانەویستیی بەجێ نەهێشت، گریا هەتا کوێر بوو، چەند ساڵانێکی بە کوێری گوزەراند.

**نەسائی_ئەبو عەبدولڕەحمان ئەحمەدی کوڕی شوعەیب:** نەسائی _ دەگەڕێتەوە بۆ (نەساء): کە شارێکە لە خۆراسان _کە ئەبو عەبدولڕەحمان ئەحمەدی کوڕی عەلی کوڕی شوعەیب کوڕی علی الحافظ، خاوەنی (سنن المجتبی)یە و، لە ساڵی ٢١٥ی ك لە دایك بووە و ساڵی ٣٠٣ك مردووە، زۆر شارەزا بووە لە ناسینەوەی فەرموودەدا و تاك بووە لە لەبەر کردن و وەرگرتن دا (اتقان)، (سنن)ەکەی لە دوای هەردوو صحیحی بخاری و موسلیم کەمترین فەرموودەی لاوازی تێدایە، لە میصر نیشتەجێ بووە و، پاشان چۆتە دیمەشق و، کتێبی (الخصائص في فضل علي)ی داناوە، پیلانیان لێ گێڕا لە مزگەوتەکەیان دەرکرد و، پاشان برایە مەککە و لەوێ کۆچی دوایی کرد.

**محەمەدی کوڕی یەزیدی کوڕی ماجە:** یەکێکە لە ناودارەکان و، ناوی ئەبو عەبدولاّ محەمەدی کوڕی یەزیدی کوڕی ماجەی قەزوینی یە، خاوەنی (السنن)ە و لە ساڵی ٢٠٧ك لە دایك بووە و لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٢٧٣ یان ٢٧٥ك ماڵئاوایی لە دنیا

کـردووە، وە (ماجـە) کۆتاییەکـەی (ه)ە نـەك (ة)، لـە هـاوەڵانی مالیکـە و جگـە لەوانەوەی بیستووە و خەڵکیش لێیانەوە ڕیوایەت کردوە.

لـە (سـنن)ەکەیـدا ژمارەیـەکی زۆر فـەرموودەی لاواز هەیـە، بـەڵکو فـەرموودەی (منکر)یشی تێدایە.

جگە لەو حەوتە:

**ئیسحاقی کوڕی ڕاهویە:** پێشەوایەکی گەورە و لەبەرکەری قورئانـە، نـاوی ئـەبو یـەعقوب ئیـسحاقی کـوڕی ئیبراهیمـی تـەمیمی حنظلـي مزوریـیـە و، دانیـشتووی نیـسابور و زانایـەکی نـاوداری بـووە، بـەڵکو گـەورەی خـەڵکی ڕۆژهەڵاتـە و بـە ئـیبن ڕاهویە ناسراوە، ئەحمەد دەڵێت: لە عێراقدا کەسی تر نـازانم کـە بتوانێـت هاوشـانی ئیسحاق بکات، ئـەبو زرعـە دەڵێـت: (کـەس نـەبینراوە لـە ئیـسحاق زیـرەکتر بێـت لـە لەبەرکردن دا)، ئەبو حاتەم دەڵێت: (سەرسوڕدەمێنێ لـە تێگەیـشتن و سـەلامەتی لـە هەڵە لەگەڵ ئەوەی کە خـودا پێـی بەخـشیوە لـە لەبـەرکردن)، سـاڵی ١٦١ ك لـە دایـك بووە و، شەوی نیوەی شەعبان ساڵی ٢٣٨ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە.

**ئیسماعیلی ئەحمـەدی کـوڕی ئیـبراهیم:** پێـشەوا و لەبەرکـەری قورئـان و خـۆڕاگر (شیـخ الاسلام ئەبوبەکر ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی اسماعیلی کـوڕی عەبباسـی ئیسماعیلی جورجانی یە. لە دەوروبـەری خۆیـدا گـەورەی شـافعیەکان بـوو، هـەروەها تـاك بـوو لـە وڵاتـی عەجـەم(فـارس)دا، فەرهـەنگێکی ڕیوایـەت کـراوی هەیـە و، (صحیح)ێکی داناوە لەگەڵ زۆر شتی تردا، لـە نێوانیـان دا (مـسند عمـر)ە کـە لـە دوو بەرگـدا دای ڕێـژاوە، حـاکم دەڵێـت: (ئیـسماعیل تـاکی سـەردەمی خـۆی و، گـەورەی فـەرموودە ناسـان و شـارەزایان بـوو، لـە بـەڕێزترینیان (پایـەدارترینیان) بـوو لـە سـەرداری و پیـاوەتی و بەخـشندەیی (سـەخاوەتی)، هـیچ جیـاوازی نیـە لـە نێـوان زانایانی هەردوو تیپ و ڕا و بۆچوونیان دەربارەی، سـاڵی ٢٧٧ك لـە دایـك بـووە و لـە ڕەجەبی ساڵی ٣٧١ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە کە خاوەنی (٩٤) ساڵ تەمەن بوو.

**ئەلبەزار_ئەحمەدی کوڕی عەمر:** پێشەوا و لەبەرکەری قورئان و زانا ئەبوبکر ئەحمەدی کوڕی عەمری کوڕی عەبدولخالقی بەسری، یەکێکە لە ناودارەکان و، خاوەنی (المسند الکبیر و العلل)ە و، لە طبراني و جگە لە طبرانیەوە زانیاری وەرگرتووە، ساڵی ٢٩٢ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە، (البَزّاز) بەم شێوەیە.

**بەیهەقی_ئەحمەدی کوڕی حسین:** بەیهەقی (البَیْهَقي) کە دەگەڕێتەوە بۆ شوێنێك لە نزیك نیسابور _کە لەبەرکەری قورئان و پێشەوا، زانا ئەبوبکر ئەحمەدی کوڕی حسین، لە شەعبانی ساڵی ٣٧٤ك لە دایك بووە و لە ٨ جمادی یەکەمی ساڵی ٤٥٨ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە، لە گەورە پێشەوایانی فەرمووده و شارەزایانی شافعییە، چەند دانراوێکی هەیە کە پێشتر بە وێنەی ئەمە نەکراوە وەك (السنن الکبری) و ، (السنن الصغری) و، المبسوط والاسماء والصفات).

زەهەبی دەڵێت: دانراوەکانی نزیکەی هەزار بەرگ دەبن.

**ئیبن جارود_عبداللەی کوڕی عەلی:** پێشەوا و لەبەرکەری قورئان و ڕەخنەگر ئەبو محەمەد عبداللەی کوڕی عەلی کوڕی جارودی نیسابوری، لە نزیك مەککە ژیاوە و، خاوەنی (المنتقی فی الاحکام)ە و، لە زانا زۆر بەدیقەت و ئامادە بوەکان بووە و ساڵی ٣٠٧ك دنیای بەجێ هێشتووە.

**ئەبو حاتەمی ڕازی _ محەمەدی کوڕی ئیدریس:** پێشەوا و لەبەرکەری قورئانی ناودار ئەبو حاتەم محەمەدی کوڕی ئیدریس ی کوڕی منزر_ی حنظلي ڕازی، لە ساڵی ١٩٥ك دا لە دایك بووە و لە شەعبانی ساڵی ٢٧٧ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە، یەکێکە لەو زانا ناودارانەی کە لێهاتوو بووە (بەناوبانگ بووە) لە ناسینەوەی فەرمووده و، لە پێشەوا گەورەکانی (جرح و تعدیل)ە.

**حارثی کوڕی ئەبی ئوسامە:** پێشەوا ئەبو محەمەد حارثي کوڕی ئەبی ئوسامەی محەمەدی کوڕی داهر تەمیمی بەغدادیە، لەبەرکەری قورئانە و خاوەنی (المسند)ە، مسندەکەی خۆی ڕێکی خستووە، ئیبراهیمی حەربی و ئەبو حاتەم بە

متمانه پێکراویان داناوه و، دار قطني دەڵێت: ڕاستگۆیه و، ساڵی ١٨٦ك له دایك بووه و ڕۆژی عەرەفەی ساڵی ٢٨٢ك ماڵئاوایی له دنیا کرد که له تەمەنی (٩٧) ساڵیدا بوو.

**ئەبو عەبدوڵای حاکم:** پێشەوای لێکۆڵەرەوان ئەبو عەبدوڵا محەممەدی کوڕی عەبدوڵای نیسابوری حاکمه و، ناسراوه به (ئیبن البیع) _البّییع_ خاوەنی (المستدرك) و ساڵی ٣٢١ك له دایك بووه و له مانگی سەفەری ساڵی ٤٠٥ ك ماڵئاوایی له دنیا کردووه و، له هەزار مامۆستاوه یان لەو ژماره نزیك زانستی وەرگرتووه، چەندەها دانراو و کتێبی هەیه وێڕای تەقوا و خوداپەرستی و دینداریەکی زۆر.

**ئیبن حەبان _ئەبو حاتەم محەممەدی کوڕی حیببان:** یەکێکه له پێشەوا ناودارەکان ئەبو حاتەم محەممەدی کوڕی حیببان _(حِبّان)_ کوڕی ئەحمەدی کوڕی حیببّانی ئەلبوستی _البُستي_ که دەگەڕێتەوه بۆ شوێنی له دایك بوونی که (بوست)ە له وڵاتی سەجستان _ لەوانه بوو که زانست و زانیاری کۆ دەکردەوه و، لەبەری دەکرد و، له شارەزایانی ئایینی و، پارێزەرانی سوننەت بوو، لەبەر ئەمه (ابن خزیمه) بووه به قوتابی، ساڵی ٣٥٤ ك له سەمەرقەند کۆچی دوایی کردووه که له تەمەنی هەشتا ساڵیدا بووه.

**محەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی خزیمه:** شیخ الاسلامه و یەکێکه له زانا گەوره و ناودار و لەبەرکەری قورئان، ئیبن خزیمه محەممەدی کوڕی ئیسحاق _ساڵی ٢٢٣ك له نیسافور له دایك بووه و، هەر له ساڵی ٣١١ك لەوێ کۆچی دوایی کردووه، پێشەوایەتی و لەبەرکردنی له سەردەمی خۆیدا بۆی ماوەتەوه و له خۆراسان کەس شانی له شانی نەداوه، کتێب و دانراوەکانی زیاتر له سەد و چل کتێبه.

**ئیبن ئەبی خیثمة:** پێشەوا و لەبەرکەری قورئان ئەبوبەکر ئەحمەد کوڕی ابی خیثمة زهێری کوڕی حەربی نەسائی، پاشان به بەغدادی خاوەنی (التاریخ الکبیر)ە، دار قطني دەربارەی دەڵێت: متمانه پێ کراو (ئەمینه)، وه خطیب دەڵێت: متمانه پێ کراو زانایەکی شارەزا و بەرچاو ڕوون بووه به ڕۆژگارەکانی خەڵك، ڕاوی ئەدەبه و، زانستی فەرمووده ناسی له ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیبن مەعین وەرگرتووه، له

جەمادی یەكەمی ساڵی ٢٨٩ ك دا ماڵئاوایی لە دنیا كردووە لە كاتێكدا كە تەمەنی (٩٤) ساڵ بووە.

**دار قطني _عەلی كوڕی عومەر:** ئەلدار قوطني _الدارَ قُطني_ دەگەڕێتەوە بۆ دار قطن _ كە گەڕەكێكی گەورە بوو لە بەغداد_ كە لەبەركەرێكی مەزن و پێشەوایەكی بێ وێنە بووە ئەبو حەسەن عەلی كوڕی عومەری كوڕی ئەحمەدی كوڕی مەهدی بەغدادی ساڵی ٣٠٦ ك لە دایك بووە و لە ٨ی ذي القعدەی ساڵی ٣٨٥ك دا دنیای بەجێ هێشتووە، پێشەوای كاتی خۆی و تاك بووە لە سەردەمی خۆیدا، سەرداری لە فەرموودە ناسی و ناسینەوەی (علل_ناتەواویەكانی) و ناوی پیاوانی ڕاوی لە زەمانی خۆیدا پێ دراوە و كەس لە سەروویەوە نەبووە.

**دارەمی:** پێشەوا لەبەركەری قورئان شێخ الاسلام بووە لە سەمەرقەند (ئەبو محەمەد عەبدولای كوڕی عەبدولڕەحمان كوڕی فەضل ی بەهرامی تەمیمی دارەمی سەمەرقەندی، خاوەنی (المسند العالی)یە و، وانەی لە مەككە و خۆراسان و شام و عێراق و میسر وەرگرتووە، موسلیم و ئەبو داود و ترمذي و نەسائی و جگە لەمانیش فەرموودەیان لێوە ڕیوایەت كردووە، لەوپەڕی هۆشمەندی و لەوپەڕی پایەداری دا بووە، بە نموونە دەهێنرێتەوە لە دینداری و لەسەرخۆی و تێكۆشان و خوداپەرستی و كەم گوزەرانی دا، ساڵی ١٨١ك لە دایك بووە و، لە ڕۆژی تەرویەدا ساڵی ٢٥٥ك دنیای بەجێ هێشتووە.

**ئەبو داودی طەیالیسی _سولەیمانی كوڕی داود:** زانای گەورە سولەیمانی كوڕی داودی كوڕی جارودە، لە بنەچەدا فارسە و خزمەتكاری بنەماڵەی ئالی زوبەیری بەسری بووە، یەكێكە لە زانا ناودارەكان و، قەلاس و ئیبن مەدەنی دەڵێت: كەسم نەبینیوە لەو زیاتر مێشكی زیرەك بێت لە لەبەركردن دا، ئیبن مەهدی دەڵێت: ڕاستگۆترین كەسە، لە هەزار مامۆستاوە وانەی نووسیوەتەوە، ساڵی ٢٠٤ك ماڵئاوایی لە دنیا كردووە كە لە تەمەنی هەشتاكانی دابووە.

**ئیبن ئەبی دونیا _عەبدولای كوڕی محەمەدی كوڕی عوبەید:** فەرموودە ناس و زانا و ڕاستگۆ ئەبوبەكر عەبدولای كوڕی محەمەدی كوڕی عوبەیدی كوڕی سفیانی كوڕی

ئەبی دنیای قەرشی ئەمەوییە، پاشان بەغدادی، خاوەنی چەندەها دانراوو کتێبە و، زیاتر لە یەکێك لە مندالّەکانی خەلیفەکانی پەروەردە کردووە، کە پەروەردەکار و ماملۆستای معتضد بووە، سالّی ٢٠٨ك لە دایك بووە و، لە جمادی یەکەمی سالّی ٢٨١ك دا مالّئاوایی لە دونیا کردووە.

**ئەلزەهـەلی:** شـیخ الاسـلام و ئـەمیری ئیماندارانـە لـە فـەرمووده ناسـیدا و، لەبەرکەری قورئانـە لـە نیسابور (نـاوی ئەبوعەبدولاّی محەمـەدی کوڕی یـەحیا ی کوڕی عەبداولاّی کوڕی خالیدی کوڕی فارس، مەولای (کۆیلەی) بـەنی دهل بـووە لـە زۆر کەسەوە وانەی وەرگرتووە لە مەککە و شام و میسر و، عێراق و ڕەی و خۆراسـان و یەمەن و جەزیرە، زۆر لەم بارەیەوە لێهاتو و شارەزا بـووە، گـەورەیی و زانـایی لـە خۆراسان دا بۆ لای ئەم گەڕاوەتەوە، لە ئەحمەدەوە دەلّێت: کەسم نەبینیوە شارەزاتر بێت بە فەرموودەی (کە ئەو ڕیوایەتی کردووە) زهری لە محەمەدی کوڕی یەحیا، لە دوای ١٧٠ك یەوە لە دایك بووە و، لە ڕبیعی یەکەمی سالّی ٢٥٨ك دا مردووە.

**ئـەبو زرعـەی ڕازی _ عبیـدولاّی کـوڕی عەبدولکـەریم:** لەبەرکـەری قورئـان و فەرمووده ناسی گەورە (عبیدولاّی کوڕی عەبدولکەریمی کوڕی یەزیدی کوڕی فـەروخ ئـەبو زرعـەی قەرشـی . یەکێکە لـە ناودارەکـان و، یەکێکـە لـە پێـشەوایانی (جـرح و تعدیل)، موسلیم و ترمذي و نەسائی و ئـیبن ماجـە و کەسـانی تـریش فـەرموودەیان لێوە ڕیوایەت کردووە، ذەهەبی دەلّێت: لە زۆر کەس وانـەی وەرگرتـووە لـە مەککـە و عێراق و شـام و جـەزیرە و خۆراسـان و میـسر، لـە تاکـەکانی زەمـانی خـۆی بـووە لـە لەبەرکردن و زیرەکـی و دینـداری و دلّـسۆزی و زانـین و کـردەوەی چـاك دا، لـە کۆتـا ڕۆژی سالّی ٢٦٤ك دا مالّئاوایی لە دنیا کرد کە لە تەمەنی ٦٤ سالّیدا بوو.

**سـەعیدی کـوڕی مەنـسور:** نـاوی (سـەعیدی کـوڕی مەنـسوری کـوڕی شـعبەی مروزییە، دەوترێت طالـەقانی و پاشـان بـەلّخی، لـە لای مەککـە نیشتەجێ بـووە و، خاوەنی (السنن)ە و، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل زۆر بە چاکە باسی دەکات و بە گەورە گرتوویـەتی، (حـرب کرمـانی)یـش دەلّێـت: نزیکـەی دە هـەزار فـەرموودەمان

نووسیوەیەوە لە لەبەرکردنی خۆیەوە، لە رەمەزانی ساڵی ٢٢٧ك دا و لە تەمەنی نەوەد ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە لە مەککە.

**ئیبن سەکەن _ سەعیدی کوڕی عوسمان:** لەبەرکەری قورئان و پێشەوا (ئەبو عەلی سەعیدی کوڕی سەکەن _ السَکَنْ_ی بەغدادییە، گرنگی بەم لایەنە دەداو فەرموودەی کۆکردۆتەوە و کتێبی داناوە و شارەزای خۆی زۆر کردووە، ساڵی ٢٩٤ك لە دایك بووە و، ساڵی ٣٥٣ك مردووە.

**ئەلشافعی_ محەمەدی کوڕی ئیدریس:** یەکێکە لە پێشەواکان کە شوێن کەوتووی هەیە، (ئەبو عەبداولاّ محەمەدی کوڕی ئیدریس ی کوڕی عەبباسی کوڕی عوسمانی کوڕی شافعی کوڕی عبیدی کوڕی عبد یزید کوڕی هاشمی کوڕی عبدالمطلب کوڕی عبدالمناف قەرشی مەککىیە، لە میسر دانیشتووە و لە ساڵی ١٥٠ك دا لە دایك بووە و، شەوی هەینی کۆتایی مانگی ڕەجەبی ساڵی ٢٠٤ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە.

لە غەزە لە دایك بووە و پاشان براوەتە مەککە و لە میسر وەفاتی کردووە، گەورە زانای ئوممەت بووە و، هاوشانی نەبووە، زاناترین کەس بووە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، لە هەموو زانستەکاندا لێزان بووە و (اصول الفقە)ی داهێناوە، (شافع)ی باپیرەی هاوەڵە و چاوی بە پێغەمبەر (ﷺ) کەوتووە کە هێشتا لە کاتی پێگەیشتن و هەرزەکاریدا بوو..

**ئەبو بەکری کوڕی ئەبی شەیبە:** لەبەرکارێکی بێ وێنەیەی قورئانی پیرۆزە ، ناوی ئەبوبەکر عەبدولاّی کوڕی محەمەدی کوڕی ئەبی شیبە ئیبراهیمی کوڕی عوسمانی کوڕی حەواسی عەنەسی یە (مولاهم ) (نازناویان) ، ی کوفیە.

خاوەنی (المسند) و فەرهەنگ و جگە لەمانە دانراوی تریشی هەیە، ئەبو زرعە و بخاری و موسلیم و ئەبو داود و خەلەف فەرموودەیان لێوە وەرگرتووە، لە موحەڕەمی ساڵی ٢٣٥ك دا مردووە.

**طەبەرانی _سولە یمانی کوڕی ئەحمەد :** (مسند)ی دنیا و پێشەوای زیرەك (ئەبو قاسم سولەیمانی کوڕی مطیری اللخەمی طەبەرانی یە، لە هەزار مامۆستا وەیان زیاتر فەرموودەی وەرگرتووە، بۆ داواکردنی فەرموودەدا کۆچی کردووە بۆ شام و لەو

گەشتەییدا سی و سێ ساڵ ماوەتەوە، دانـرا و کتـێبی خـۆش و نـاوازەی هەیـە، لەوانـە ئەم سێ فەرهەنگە : (الكبير) و (الاوسط) و (الصغير)، ساڵی (٢٦٠ك) لە طبريـەی شـام لە دایك بووە و، لە ئەصفەهان نیشتەجێ بووە، ساڵی ٣٦٠ کە دوو شـەو مابویـەوە لـە مانگی ذي القعده کۆچی دوایی کردووە.

**طەحاوی _ ئەحمـەدی کـوڕی محەمـەد:** پێـشەوا و زانـا و لەبەرکـەری قورئـان ئـەبو ئەحمـەدی کـوڕی محەمـەد سـەلامەی کـوڕی سـەلەمەی ئـەزدی حەجـەری میـسری تەحاوی حەنەفی (طەحا= نزیکە لە گونـدەکانی میـسر) یەکـەم جار شافعی بـووە لـە لای مزنی دەیخوێند _کە کوڕی خوشکی بوو_ ڕۆژێکیان مزنی پـێی وت: سـوێند بـە خودا تـۆ هیـچت لێ دەرناچێت، ئـەویش تـووڕە بـوو، چووە لای ئـیبن ئـەبی عمرانـی حەنەفی و بوو بە حەنەفی و زۆر سـوور بـوو لەسـەر چەسپاندنی ڕێـچکەکەیان، هـەتا وای لێ هـات کـە چـاککردنی هەواڵـەکانی دەربـارەی مەزهەبەکـەی بـڵاو دەکـردەوە و ئەوەی لە لای جگە لەوان لاواز بوو بە بەڵگە دەیانهێنایـەوە، ڕووبـەڕووی ئـەو شـتانە بوویــەوە کــە لاواز بــوون هــیچ چــارەی تێــدا نــەبوو وەك بەیهــەقی دەڵێــت، لــە بـەناوبانگترین کتێبـەکانی (معـاني الاثـار)ەو، لـە سـاڵی ٢٢٨ك وە دەوتـرێـت ٢٣٨ك لـە دایك بووە و، لە ناوەڕاستی ذي القعدەی ساڵی ٣٢١ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە.

**ئـیبن عبـدالبر_یوسـفی کـوڕی عەبـدوڵا:** پێـشەوای زانـا و، شـيخ الاسـلام، زانـای (حـافظ)ی مـەغریب، ئەبوعومـەر یوسـفی کـوڕی عەبـدوڵای کـوڕی محەمـەد کـوڕی عبدالبڕی کوڕی عاصم نەمری قـرطبي، سـەرداری خـەڵکی سـەردەمی خـۆی بـووە لـە لەبەرکردن و دیقەت دا، زۆر شـارەزا بـووە لـە بنەچـە و هەواڵـەکانی پێـشوودا، ئـیبن حەزم دەڵێت: (نەمزانیوە و نەمبیستووە کـەس وەك ئـەو لـەفیقهی حەدیـسدا قـسەی کردبێت ئیتر چۆت لەو چاکتر دەبێت). چەند کتێبێکی هەیە لەوانە (الاستيعاب)، لـە ڕەبیعـی دووەمـی سـاڵی ٣٦٨ك لـە دایـك بـووە و لـە شـەوی هـەینی کۆتـایی ڕەبیعـی دووەمدا و لە ساڵی ٤٦٣ك ماڵئاوایی لە دنیا کرد کە لە تەمەنی (٩٥) ساڵیدا بوو.

**عەبدولحەق:** زانا و شارەزا ئەبو محەمەد عەبدولحـەق ی کوڕی عەبـدولڕەحمانی کوڕی عەبدوڵای کوڕی حـسين ی کـوڕی سـەعيدی ئـەزدی ئەشـبيلی یـە، لـە (بجايـە)

نیشتەجێ بووە و لەوێ زانیاریەکانی بڵاو کردۆتەوە و کتێبەکانی داناوە، ناوبانگی دەرکردووە و دەنگی داوەتەوە، وتاربێژی (بجایە)ی پێ سپێردراوە، شارەزا و لەبەرکاری قورئان و زانا بە فەرموودە ناسی و کەم و کورتیەکانی و پیاوەکانی ناسیوە، بە خێر و چاکسازی و زوهد و وەرع و پەیڕەو کردنی سوننەت و دنیا نەویستی وەسفی کراوە، هەروەها بەشداریشی کردووە لە ئەدەب و شیعر وتن دا. ساڵی ٥١٠ك لە دایك بووە و لە (بجایە) و لە کۆتایی ڕەبیعی دووەمدا و لە ساڵی ٥٨١ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە.

**عەبدولڕەزاقی کوڕی هەمام:** پێشەوا و زانای پایەدار (ئەبوبەکر عەبدولڕەزاقی کوڕی هەمامی کوڕی نافعی حمیری‌یە، نازناویان (صنعانی)یە، لەو کەسانە بووە کە زانیارییەکی زۆریان کۆکردۆتەوە، ئەحمەد و ئیسحاق و ئیبن معین و ذهلی فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە و، لە کۆتایی تەمەنی‌دا کوێر بووە و گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە، لە شەوالی ساڵی ٢١١ك مردووە کە (٨٥) ساڵی تەمەن بوو.

**ئیبن عەدی _عەبدوڵا :** پێشەوای بەناوبانگ و پایەداری گەورە (ئەبو ئەحمەد عەبدوڵای کوڕی عەدی جورجانی)یە، یەکێکە لە پێشەوایانی (جرح و تعدیل) وە یەکێکە لە ناودارەکانی، هەروەها بە (ابن القصار)یش ناسراوە وە، لە ساڵی ٢٧٩ك لە دایك بووە و لە جمادی دووەمی ساڵی ٣٦٥ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە.

**العقیلی_ محەمەدی کوڕی عەمر:** لەبەرکەری قورئان و پێشەوا (ئەبو جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی موسای کوڕی حمادی عەقیلی یە، خاوەنی کتێبی (الضعفاء الکبیر)، زۆر پایەدار بووە و، خاتر و ڕێزی مەزن بوو، زۆر کتێبی داناوە و، پێشکەوتوو بووە لە لەبەرکردن دا و لە مەککەو مەدینە نیشتەجێ بووە، لە ساڵی ٣٢٢ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە.

**عەلی کوڕی مەدینی :** پێشەوایە لە (جرح و تعدیل)دا و، زانای سەردەم و پێشەنگی فەرموودە ناسانە ناوی (ئەبو حەسەن عەلی کوڕی عەبدوڵای کوڕی جەعفەری کوڕی نجیح ی سەعدی‌یە، نازناویان (المدینی)یە، بخاری و ئەبوداود و کەسانی تر فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە، ئیبن مەهدی دەڵێت: (عەلی کوڕی مەدینی زاناترین

کەسە بە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)بخاریش دەڵێت: (قەت لە لای کەس وا خۆم پێ بچووك و کەم نەبۆتەوە تەنها لە لای عەلی کوڕی مەدینی دا نەبێت)، ساڵی ١٦١ك لە دایك بووە و لە کەتیبەی قەعقەعە لە سامەڕا و لە ساڵی ٢٣٤ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە.

**ئەبو عەوانە _ یەعقوبی کوڕی ئیسحاق:** زانا و فەرمووده ناس (یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی زەیدی نیسابوری پاشان ئیسفەرائینی، یەکێکە لە ناودارەکان و خاوەنی (المسند الصحیح)ە کە لەسەر موسلیم دەری هێناوە، گەشتی بە زۆر شوێنی زەویدا کردووە لە پێناوی فەرموودە کۆ کردنەوەدا و، لە زۆر کەسەوە ڕوایەتی کردووە و، زۆر کەسیش لێیانەوە ڕیوایەت کردووە، پێنج جار حەجی کردووە و ساڵی ٣١٦ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە گۆڕەکەی لە (ئیسفرائین)ە کە ناسراوە بە (زار).

**ئیبن قوطان _عەلی کوڕی محەمەد:** زانا و پێشەوا و ڕەخنە گر و شارەزا (ئەبو حەسەن عەلی کوڕی محەمەدی کوڕی عەبدولمەلیکی فأسی)، لە قرطبة لە دایك بووە و لە (فأس) نیشتەجێ بووە، بەرچاو{وونترین کەس بووە لە دروست کردنی فەرموودەدا و لە هەموویان زیاتر ناوی ڕاویەکانی لەبەر بووە، خاوەنی چەندەها دانراوە و، لە ساڵی ٥٦٢ك لە دایك بووە و لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٦٢٨ك دا دنیای بەجێ هێشت.

**ئیمامی مالیك:** یەکێکە لە چوار پێشەواکەی کە شوێن کەوتوانی هەیە، شارەزای تێگەیشتووی ئوممەت پێشەوای خانەی کۆچ (مەدینە) و، سەرکردەی فەرموودە ناسان (ئەبو عەبدولڵا مالیکی کوڕی ئەنەسی کوڕی مالیکی کوڕی ئەبی عامری ئەصبەحی کە دەگەڕێتەوە بۆ باپیرەی نۆیەمی، ئەصبحیش لە بەرزترین هۆزەکانی یەمەنە، لە ساڵی ٩٣ك لە دایك بووە یان ٩٤ك ، و لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ١٧٩ك کۆچی دوایی کردووە و، لە نۆسەد مامۆستا و زیاتریش وانەی وەرگرتووە، خەڵکانێك لێیانەوە گێڕاوەتەوە کە خەریکە لە ژماردن نەیەت، ئیمامی شافعی یەکێکە لە قوتابییەکانی.

**ئیبن مەندە _ محەمەدی کوڕی ئیسحاق:** پێشەوا و لەبەرکاری قورئانی پیرۆز و گەڕۆك (ئەبو عەبدوڵا محەمەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی محەمەدی کوڕی یەحیا کوڕی مەندە _مَندَة_ یەکێکە لە ناودارەکانی کە زۆر فەرموودەیان لەبەر کردووە _ بە وڵاتەکاندا گەڕاوە و، کە گەڕاوەتەوە کتێبەکانی کە لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی چەند بارێك بووە، ئەڵێن: چل بار بووە، ژمارەی شێخ و مامۆستاکانی گەیشتۆتە هەزار و حەوت سەد کەس، لە ساڵی ٣١٠ ك دا لە دایك بووە و، لە کۆتایی ذي القعدەدا و لە ساڵی ٣٩٥ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە.

**ئەبو نوعیەمی ئەصبەهانی:** لەبەرکاری قورئانی پیرۆز (زانای) بەناوبانگ (ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی موسا کوڕی مەهرانی ئەصبەهانی یە. یەکێکە لە زاناکانی فەرموودە و گەورەی لەبەرکەران، لە زانایانی پایەداری زانستی وەرگرتووە و، لێ یەوە وەرگیراوە، چەند دانراوێکی هەیە لەوانە (المستخرج) بۆ هەردوو صحیحەکەوە و، (حلیة الاولیاء)، کە لە باشترین کتێبەکانیەتی، دەڵێت: براوە بۆ نیسابور _ و لەوێ بە چوار دینار کڕیویانە، لە ڕەجەبی ساڵی ٣٣٤ك دا لە دایك بووە و لە مانگی سەفەر یان دەڵێن لە بیستی موحەڕەمی ساڵی ٤٣٠ ك دا لە أصبهان کۆچی دوایی کردووە.

**ئەبو یەعلی _ ئەحمەدی کوڕی عەلی:** فەرموودە ناسی جەزیرە و زانا (ئەحمەدی کوڕی عەلی کوڕی موثەنای کوڕی یەحیای کوڕی عیسا کوڕی هیلالی تەمیمی یە، خاوەنی (المسند الکبیر)ە، لە کەسە ڕاستگۆ و دەست پاك و دیندار و نەرمونیانەکان بووە، سەمعانی دەڵێت : گوێم لە ئیسماعیلی کوڕی محەمەدی کوڕی فەزلی زانا بوو دەیووت: چەندەها (مسند)م خوێندۆتەوە وەك (مسند)ی عەدنی و، (مسند)ی ئیبن مەنیع کە وەك ڕووبار بوون، بەڵام (مسند)ی ئەبو یەعلی وەك دەریایەك بوو کە چەند ڕووبارێکی تێدا کۆ بوویەوە، لە شەوالی ساڵی ٢١٠ك دا لە دایك بووە و، لە ساڵی ٣٠٧ك ماڵئاوایی لە دنیا کردووە.[1]

---

[1] کورتەیەك دەربارەی پێشەوایان لە کتێبەی (بلوغ المرام) وەرگیراوە _(دار الفیحاء).

# ناوەڕۆك

